# ژێدەرێ چیرۆکان

24. جەنگیزخان / **جنكيزخان, ربيع فى الرماد** ، ص103.

25. ئالایێ رەش / **الراية السوداء, دمشق الحرائق**، ص117.

26. کوما بەرخکا / **الخراف, دمشق الحرائق**، ص109.

27. ئەوێ روونشتی و ئەوێ ژپێرڤە / **الجالس والواقف, نداء نوح**، ص201.

28. نانێ هشك / **الرغيف اليابس, دمشق الحرائق**، ص77.

29. ئەلهۆ / **الصقر, الرعد** ، ص15.

30. گول / **الزهرة, النمور فى اليوم العاشر** ، ص39.

31. هەمزە / **حمزة, نداء نوح**، ص385.

32. ترس / **الخوف, نداء نوح**، ص155.

33. دوماهیترین بەندەر / **اخر المرافىء, نداء نوح**، ص147.

# پێشگۆتن

ئەڤ جیهانا پان وبەرین و ژ هەڤجودا ب رێکا تورێن ئەنتەرنێتێ و پۆستەیێن ئەلکترونی , یا بچووکتر و نێزیکتر لێ دهێت , ئێدی زۆر یا ب ساناهییە کو خەلك هەڤبەندی یێن رامیاری , ئابۆری , کلتۆری و جڤاکی دماوەیێ چەند دەمژمێراندا دگەل پرانیا وەلاتێن جیهانێدا بکەن و سەرەدەرییەکا بالبەر و کاریگەر و بەرهەمدار دگەل هزرێن هەمەرەنگدا ئەنجامدەن.

دڤێ پروسەیا دئێکگەهشتنێدا ژی , تشتێ هەرە گرنگ ئەوە کو رێز ل هزرێن بەرامبەر بهێتە گرتن و دانوستاندنەکا بەردەوام دناڤ جڤاکان و هزرێن جودا جودا دا هەبیت , ژبو پێشڤەبرنا خرخالا وەرارێ و پێشڤەچوونێ. لێ، چونکو زمان ئالاڤێ هەرە گرنگێ سەرەدەریکرنێیە، یا فەرە کو دئاییندەیدا زمانەکێ هەڤپشك بهێتە ئافراندن کو خەلکێ هەڤجودا ژهەموو لایەکیڤە بکاریت ب رێکا ڤی زمانێ هەڤپشك سەرەدەریێ دگەل هەڤ بکەن،کوئەڤ سەرەدەرییە یا ب وەج و بەرهەمدار بیت .. پێدڤییە ئازادی و رێزگرتنا هزرا بەرامبەر هەبیت.

یا ئاشکرایە کو مللەتێ کورد وەك مللەتەکێ بندەست و بێ هەبوونا دەولەتەکا خۆسەر و ئازاد , دبن ئاکاما کلتورێن دەولەتێن (هەڤسوی / داگیرکەر) دا وەرارکرییە، هەمان سەروسیمایێن کلتورێ زال وەرگرتییە و دبن ئاکامێن زمان و کلتورێ وەلاتێن (عەرەب، تورك، ئیران) دا مەزن بویە و گەشەکرییە، زێدەباری ڤێ چەندێ ژی مللەتێ کورد ژلایێ رامیاریڤە بو ماوێ چەندین سالان دبن دەستەلاتا رژێمێن ڤان هەرسێ دەولەتاندا ژیایە، ژبەر ڤێ چەندێ ژی پرانیا کەسێن کورد زمانێ ڤان هەرسێ وەلاتان،

ئەگەر وەکو وان یان باشتر نەزانن، تا رادەیەکی ب باشی دزانن. ڤێ چەندێ ژی وەلێکرییە کو گەلەك ژ زاناو بسپور و پەهلەوانێن قادا رەوشەنبیریێ ب ئێك ژ ڤان هەرسێ زمانان ئافراندنێ بکەن و لسەر کلتورێ وان بهێتە هژمارتن. ئەڤجا وەکو کاردانەوەیەك ژبو خۆپاراستنێ و خەباتا مان و رزگاریێ، رەوشەنبیرێ کورد هەولدایە کو زمانێ کوردی بپارێزیت و بکەتە ناسناما نەتەوا کورد. سەرەرای هەمی هەولێن داگیرکەران ژبو سەرگۆنکرن و تەپەسەرکرنا کلتۆر و زمانێ کوردی، هەردوو بزاڤێن رەوشەنبیری و رزگاریا گەلێ کورد رۆلەکێ گرنگ‌هەبویە دپاراستن و دەولەمەندکرنا زمانیدا.

پشتێ سەرهەلدانا پیرۆزا بهارا نوت وئێکێ ل کوردستانا عیراقێ و پەیداکرنا دەلیڤەیەکا باش بو ئازادیا هزرکرنێ و دەربرینێ و خواندن و نڤیسینا ب زمانێ دایکێ (زمانێ کوردی ب هەردوو دیالکتێن خوە یێن سەرەکیڤە)، هەمی هەول و شیان یێ دهێنە تەرخانکرن ژبو کوردیکرنا سەروسیمایێ کلتورێ هەیی و سەرەدەریکرنێن رامیاری و جڤاکی و هەمی لایێن دی یێن ژیانێ. ئەڤ هەولدانە ژی پێنگاڤەکە ژبو کوردیکرنا داهێنانا ئەدەبی یا نڤیسەرەکێ هەڤسوویێ کوردستانێ و هەتا ئەم پویتەکێ باش نە دەینە وەرگێرانێ و دانوستاندنێ دگەل هەڤسوی و هەڤکویفێن وەلاتێ خوە نەکەین پروسا وەرار و پێشکەفتنا مە یا ئەدەبی ناکەفتە سەر رێبازا خوە یا دروست. لێ، چونکو پێنگاڤێن گوهورینا جڤاکی ژهەر لایەکیڤە بیت ئەگەر ب بازدانێن شەنگستەیی و کویر و ب رێکەکا بەرە بەرەیی یا پۆزەتیڤ نەبیت، دبیت ئەنجامێن باش ژێ نە زێن، هەروەکو دبێژن "کەس ب پلەکێ نا گەهتە سەرێ ملەکێ" لەوا ب هزرا مە هەر وەرگێرانەکا ژ زمانێ عەرەبی، کو پرانیا رەوشەنبیرێن دەڤەرێ ڤی زمانی باش دزانن و دویر نینە هندەك ژ زمانێ دایکێ ژی باشتر بزانن، دبیت پێشوازییەکا پرئەڤین و تامەزرویی ژلایێ رەوشەنبیرانڤە نەبیت و هەر رەوشەنبیرەکێ بڤێت ڤان چیروکێن وەرگێرای بخوینیت دێ ل دەقێن وی یێن عەرەبی ڤەگەریت، چونکو خواندنا زمانێ عەرەبێ دبیت بو وان ب ساناهیتربیت. نەمازە خواندنا ئەکادیمیا پرانیا رەوشەنبیران هەتا بەری سەرهەلدانێ ژی ب زمانێ عەرەبی بوویە.

ئەڤجا مادەم هۆسانە، وەرگێرانا ڤان چیرۆکان بو سەر زمانێ کوردی ژبو چییە؟
هەلبەت پشتی حکمەتا هەرێما کوردستانا عیراقێ برێارا کوردیکرنا دامودەزگەهێن میری و خواندنگەهان دای و خەلکی پێگیرییەکا باش پێکری و پێ دکەن. دماوەیێ چەند سالەکێن کێمێن داهاتیدا دێ کومەکا رەوشەنبیرێن کوردیزان وعەرەبی نەزان پەیدا بن. ئەڤێ کوما رەوشەنبیرێن ئاییندەیی ژی دێ پێدڤی ب هندەك ژێدەرو بەرهەمێن کوردی هەبیت و بەرهەمێن وەرگێرای دێ بنە پشکەکا گرنگ‌ژ ئاویزێ پاراستنا دئێکگەهشتنێ و بەردەوامیا سەرەدەریکرنێ و ئالوگۆرکرنا پروسا ئەپستمولوژیا دوولایەنی.

ژلایەکێ دیڤە، ئەڤ جورە وەرگێرانێن نهۆ دێ بنە بەرێ بنیاتێ پاقژکرنا زمانێ کوردی و زەنگینکرنا وی، چونکو ئەڤە چەندین سالە پەیڤێن بیانی دناڤ زمانێ مەیێ شریندا دهێنە بکارئینان و ڤەجوین هەتاکو زمان ژ پەیڤێن بیانی پڕبوی، ئەڤجا وەکو ئەرکەکێ نیشتمانی و نەتەوەیی لسەر ملێن هەر ڕەوشەنبیرەکێ کورد. پێدڤی بویە کو ڤی زمانی ژ پێشێلبوونێ ڕزگارکەت و دەولەمەندکەت، یان ژی ب کێمی دەولەمەندییا وی یا سروشتی بپارێزیت یان بزڤرینتەڤە.

وەرگێرانا من بوڤان چیرۆکێن چیرۆکنڤیسێ عەرەب (زەکریا تامر)، ژبەر ڤان ئەگەرێن ژێگۆتی بویە کو وەغەرا هزار میلی ژ پێنگاڤا ئێکێ دەست پێ دکەت و هەروەسا ژی بەرهەمێ ڤی ناڤدارێ ڤادا ڕەوشەنبیرییا عەرەبی ل دەڤەرا مە یێ کێمە و دبیت ب دەست هەمی ڕەوشەنبیران نەکەڤیت، نەمازە ئەوێن ل دەسپێکا ژیانا خوە یا ڕەوشەنبیریێ ل بەرهەمێن داهێنەر دگەرێن.

دڤێ وەرگێرانێدا، گەلەك جاران من یێ هەولدای ئەو بیروکێن دزمانێ مەدا نەبن نێزیکی زمانێ مە بکەم و بڤێ چەندێ دگەلەك جهاندا ( هەرچەندە دکێمن ) من دەسکارییەکا بچووك دشێوازێ هەڤۆکاندا کرییە .. بێی کو گەوهەرێ هزرێ بریندارکەم.

هەروەکو گەلەك ڕەوشەنبیر دزانن کو زەکریا تامر یێ ل سالا 1931 هاتییە سەر رویێ دونیایێ و هەر ژ سالا 1957 چیرۆك نڤیسینە و وەکو چیرۆکنڤیس هاتییە نیاسین، پەخشانێن پێترانکی دگەلەك ڕۆژنامە و گوفاراندا نڤیسینە و ئەزمونەکا باش هەیە دوارێ چیرۆکێن زارۆکاندا.

زەکەریا تامر ئێکە ژ ناڤدارێن عەرەبان دوارێ چیرۆکا هونەریداو هەتا نهۆ ژی چیرۆکێن وی بو زمانێن (ئینگلیزی، فرەنسی، ئیسبانی، ئیتالی، بولگاری، روسی، ئەلمانی) هاتینە وەرگێران. مەژی ئەڤ کومەلا هەلبژاردە ژ چیرۆکێن وی یێن وەرگێرای بو سەر زمانێ کوردی ژڤان کومەلە چیرۆکێن خوارێ وەرگرتینە.

1. **صهيل الجواد الابيض/ چاپا دووێ 1978 / چاپا ئێکێ ل سالا 1961 چاپ بوویە.**
2. **ربيع في الرماد / چاپا سیێ 1994/ دار رياض الريس – لندن / چاپا ئێکێ ل سالا 1963 چاپ بوویە.**
3. **الرعد /چاپا سیێ 1994/ دار رياض الريس – لندن / چاپا ئێکێ ل سالا 1970 چاپ بوویە.**
4. **دمشق الحرائق/ چاپا سیێ 1994/ دار رياض الريس – لندن / چاپا ئێکێ ل سالا 1973 چاپ بوویە.**
5. **النمور في اليوم العاشر/ چاپا سیێ 1994/ دار رياض الريس – لندن / چاپا ئێکێ ل سالا 1978 چاپ بوویە.**
6. **نداء نوح / چاپا ئێکێ- 1994 / دار رياض الريس – لندن.**

**ژبلی ڤان هەر شەش کتێبان "ل گورەی پێزانینێن من" سێ کتێبێن دی ژی چاپکرینە, ئەو کتێب ژی ئەڤێن خوارێنە:**

1. **سنضحک** / چاپا ئێکێ – 1998 / **دار ریاض الریس** / بیروت– لبنان.
2. الحصرم / چاپا ئێکێ – 2000 / **دار ریاض الریس** / بیروت– لبنان.
3. تکسیر رکب / چاپا ئێکێ – 2002 / **دار ریاض الریس** / بیروت– لبنان.

**لێ ژڤان هەرسێ کتێبێن داویێ چ چیرۆك نەهاتینە هەلبژارتن ژبو وەرگێرانێ, دبیت دئاییندەیدا ئەڤی کاری ئەنجامدەین. لێ, نهو**

**ب تنێ چیرۆکێن هەر شەش کتێبێن ئێکەم دێ ئێخینە بەردەستێ خواندەڤانێ زمانێ کوردی.**

نیازا من دڤێ هەلبژارتنێدا ئەوە کو ب دروستی خۆدیکا بەرهەمێ ژیانا وی یا وێژەیی بو خواندەڤانێن کورد پێش چاڤکەم. هەروەسا من چیرۆك ل گورەی سنسلا دیرۆکا نڤیسینا وان رێز نەکرینە .. ژبەرکو من باوەرییا ب وێ چەندێ هەی کو بەرهەمێ هەرنڤیسەرەکی زاییێ هزرا وییە وب ئێك چاڤ بەرێخوە ددەتێ دگەل لبەرچاڤ گرتنا جھ و سەردەمێ تێدا نڤیسای، ژلایەکێ دیڤە ژی، دەمێ خواندەڤان ڤێ هەلبژاردەیا چیرۆکان دخوینیت, دا خۆشیەکا دی ژبلی خۆشیا داهێنانێ و هزرا دەربڕی ژ جوداهیا سەردەمێن نڤیسینێ وەرگریت.

دناڤەرۆکێدا، ل بەرامبەری هەر چیرۆکەکێ ژ چیروکێن ڤێ کومەلا هەلبژاردە، ناڤێ کومەلا چیرۆکا ژێدەر ب زمانێ عەرەبی هاتییە نڤیسین، ئەگەر خواندەڤانەکی ڤیا ل دەقێ عەرەبیێ چیرۆکێ ب زڤڕیت, دا گەلەك ب لێگەریانێڤە مژویل نەبیت.

ب هزرا من ئەڤ چیرۆکە گەلەك نێزیکی جڤاکێ مەنە و خواندەڤان دێ شێت دگەل ژیت و خۆشیێ ژێ وەرگریت، ئەڤە ژی دبنەکوکا خوەدا پالدەرەکێ دی یێ گاریگەر بوو ئەز پالدایم ڤی بەرهەمی وەرگێرمە سەر زمانێ کوردێ.

ل دوماهیێ، هیڤیدارم بڤێ وەرگێرانێ ئەز شیابم لبنەکا دی بدانمە سەر ئاڤاهیێ رەوشەنبیری و کلتور و زمانێ کوردی.

**د.عارف حیتو**

**دهۆك** 2000

# مەلیکی گۆتە وەزیرێ خوە

## مەزن و بچووك

مەلیکێ ئەڤینداریێ ئاخفتنێ گۆتە وەزیرێ خوە یێ حەز ژ گوهدانێ دکەت: من هەمی ئەو تشت یێن هەین کو ببمە دلخوشترین کەس لسەر رویێ عەردی.

وەزیری لێ ڤەگەراند: تو دلخوشترین مەلیکی و ژهەمی خەلکی دلخوشتری، خودێ تە ژ چاڤێن حەسوودان ب پارێزیت.

مەلیکی گۆت: من هند مال یێ هەی تێرا ئاڤاکرنا باژێرەکی دکەت.کو خانی یێن وی هەمی زێر بن.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەز گوری خودێ ببم، ددەتە هندەکا و نادەتە یێن دی.

مەلیکی گۆت: من شاهژنەکا جوان هەیە، گەلەك ئەز دڤێم.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ما ژنکەك هەیە تە ببینیت و حەز ژتە نەکەت !؟

مەلیکی گۆت: من وەزیرەکێ ژیرمەند یێ هەی، شیرەتا ل من دکەت و خوە ژ خزمەتا من نادەتە پاش.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەوێ تو رێزێ لێ دگری و دبێژیێ ژیرمەند، هێشتا پێنگاڤا ئێکێ دناڤ دونیا ژیرمەنداندا نە هاڤێتییە.

مەلیکی گۆت: من سەربرەك یێ هەی، سەرێن دوژمنێن من دبڕیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: دوژمنێن تە دمرینە، هەر ژ دەمێ دوژمنکارییا تە کری.

مەلیکی گۆت: من سەرلەشکەرەك هەیە، بێلایێن من دپارێزیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: خودێ بێلایێن تە زێدەکەت و دوژمنێن تە کێم کەت.

مەلیکی گۆت: من سەروکەکێ پولیسان هەیە، دزیکەرا دگریت بەری دزیێ بکەن.

وەزیری گۆت: دێ ژێ داخوازکەین کو رێکێن خوە وەراریێ بێختێ و پێش بێخێت، داکو بشێت دزیکەران بگریت بەری ژ دایك ببن.

مەلیکی گۆت: من هەمی تشتێن هەین ئەوێن مروڤی دلخوش دکەن، لێ ئەز ب تەڤاڤی نەیێ دلخوشم.

وەزیری گۆتە مەلیکێ خوە: مرۆڤ دشێت هەمی تشتا دژیانێدا کونترۆل کەت و بگەهتێ ژبلی خوشیێ، خوشی ئەو گولا ب رکە کو ژبلی باخچەیێن دلی، ل چ جهێن دی شین نابیت، دل ژی ئەو زارۆکێ سەیرێ سەر بەردایە.

مەلیکی گۆت: ئەز دزانم، چ دێ خوشییا من بێ کێماسی تەڤاڤکەت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: دێ هەیڤا شەعبانێ هەمیێ ب رۆژی بم ژبو کەرەم و دانا خودێ.

مەلیکی گۆت: ئەوا ژمن کێم ئەدیبەکە، لسەر مەلیکی و میرگەها من بنڤیسیت کو ببتە کلتورەك ژبو رڤشتێن بهێن، ئو ئەڤ ئەدیبە بهێتە نیاسین ب ئەدیبێ مەلیکی.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ب ناڤودەنگترین ئەدیب، هەر رۆژ وەکو مێش وکولی و تورێ یێ لبەر دەرگەهێ تە . تەکی دڤێت؟ موتەنەبی، تەوحیدی، مەعەرری، جاحز؟ ئەگەر تە ئەدیبێن بیانی دڤێن، دێ بوتە باشترین ئەدیبان ب ئەرزانترین بها ئینین، هەروەکو ئەم ترومبێل و فروکە وگەنم و گوشتی و پەنیری و برنجی وفێقی وکەسکاتی ژی ژدەرڤە دکرین ودئینین.

مەلیکی گۆت: من چ ئەدیبێن ب ناڤودەنگنەڤێن، چونکو دێ یێ درەوین بیت، خو ئەگەر خوە گوهدار و وەفادار ژی نیشا بدەت، دێ هەرمینیت دفن بلندەکێ ژ خوە رازی.

وەزیری گۆت: کەسەك تەحەمولا دفن بلندێن ژخوە رازی ناکەت.

مەلیکی گۆت: هەر بەهرەمەندەك یێ دفن بلندو ژ خوە رازییە، ئەختوبارییا وی ژی بتنێ بو بەهرەیا وییە . ئەو بەهرەیا وەلێ دکەت کو هزرکەت ئێکە ژ دانەرو داهێنەران. ئەو ئەدیبێ خوەشییا حەژێکرنا خەلکی ب جەربینیت، چ تشت د دونیایێدا هەمبەری ڤێ خوەشییا وی نابن، من ئەدیبەکێ بچویك دڤێت نەیێ بەرنیاس بیت، دا ئەز وەکو من دڤێت وی ب خودانکەم، بو من یێ ئەمین بیت و ب کورەیی گوهداریا من بکەت، ئو هەردەم ل بیرێ بیت کو ئەز خودانێ کارێ وی یێ ئێکانەمە.

وەزیری گۆت: لێ یێ بچویك هەر یێ بچویك نابیت، دێ مەزن بیت و دێ دفن بلند بیت.

مەلیکی گۆت: ئەوێ شیانێن دفن بلندکرنێ هەبن، شیانێن نزمکرنێ ژی هەنە .. ئەوێ زەنگین دکەت، دشێت هەژار کەت ژی.

وەزیری وەسا دا خویاکرن کو یێ دهزرەکا کویردا و پاشی گوتە مەلیکێ خوە: "ل دەورێ بەرێ زەلامەك هەبوو، ژنکەك و کورەکێ بچویك هەبوون ، ژیانا وی گەلەك یا خۆش بوو، چ نەخۆشی نەبوون ژبلی تبعەتێ ژنا وی یێ نەخوش . ئەوا هەردەم حەز ژ شەری وگازندە و پت پتێ دکر، کا چەند حەز ژ کورێ

خوه دكر، هند حەز ژنا خوه نه دكر، چ رێكێن خوه ژێ قورتالكرنێ ژی نه ددیتن . رۆژەكێ ژ رۆژان گورگەكێ بچویك گرت و ئینا مال، گەلەك چاڤێ خوه دداییێ، ل وێ هیڤێی بوو كو مەزن ببیت و ژنا وی بخۆت. گورگ مەزن بوو، زەلامی هەست پێكر كو رۆژا قورتالبوونێ یا نێزیك دبیت، لێ گورگی ژنا وی نەخوار، ئەوا گوشتێ وێ پیر، بەلێ كورێ وی یێ گوشت تەر خوار".

مەلیكی گۆت: ئەگەر سەرهاتییا تە درێژتر با ، بێی حەبكێن خەوێ دا نڤم.

وەزیری لێ ڤەگەراند: دێ سەرهاتییەكا دی یا كورت بو تە بێژم، داكو مەترسییا ئەدیبێن بچویك بزانی.

مەلیكی گۆتە وەزیرێ خوە: پێدڤی ب چ سەرهاتیێن دی ناكەت، یا ژ دەستێ من دەركەفتی، من ب نهێنی كارگەهەكا چێكرنا ئەدیبێن گوهدار یا چێكری و بەرهەمێ ڤێ كارگەهێ پشتی چەند هەفتییەكا دێ تژی بازاری بیت.

مەلیك یێ رژد بوو .. كارگەها وی كاركرو ئەدیبێن بێهن برسی و گوهدارێن دەستەلاتێ مشتی باژێروگوندێن گویا زەمین بوون، ئەولسەر هەمی جهو زەمانان درالبوون، ئەدیبێن بەهرەدار ژی د ڤەدەرو بێ دەنگبوون، هندەكان خوە كوشت و هندەكێن دی نڤیسینێن ركەبەر دنڤیسین .. ئەو نڤیسینێن دسەدان شەڕاندا داكەفتی و د شەڕەكێ بتنێدا د سەركەفتی.

## ئەوێن نیڤ مرۆڤ

شیروەستییان، ئەوێن گوڕان دكۆلن وەستییان، ترس ببوو كولی و هەمی رەنگێن كەسك پووچكرن. شیران گۆتە وی مەلیكێ بانگەوازا شەڕی دژی خرابان ل دونیاییێ راگەهاندی: تە سێدارە یێن هەین، بهێلە هاریكاریا مە بكەن.

مەلیكی گوتێ: وەریسێن سێدارەیان دشێن بتنێ خەلكی ب خەندقینن، لێ وێ خوینێ نا رژینن ئەوا خرابیێ دترسینیت و زۆرداریێ پووچ دكەت.

شیروەستییان و تێهنا عەردی ب خوینێ شكەست، ئێدی پێدڤی ب بارانێ نامینیت، خەریبییا وی بو گولێن سپی پر دئێشاند.

شیران هەواركرو داخوازا پشكەكا بچووك یا ئارامێی و بهێنڤەدانێ كر، لێ مەلیكی چ پویتە ب داخوازا وان نەكرو گۆتە وەزیرێ خوە: ژیێ ئادەمییان یێ كورتە، ئەوا ئەز ژێ دترسم، ژیێ من تەڤاڤ ببیت، بەری میرگەها من ژ چڤێل وخرابكارو زۆرداران ڤالا ببیت.

وەزیری گۆتیٚ: عەمر ب دەستێ خودێنە و پاشی ب دەستێ تەنە، خوەزی ئەز شیابام ئەو ژیێ من مای ژی بدانمە سەر ژیێ تە.

مەلیکی هێڤ دکرە وەزیرێ خوە: دیت پیرەمێرەکە و ئەوێ گوڕان دکۆلیت یێ ل دویڤ دکەتە غار، ب دلخوەشی کەنی وگۆتە وەزیرێ خوە: لێ ئەو ژیێ تە مای نە گەلەکە.

وەزیرێ گۆت: مەردەمێر ئەوە یێ لدویڤ هەیینیا خوە ددەت، نە گرنگە ئەگەر دانا وی یاکێم بیت یان ژی گەلەك بیت.

مەلیکی کۆت: ژی یێن مەلیکان ب دەستێ خودێنە و ژیێ خەلکی ددەستێ مەلیکێن واندانە، هندی ژی درێژ ببیت، دێ هەر دوماهییەك بو هەبیت، لەوا فەرە ب تشتێن پووچڤە نەهێتە بەرزەکرن.

وەزیری گۆت: ئەوێ مەزن ئارمانجێن مەزن دهەلبژێریت و چ ئارمانج ژ دژاتییا خرابکاریێ و پووچکرنا وێ ل هەمی جها هێژاتر نینن.

مەلیکی گۆت: دوهی من خوە گوهارت بوو، ئەز ل کولانا دگەریام ومن هێڤ دکرە رەوشا خەلکی.

وەزیری لێ ڤەگەراند: هەر پێنگاڤەکا تە هاڤێتی سەرکەفتنا خێرێ بوو لسەر خرابکاریێ.

مەلیکی گۆت: من لبەرە سەرەدانا زیندانان بکەم، ئەز حەز ناکەم خەلك بێژیت کو بێگوننەهەك یان ستەملێکرییەك یێ دزیندانێن منڤە هەی.

وەزیری گۆت: حاشا..حاشا، ئەگەر بێگوننەهەك یان ژی ستەملێکرییەك دزیندانێن تەڤە هەبن.

مەلیکی گۆت: من دڤێت ئەز بخوە ببینم، دێ زیندان زیندان ڤێرا چم.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ماتە دڤێت سەحکەیە رەوشا زیندانان یان ژی یا زیندانییان.

مەلیکی گۆت: ئەز چ پویتەی ب دیوارو سەربانان ناکەم، ئەوا ئەز گرنگیێ ددەمێ بتنێ خەلکە.

وەزیری لێ ڤەگەراند: بەری ئەز پرسیارکەم من درانی تو دێ ڤێ بەرسڤێ دەی، من زیندانی یێن ئینایین و یێ ل هیڤییا دەستوورییا سەمیانێ مە هەمیا کو بهێلیت بهێنە ژوور.

مەلیکی گۆت: بلەز بیننە ژوور.

مەلیکی ب دەستی ئیشارەت دا یاوەرکێ خوە و یاوەر ب لەز ژ ژوورا مەلکینێی دەرکەفت، پاشی زڤری و زەلامەکێ ڤەیدکری یێ دگەلدا، گەلەك یا ب رەحمەت بوو کو ژیێ وی بهێتە زانین، چونکو دهەمان وەختدا یێ پیربوو، ئو یێ جحێل ژی بوو.

مەلیکی گۆت: ئەڤە کییە؟

وەزیری گۆت: زیندانییە.

مەلیکی گۆت: تە بەحسی گەلەك زیندانییان دکر و نهۆ ئەز یێ ئێکی بتنێ دبینم.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەم یێ دچاخێ دیموکراسیێدا، ئەندامەکێ پەرلەمانی نوینەرییا هزاران کەسان دکەت و ئەڤ زیندانییە ژی نوینەرییا هزاران زیندانییان دکەت. گونەها وی ژی هێشتا یا لبەر دانوستاندنا دادگەهێ. چ حوکم دەرهەقێ وی دەرنەکەفتینە.

مەلیکی گۆتە ئەوێ زیندانی: گونەها تە چییە؟

ئەوێ زیندانی گۆت: من دزی یا کری.

ناڤچاڤێن وەزیری تێکچوون، ئەوێ زیندانی ڤێدا چوو گۆت: من ژنا خوە ژی یا کوشتی.

مەلیکی گۆت: تە بوچی دزی کرییە؟

ئەوێ زیندانی گۆت: ئەز یێ برسی بووم.

مەلیکی گۆت: ئەز دزانم برس یا چەوانە، بەری چەند رۆژان من یا جێرباندی، دەمێ ئەز ژخەو هشیار بویم، ئەز یێ برسی بووم، لێ من دوو دەقیقا خوە هێلا برسی و من داخوازا چ خوارنان نەکر، داکو ئەز ژی هەست پێ بکەم، ئەوا مللەتێ من هەست پێ دکەت.

وەزیری گۆت: سەمیانێ مە هەردەم خوە قوربانی مللەتی دکەت.

مەلیکی گۆتە ئەوی زیندانی: دەمێ ئەز ژی وەکو تە برسی بویم، من چ دزی نەکرن، لێ من گۆتە خولامێن خوە کو خوارنێ بینن، بوچی تەژی وەکو من نە دکر.

ئەوێ زیندانی ب ڤێ پرسیارێ بەهتی و هێڤ دکرە وەزیری، هەروەکو داخوازا هاریکاریێ ژێ دکەت. ئینا وەزیری گۆتە مەلیکێ خوە: ئەزبەنی پرسیارا تە موعجیزەیە، ب ساناهی رەفتارێن باش وخراب ژێکجودا دکەت و خویا دکەت ژی.

مەلیکی گۆتە ئەوێ زیندانی: ئۆ.تە بوچی ژنا خوە کوشت؟

زیندانی بلەز لێ ڤەگەراند: من کوشت چونکو حەز ژ سەمیانێ مەیێ مەلیك نە دکر.

وەزیری گۆت: دیمەنەکێ جوانە، گریا من یا دهێت، مەلیکەك خوە گوری مللەتی دکەت ومللەت خوە گوری مەلیکێ خوە دکەت.

مەلیکی گۆتە ئەوێ زیندانی: تە چەوا ژنا خوە کوشت؟.

ئەوێ زیندانی ب لێنێرینەکا شەپرزەییڤە هێڤ دکرە وەزیری و پاشی ب دوودلیڤە گۆت: من ڤەکوشت.

مەلیکی گۆتیێ: تە چەوا ڤەکوشت؟

ئەویێ زیندانی لێ ڤەگەراند: من سیکارەك ژ لێنانگەهێ ئینا و ل دەمێ خرخرا وێ یا نڤستنێ .. من سیکار دانا سەر حەفکا وێ ومن سەرێ وێ ژ لەشێ وێڤەکر.

وەزیری گۆتە ئەویێ زیندانی: دەمێ تە ژنا خوە ڤەکوشتی، تە گوت بوو "اللّه اکبر".

ئەویێ زیندانی گۆت: من ژبیرکر بوو.

وەزیری ب تنگژینڤە گۆتێ: ئەڤە گوننەهەکە لێبورین بو نینە، گونەهکار ژی هێژایی خرابترین مرنە.

ئەویێ زیندانی بەهتی وگۆتە وەزیری: من نەگوت "اللّه اکبر" چونکو من ژنا خوە نە کوشتییە.

مەلیکی ب سەرسورماییڤە گۆتە ئەویێ زیندانی: تو چ دبێژی!!.

ئەویێ زیندانی گۆت: من گۆت من ژنا خوە نە کوشتییە و نهۆ یا ل مال، تو دکاری ب هنێرییە ددویڤرا دا بزانی کو ئەز راست دبێژم، من گۆت من یا کوشتی چونکو وەزیری گۆتبوو من، وە بێژە.

وەزیری گۆتە مەلیکی: سەمیانێ من..دڤی وەلاتیدا هەر کەسەکی مافێ هەی کا باوەرییێ ب چ بینیت وچ بێژیت..ئەڤ زیندانییە وەسا هزر دکەت کو ژنا خوە یا کوشتی و ل دەف جەنابێ وە، دان بڤێ کریارا خوە یا دای، بێ کەسەك تەعداییێ لێ بکەت و بکوژ ل گورەی یاسایێ ئەوە یێ دکوژیت.

ئەویێ زیندانی بزدیا و لدور خوە زڤڕی کو هەوارکەت، لێ پاشی گازیکر: ئەز ستەملێکریمە.

وەزیری گۆتە مەلیکێ خوە: ب دورستی ئەڤ زیندانییە یێ ستەملێکرییە، دادپەروەری ئەوە کو سزایێ ئەویێ ژنکێ دکوژیت یێ جودا بیت ژ سزایێ ئەویێ زەلامی دکوژیت، چونکو میراتێ ژنکێ هندی نیڤەکا یێ زەلامییە، لەوا پێدڤییە حوکمێ مە لسەر بکوژێ ژنکێ ئەو بیت کو ب نیڤ مرنێ بمریت.

مەلیکی گۆتە وەزیرێ خوە: ئو دێ چەوا نیڤەکا وی بتنێ مرینین؟

وەزیری گۆت: دێ پشکەکا وی هەلبژێرین و دی سێدارە دەین، ئەڤ پشکا مایی دێ بو وی هێلین، کا وی چ دڤێت بلا وەلێ بکەت.

ئەویێ زیندانی گۆتە مەلیکی و وەزیرێ وی: دێ.. پشکا من یا سەری وەرگرن یان ژی یا خوارێ؟!.

ئەویێ زیندانی ب هێمنی گرنژی، دەمێ بەرسڤ بهیستی، ئو هوسا .. باژێر و گوند مشتی مروڤێن بێی پشکا خوە یا سەری بوون، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ زێدە بوونا کارەساتێن دلتەزینێن هاتن وچوونێ.

## نه گوهدارییا شەڤێ

باوشکا مەلیکی دهات و گۆته وەزیرێ خوە: شەڤ چەند یا هێدییه ! بوچی زوی ب رێڤه ناچیت.

وەزیری گۆت: ئەڤێ دبێژنێ شەڤ ..کا چەوا ئەز شەملکا نڤێژا دمالا خوەڤه دنیاسم، ئەز وەسا وێ ژی دنیاسم، گەلەك راپورت دەربارەی ژیان و هزرکرن و گیۆل و تبعەتێن وێ لنك من هەنه.

شەڤ پیرەمێرەکێ ئەحمەقە دڤێت ب ئاوایەکێ مژدار خوە نیشاندەت کو مشتی نهێنییه، لێ دەربارەی هێدییاتیا وێ ژی ژ ئەگەرێ هندێیه کو ژکەڤندا یا فێربوی، هێدی ب رێڤه بچیت. ب بەهانەیا وێ چەندێ کو سەلامەتی یا دهێدییاتییێ را، لێ ئەگەر بڤێت سەمیانێ خوە رازیکەت، فەرە لسەر وێ ژنهۆ پاشڤه ڤی تبعەتی بهێلیت.

مەلیکی گۆت: ب من وەرە تە دڤێت پێشنیازکەی کو پێدڤییە شەڤ ببیتە ئەندامێ یانەکا وەرزشی، دا راهێنانێ لسەر غاردانا بلەز بکەت.

وەزیری گۆت: هەر پێشنیازەکا دخزمەتا سەمیانێ مندا بیت، خۆش پێشنیازە.

مەلیکی گۆت: ئەگەر میرگەها من یا بێ شەڤ با دا باشترین میرگەه بیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: نهۆ ژی باشترین میرگەهه.

مەلیکی گۆت: ئەگەر میرگەها من یا بێ شەڤ با، دا هەردەم رۆژ بیت و مەلیك بێ راوەستان داکارکەن وشەڤێ ئەو تە سلیمی خاڤی و نڤاندنێ نه دکرن.

وەزیری گۆت: ئەگەر سەمیانێ مە بڤێت، بلا فەرمانەکێ بدەتە شەڤێ، کو ئێدی نەهێتە وەلاتی و شەڤ جرعەت ناکەت، نەگوهدارییا فەرمانی بکەت.

مەلیکی گۆت: باب و باپیرێن من، خودێ ژێ رازی بیت و تەلارێن وان دبەهەشتا خوەدا فرەهـ کەت، هەولێن ئەهێلانا شەڤێ ددان و هەمی هەولێن وان سەرنەگرتن، شەڤ هەر یا بەردەوام بوو، ل دوماهییا هەر رۆژەکێ دهات و گوهداریا چ فەرمانان نه دکر.

وەزیری گۆت: شەڤ فەرمانێن مە بجهـ نا ئینیت، چونکو ئەزمانێ مە نزانیت، شەڤ ژ بلی ئەزمانێ خوە چ ئەزمانێن دونیایێ نزانیت، ئەو ئەزمانێ هەمی زانا نه شیاین تەلیسمێن وێ ڤەکەن.

مەلیکی گۆت: ئەگەر رۆژەکێ شەڤێ زیندانکەم، چ دلوڤانییێ پێ نابەم، لبن پەرێن شەڤێڤه پیلان دهێنه گێران و تەلهەوفتنه دهێنه رێکخستن.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەزبەنی، هەیڤێ ژ بیرنەکە، دویڤەلانك و هەڤالبەندا شەڤێیە، هەیڤ دەرناکەڤێت هەتا شەڤ نە هێت.

مەلیکی گۆت: هەیڤ چییە؟.. نە مێزا خوارنەکا خۆشە و نە کەنیزەکن و نە زێرە و نە شەڕێن سەرکەفتینە، چ مفا دهەیڤێدا هەیە ژبلی ئازراندنا هەستا عاشقێن ساویلکە و بەهرەیا هۆزانڤانان ژبو ڤەهاندنا هۆزانێن نەزان.

وەزیری لێ ڤەگەراند: هەمی کەڤالێن هونەری یێن ب شەڤ و هەیڤێ هاتینە چێکرن، سوباهی دێ هێنە سوتن.

مەلیکی گۆت: ئەز حەز ژ شەڤێ ناکەم، من بێزار دکەت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ژ ئەلندا سوباهی، دێ بێزاریێ ل خەلکی ڤەدەغەکەین، نابیت خەلك هەست ب وی تشتی بکەت، ئەوێ مەلیکێن وان هەست پێ دکەن.

مەلیکی گۆت: نهو ئەز دێ وەکو ئەدیبێن چەرخێ بیستێ ئاخڤم ودێ بێژم: بێزاری..هۆڤەکە من دخۆتن.

وەزیری لێ ڤەگەراند: کچێن سەماکەر وسترانبێژ دکارن بێزاریێ بکوژن.

مەلیکی گۆت: ئەز ژکچێن سەماکەر و سترانبێژ ژی بێزار بویمە.

وەزیری لێ ڤەگەراند: کچێن سترابێژ دچڤێلن و یێن سەماکەر دساویلکەنە، هەر دوو جوین بێزاریێ پەیدا دکەن، دێ کورێن سەماکەر وسترانبێژ بەرهەڤکەین.

مەلیکی گۆت: ئەز ژ سەمایێ و ژسترانا یێ بێزار بویم.

وەزیری لێ ڤەگەراند: سەماکرن بێ شەرمییە و ستران گوتن چڤێلییە.

مەلیکی گۆت: شەڤ یا کرێتە و درێژە، ئەگەر ئاخفتنا خۆش و دلڤەکەر نەبیت کورت نابیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: هەمی زانا و ئەدیبێن وەلاتی یێ ل هیڤیا ئیشارەتا سەمیانێ مە.

مەلیکی گۆت: من کەسەك ژ وان نەڤێت، ئەز بەروەخت دزانم کا دێ چ بێژن، هەروەسا ئەز هێڤکرنا وان یا ئەبلەهانە ژی دبینم دەمێ ل گەنجینێن من د گەرێن. تو وەزیرێ منی و ئەرکێ تەیە بو من سوحبەتەکێ بکەی، شەڤا دوژمن ژبیرا من بچیت، دێ بو من بەحسی ژنکا بکە، سوحبەتا لسەر ژنکا جوانتر و خوەشترە ژ ژنکا بخوە.

وەزیری گۆت: مرۆڤ دشێت دەست ژهەمی تشتێن ژیانێ بەردەت ژبلی ژنکا .. ژنکا جوان خوناڤە، عەڤرێ سپییە، شنەبایە . گیایێ کەسکە، گولبارانە، موسیقایە.. .

مەليكی گۆتیێ: ئەڤە چ ڤلڤلییە؟ تو یێ وەكو هۆزانڤانان دئاخڤی وەكو لسەر ژنكێ دنڤیسن، زانینا وان لسەر ژنكێ، بتنێ ماوەركرنا وێنەیێن ئەكتەرڤانانە. هەركەسێ ل گورەی وێنەی بتنێ حوكمی لسەر ژنكێ بدەت ژبلی تیڤلا چ نابینیت، ئو.. نەشێت بچیتە دكویراتییێدا، ژنك بو بێهنەكێ خۆشییە و بو چەندین سالان نەخۆشییە، خرابییا وێ ژ باشییا وێ پترە.

وەزیری گۆت: ژنك ئاگرەكە مرۆڤی دسوژیت و كادییەكە مرۆڤی كورە دكەت.

مەلیكی گۆت: ئەگەر شەڤ نەبایە ئەز نێزیكی ژنكێ نە دبووم و من ژن ژی نە دئینا، دەمێ دبیتە شەڤ مرۆڤ هەست ب خەریبی و تنێیاتیێ دكەت و بێهێز دبیت، دلێ وی دچیتە مێیاتیێ، لەوا دێ خوازیت چ وەك ژن بیت یان ژی وەك كەنیزە.

وەزیری گۆت: ژنك چێكرییەكا موزعیج و ڤلڤل و مایتێكەرە، ل پاشەرۆژێ دێ فیلوسوفەك دەركەڤیت و دێ دەتە خویاكرن كو جەهنەم ژنكە.

مەلیكی گۆت: بیردانكا من یا بێهێز بوی و ئەز گەلەك ژبیردكەم، من چەند ژن هەنە؟

وەزیری لێ ڤەگەراند: ل گورەی هژمارتنا دوماهیێ، سەمیانێ من چل و چوار ژن یێن هەین.

مەلیكی گۆت: ئەعوزوبیللا.. ژڤێ هژمارێ.

وەزیری گۆت: ئەگەر سەمیانێ من بڤێت، ئها نهۆ دێ ڤێ هژمارێ گوهورین و دێ بنە چل و پێنج.

مەلیكی گۆت: ئایینێ مە یێ پاڤژ.. چوار ژن بو زەلامی یێن حەلالكرین، چەوا تە ئەز ئاگەهدار نە كریمە، كو من پێچەوانەی حكمێن شەریعەتێ كرییە.

وەزیری لێ ڤەگەراند: چ جاران سەمیانێ من پێچەوانەی حكمێن ئایینی نەكرییە. داكو ئەزوی ئاگەهداركەم.

مەلیكی گۆت: چەوا من نەكرییە؟ ما تو نابێژی كو من چل و چوار ژن هەنە؟

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەو مافێ مەلیكان هەی مافێ وان بتنێیە و نە بو خەلكێ دییە.

مەلیكی گۆت: ئایینێ مە چ جوداهیێ نائێختە دناڤبەرا مەلیكی و خەلكیدا.

وەزیری لێ ڤەگەراند: راستە هەمی مرۆڤ ،چ مەلیك بن یان خەلكێ هەچكوهەیی، تەڤ وەكهەڤن وەكو ددانێن شەی، لێ بەهرا ئەوێ كاروكێفەراتێ دكەت و رەنجێ دكێشیت و دوە ستیێت، نە وەكو بەهرا ئەوێن بێكارن، خودێ یێ دادپەروەرە حەز ژ ستەم وستەمكاران ناكەت.

مەلیکی گۆت: ئەز دزانم تو چەند حەز ژ شیرەتان دکەی، دەمێ شیرەتێ دەست پێ دکەی دڤێت چ تشت تە نە راوەستینیت، هەتاکو شیرەتا خوە تەڤاڤ دکەی.

وەزیری گۆت: هەر کۆلەیەك ژ کۆلەیێن خۆدێ ژ خوە بەرپرسە و خۆدێ بو هەرکەسەکی چوار ژن یێن حەلالکرین، لێ مەلیك ژ خوە بتنێ بەرپەرس نینە . بەلکو ژ ملیونەها مرۆڤان بەرپەرسە . لەوا وی مافێ هەی ملیونەها ژنا بینیت، ئو ئەگەر ڤی مافێ خوە بجھ بینیت، رامانا وێ ئەو نینە کو دژی ئایینییە .. بەلکو گوهداریا ئایینییە و بجھ ئینانا حکمێن شەریعەتێیە.

مەلیك گرنژی و هزرا تەختەکی کر تەمەت وەلاتێ لبن حوکمێ وی بیت و ئەڤ تەختە ب ژنکێن جوان یێ فەرشکری بیت، مەلیکی هزرکر کو شەڤ یا شکەستییە و یا دەرئیخستییە ژ وەلاتی، زەلام ژی بێی بێهنڤەدان یێ کار دکەن. لێ شەڤێ، ژ دەرڤەی تەلارا مەلیکی چوارمێکیا خوە ڤەدا بوو، چ پویتە ب فەرمانێن مەلیکی نە دکر و زەلام هان ددان کو شیر هەبن داکو هەمبەری مەلیکێن زۆردار راوەستن.

## جدیدانێ

مەلیکی د خەودا ددیت، هەسپەکێ رەش لسەر جاددەیان غار ددا و ژکەرب دشهی . شهینا وی هەمی دەر دگرتن، کومەکا سەربازان ل دویڤ دکرە غار، هندەکا قامچی وهندەکا حەیزەران و هندەکێن دی قەید و زنجیر ڤێ بوون، مەلیك دگەل خوە دئاخفت: ئەز دزانم ئەز یێ نڤستیمە وئەز یێ خەونەکێ دبینم، رامانا وێ ئەوە کو ئەو خەلکێن ئەز حوکمی لێ دکەم هەسپە و ئەو سەربازێن سەرنەکەفتی ئەزم.
دەمێ سپێدێ مەلیك هشیار بوی، خەونا خوە ژبیرکر، چ ژێ نەما بوو. ژبلی تەحلاتییەکا مژدار. وەلێکر کو تەختێ خوە بهێلیت وەکو ئەوێ ژ ستریێا درەڤیت، دنیڤەکا ژوورا خوەدا دراوەستیێت . یێ بوشومی و ب خەموکی لدور خوە دنێریت، ژنشکەکێڤە ژنکەکا نڤستی لسەر تەختی دبینیت، ژنك یا روی سپی بوو، پرچا وێ یا رەش و درێژ و قژاڤژ بوو، گەلەك جوان هاتە پێش چاڤێن مەلیکی و دلرەق وەکو دلرەقیيا مرنێ. دوی دەمیدا، ژنکێ چاڤێن خوە ڤەکرن، جوانتر ودلرەقتر هاتە پێش چاڤا.

ژنکێ ب سەرسورماییڤە گۆتە مەلیکی: تو بوچی هوسا زوی هشیار بوی؟

مەلیکی ژێ پرسیارکر: تو لسەر تەختێ من چ دکەی؟

ژنکێ ب گرنژینڤە لێ ڤەگەراند: ئەز وێ دکەم ئەوا هەر ژنکەکا گوهدار بو مێرێ خوە دکەت.. یا سەیر ئەوە کو ئەز لسەر تەختێ تە نەبم.

مەليك: توكيى؟

ژنك: تو تڕانا دكەى يان ژى حالەتێ ژبيركرنێ ڤێ جارێ گەلەك يێ دژوارە، باش هێڤكە من، ما بيرا تە ناهێت كا ئەز كيمە؟

مەليك: هەروەكو بەرى نهو من تو يا ديتى.

ژنك:ئەرێ ما بيرا تە ناهێت كو تو يێ ب ژنى ؟

مەليك: ئەز دزانم ئەز زگوردم وحەز ژ ژنئينانێ ناكەم.

ژنك: ئەڤە پێنج سالن تو يێ ب ژن.

مەليك: ژنا من كييە؟

ژنك: پا ئەز چ دكەم لسەر تەختێ تە، ئەگەر ئەز نە ژنا تەبم ؟!

مەليك: تو ژنا منى، سەيرە ! من بوچى تو ئيناى؟

ژنك: چونكو ئەز بازارەكێ مفادار بووم، ئەز يا جوانم وكچا مەليكەكيمە كو هەمى ژێ دترسن.

مەليك: هەمى ژێ دترسن ژبلى من.

ژنكێ ب فێلبازيڤە گۆتێ: ئەگەر تو ل كچا وى سوار دبى، ئەڤە مەعنا وێ ئەو نينە كو تول لەشكەرێ وى ژى سوار دبى.

مەليكى لێ كرە ڤێژى: دێ نوكە دەركەڤە ئەگەر دێ......

ژنكێ ئاخفتنا وى بڕى وگۆتێ: پێدڤى ناكەت كەربێن خوە ڤەكەى و گەفا بكەى، ئەز يا دگەل رەفتارا تە راهاتيم، بو من نە تشتەكێ سەيرە، ب شەڤێ من دنازينى و ب رۆژێ ژى دگەل من يێ دلڕەقى.

مەليكى دڤيا باخڤيت . لێ ژنكێ بلەز گۆتێ: نە ئاخڤە، پێدڤى ناكەت يەك پەيڤ ژى باخڤى، ئەز گوهدارييا هەمى فەرمانێن تە دكەم، ل بيرا تەيە ب شەڤێ چەوا من گوهدارييا تە دكر؟! ئەو گوهدارييا نە هێتە ژبيركرن.

ژنكێ خوە ژسەر تەختى هاڤێت و ب كەنيڤە ژ ژوورێ دەركەفت، كەربا مەليكى زێدەتر لێهات وكرە هەوار، هندەك ياوەرێن وى دهەوارێ هاتن.

مەليكى گۆتێ: نهو من وەزيرێ خوە دڤێت.

ياوەر ب ترس و ب غاردانڤە چونە مالا وەزيرى و دوى دەميدا مەليكى چاڤێن خوە دانانە سەرێك، ديت هەسپەكێ رەش يێ ژ كەربا دشهيت و يێ ب دويڤ كومەكا سەربازانڤە، كو حەيزەران و قامچى و قەيد

و زنجیر ڤێ بوون. پاشی مەلیکی گوه ل پێڤەدانا دەرگەهی بوو، چاڤێن خوە ڤەکرن، زەلامەکی خوە نێزیك دکر و ب رێزگرتن خوە چەماند.

مەلیکی گۆتێ: تو کیی؟

زەلامی گۆت: ئەز وەزیرێ تەمە، ئەز ئەوم یێ هەر ژ رۆژا تو لسەر عەرشی روونشتی شەهنازیێ دبەت کو وەزیرێ تەیە.

مەلیك: ئو بوچی ئەز لسەر عەرشی روونشتم، ما ژبلی عەرشی چ کورسی ل وێرێ نە بوون ؟

وەزیر: ئەوێ لسەر عەرشی ب روینیت، دبیتە مەلیك.

مەلیك: کەواتە، نهو ئەز مەلیکم.

وەزیر: ژبلی تە، کەس مەلیك وسەمیانێ مە نینە.

مەلیك: مادەم ئەز مەلیکم و تو وەزیرێ منی، بو من بەحسی وی خەلکی بکە ئەوێ ئەز حوکمی لێ دکەم.

وەزیر: خەلك یێ باشە، چ داخوازی نینن ژبلی زێدەکرنا باج و خەراجێ داکو بشێن پشکداریێ دخزمەتا وار و وەلاتیدا بکەن.

مەلیکی ب کەربەکا ڤەشارتیڤە گۆتێ: دوو روویاتیێ و شێلمشرینیێ بو من نەکە، بێژە من رەوشا خەلکی چەوانە ؟

وەزیر: خەلك کومەکا نەزانانە، دزانن وان چ ماف هەنە، لێ ئەرکێن لسەر ملێ خوە یێن ژبیرکرین . هەلپەرستن . ... زوی ب گۆتگۆتکا داخبار دبن، گەلەك یا ب ساناهییە کو حیلە لێ بهێتە کرن و بهێنە دسەردابرن، غەرەزدار دکارن یاریا پێ بکەن. ئەگەر بێژنێ مەلیك بەرپرسە ژ شۆربونا مەمکێن ژنکێن وە، دێ باوەرکەن و دێ کەرب وکینا ژ مەلیکی راکەن، راستە خەلك پیچەکێ یێ برسییە و ب تنێ پیچەکا کەرامەت و ئازادیێ یا هەی، لێ ئەو بتنێ ژ ڤێ رەوشێ دبەرپرسن . کاری ناکەن و هەرئێك ژ سپێدێ هەتا ئێڤاری ب تنێ کار دکەت و پاشی ل چایخانێ دروینیت ودکەفتە سوحبەتێن پویچ، ئەگەر دەه دەمژمێرێن دی ژی کارکربا دا رەوشا وان باشتر بیت و دا دتێر بن.

مەلیك: ئەرێ دزیندانێن منڤە، هندەك هەنە حوکمێ سێدارەدانێ لسەر بیت.

وەزیر: ب دەهان هەنە.

وەسا یادیار بوو کو مەلیك ژڤێ بەرسڤێ نەیێ رازییە، ئێکسەر وەزیری گۆتەڤە: ب دەهان وب سەدان وب هزاران یێن هەین.

مەليك: هەميا پێكڤە ل رۆژا نيڤرو ب سێدارێ ڤەكە و نە وەك هەرجار ل بەرێ سپێدێ، ل پێش چاڤێن خەلكى سێدارە بدە و چ داران نەهێلە ئەگەر سێپێكەك پێڤە نەبيت.

مەليكى هزركر كو يێ شهينا هەسپەكێ حێنج دبهيسيت ، گۆتە وەزيرێ خوە : ديرۆك دێ بو من ڤەگۆ بيت كو من باشترين ماموستايێ مرنێ يێ پەيداكرى .

دەمێ بويە نيڤرۆ، هەمى دارێن وەلاتى ببوونە سێپێك ، لێ هەسپێ رەش ما دخەونا مەليكيدا ول جاددێن باژێرى ب دويف خەلكيڤە بوو... ئوخەلك ب دويفڤە بوو.

## ئەزمون

مەليكى ب غەيدينڤە هێڤ دكرە وەزيرێ خوە، لێنێرينێن وى دهشك بوون، گۆتى: تو دزانى كو ئەز يێ ژ سوحبەتێن تە بێزار بويم، هەردەمێ پرسيارەكێ ژتە دكەم، بەرى باخڤى ئەز بەرسڤێ دزانم.

وەزير: ئەز سوزێ ددەمە تە كو ژنهو پاشڤە ببمە مرۆڤەكێ دى يێ ژنوى ژدايكبۆى، دێ هندەك بەرسڤێن وەسا دەم كو هزربكەى ئەز نە ئەوم يێ بەرێ.

مەليك: ئەز دێ ئەزمونەكا ب زەحمەت ب تەكەم وئەگەر تو تێدا ب سەرنەكەفتى، خودێ هاريكارێ تە بيت !

وەزير: ئەگەر ئەز ب سەرنەكەفتم، سەرێ من ژ سەر لەشێ من بفڕينە.

مەليك: پرسيارا ئێكێ ئەڤەيە، دێ چەوا ستوينێن حوكمێ خوە جێگركەم ؟ كو چ مەترسى گەفا لێ نەكەن.

وەزير: مەترسى گەلەكن و د هەمەجورن، لێ جورێ ژ هەميا خرابتر ئەوە كو هاوولاتى شێلمشرينيێ و دەڤحوليكرنێ و درەوێ و حيلەلێكرنێ نەكەت، بێژتە كورەى تويێ كورەيى و بێژتە كەڕى تو يێ كەڕى.

مەليكى گۆتە وەزيرێ خوە: ئەڤە بەرسڤەكا سەير بوو، من هزر ژێ نە دكر.

وەزير گرنژى وگۆتە مەليكى: سوپاسييا خودێ دكەم كو ئەز دئەزمونا سەميانێ خوەدا ب سەركەفتم.

مەليكى ب پێترانكيڤە گۆتێ: ئەز وەسا هزردكەم كو تە دڤێت پێشنيازكەى، هەركەسێ باش و راستيبێژ و نە حيلەكەر زيندانكەم.

وەزير: نە..نە، نابيت ئەز ڤێ پێشنيازێ بوجەنابێ وە پێشنيازكەم.

مەلیك : بوچی ؟

وەزیر: چونکو بجهـ ئینانا ڤیٚ پیٚشنیارێ پیٚدڤی ب ئاڤاکرنا گەلەك زیندانان هەیە وئاڤاکرنا زیندانان پیٚدڤی ب مالی هەیە و ئەڤ مالە ژی دێ ژ گەنجینا سەمیانێ من دەرکەڤیت.

مەلیك: باشە پا تو چ پیٚشنیاز دکەی ؟

وەزیر: دێ پیٚشنیارەکێ کەم یا گرچن وئالۆزە، لێ بجهـ ئینان یا ب ساناهییە و ئەنجام دمسوگەرن وئارمانجا مە دڤیٚت بجهـ دئینیت.

مەلیك: تو شیای سەرنجا من راکیٚشی، دێ بیٚژە و پیٚشنیازێ بو من شرۆڤەکە.

وەزیر: ئەزبەنی هەر جهەکێ گرنگبیت کە سیٚن بیٚ قیمەت و نەزان و منافق دانێ.

مەلیکی ب دلتەنگیڤە گۆتێ: ئەڤە چ پیٚشنیازا سەخیف و بیٚ قیمەتە ؟ تە دڤیٚت میرگەها من ب هەلوەشینی.

وەزیری ب شەهنازی و باوەریڤە لێ ڤەگەراند: پیٚشنیازا من نەیا خرابکارو ویٚرانکەرو بیٚ قیمەتە. ژبلی پاراستنا حوکمیٚ تە ..چ ئارمانجیٚن دی بو نینن، ئەڤ پیٚشنیارە بتنێ دشیٚت مەترسییا کەسیٚن رەسەن و زانا نەهیٚلیت، ئەویٚن منافق وبیٚ قیمەت ئەگەر لسەر کورسیکیٚن پایە بلند روونشتن، دێ سەرەدەرییێ دگەل ئەویٚن وەکو خوە بتنێ کەن، کەس چ پویتەی پیٚ ناکەت ژبلی ئەویٚن ژوان خرابتر دمەیدانا دەست ماچیکرنێ و گوهداریێدا، لڤیٚرە مروڤێ زانا و رەسەن دێ خوە بتنێ بینیت و کەسەك حەز ژێ ناکەت، ئەفجا یان دڤیٚت سەرێ خوە بو ئەویٚن بیٚ قیمەت بچەمینیت و وەکی وان بیت یان ب رەڤیت و بچیتە دویلکێ دونیاییٚ، یان ژی دڤیٚت ب بیٚدەنگی و بەرە بەرە.. ژلایەنیٚن لەشی ومەعنەویڤە ب هەلوەشییٚت، یان ژی دڤیٚت خوە بکوژیت، دهەمی حالەتاندا سەمیانێ من یێ مەلیك یێ تەناو سەرکەفتییە، چ مەترسی گەفا ل حوکمێ وی ناکەن.

مەلیکی بو دەمەکێ نە یێ کورت هزریٚن خوەکرن و پاشی گۆتە وەزیرێ خوە: پیٚشنیازا تە یا هشك و رەق و تەحلە، لێ یا هەژییە وجهێ رەزامەندییا مەیە. دێ کار بوکەم کو ئیٚکسەر ب بجهـ بهیٚت.

کەیفا وەزیری هات، لێ کەیفا وی ژبلی دوو دەقیقەیان دۆم نەکر، دەمێ مەلیك ب دەنگەکێ پر هەیبەت ئاخفتی وگۆتییە وەزیرێ خوە کو ژنهو پاشڤە دێ ژ وەزیرییێ هیٚتە ئیٚخستن.

وەزیر بەهتی وگۆتە مەلیکی: ما من چ گوننەهـ کرییە هەتا کو ڤی سزاییٚ نە دادپەروەر بدەیە بەر من.

مەلیکی گۆت: ئەز تە سزا نادەم، لێ ئەز دێ پێشنیارا تە ب جھ ئینم، مادەم تە ئەڤ پێشنیارا ژیرمەندو دروست بو من گۆت کو من ژمەترسیێ دپارێزیت و پاراستنا حوکمێ من دکەت، ئەڤە گروڤێ هندێیە کو تو نەیێ بێ قیمەت و نەزانی، ژبەر هندێ تو هێژای چ  پایەیێن بلند نینی.

دەمێ وەزیری بەرسڤا مەلیکی بهیستی، پر ب دلخۆشی و ژدل کەنی، کەنیەکا نە یا چێکری وڤالا ژ کەنیا ژڤەستا، مەلیك ژڤێ رەفتارا وی سەرسورمایی ما و ژێ پرسیارکر: تو هوسا ب دلخۆشی دکەنی، چونکو من تو ژ وەزیریێ ئێخستی !.

وەزیری گۆت: ما بوچی ئەز ژدل ناکەنم ؟ تو دێ پێشنیارا من بجھ ئینی و هەر کەسەکێ رەسەن و زانا دێ پشت گوھ هاڤێی، ژبەر هندێ زڤرینا من بو پلەیا وەزیریێ یا مسوگەرە، دبیت پلەیەکا دی یا گرنگتر ژی بدەیە من کو خەلك حەسیدیێ بمن ببەن. ئەگەر ئەز نە یێ بێ قیمەت بم، ساخلەتێن من یێن دی دێ من کێشنە هندەك پلەیێن دی ێین ژ وەزیریێ گرنگتر.

مەلیکی پرسیارکر: ئەو ساخلەتێن تە یێن دی چنە ؟.

وەزیرێ دەرئێخستی بەرسڤ نەدا . لێ هەر دکەنی چونکو یێ ب باوەر و ئێمن بوو کو ئەوێ بێ قیمەت و غەدرەکار و پویچ ژی خودێ یەکێ هەی چاڤێ خوە ددەتێ و چ دڤێت بو دکەت.

## شرۆڤەکرن

مەلیکی گۆتە وەزیرێ خوە: دوهی ب شەڤ من خەونەکا سەیر یا دیتی، نەوەکو خەونانە.
وەزیری گۆت: خەونێن مەلیکان، مەلیکێن خەونانە.

مەلیکی گۆت: هەردەمێ بیرا من ل وێ خەونێ دهێت، ئەز نزانم چەوا شرۆڤەکەم کو پێ قاییل ببم.

وەزیری گۆت: باشترین شرۆڤەکارێن خەونان ل وەلاتی، دبەرهەڤن بهێنە خزمەتا سەمیانێ من.

مەلیکی گۆت: من نەڤێت گوهدارییا شرۆڤەکارێن خەونان بکەم، ئەز حەز ژ سەروچاڤێن وانژی ناکەم، بیرا من ل گویین و قەلەرەشکا دهینن.

وەزیر: داکو سەمیانێ مەیێ رازی بیت، بەری چەند هەیڤەکا مە یاسایەك دەرئێخست بوو، کو نابیت گویین و قەلەرەشك بهێتە دعەردێ میرگەها مەدا.

مەلیك: ئەز دێ خەونا خوە بوتە بێژم و دڤێت تو بو من  شرۆڤەکەی.

وەزیر: ئەڤە شەرەفەکە من خەون ژی پێڤە نە ددیتن کو بو من بهێت، خو ئەگەر هزار سالان ژی دخزمەتا سەمیانیٚ خوە دابم.

مەلیك: هەروەکو تە دڤێت هزار سالان لسەر کورسیکا وەزیریێ بی.

وەزیر: پلەداری نەیا گرنگە. یا گرنگ ئەوە کو من دەرفەت هەبیت ب بەردەوامی خزمەتا سەمیانیٚ خوە بکەم.

مەلیك: هش بە و گوهدە من، کا دیٚ چ بوتە ڤەگێرم.

وەزیر: ئەز هەمی گوهێن ب شەووق و گوهدارم.

مەلیك: من ددیت خەلك بیٚ دەستووری دهاتنە دناڤ باخچەییٚ مندا.

وەزیر: دیٚ نهو هەمیا گرین.

مەلیك: هێرش کرنە هەمی دارێن ناڤ باغیٚ من و هەمی بەرهەم خوارن، دەمیٚ بەریٚ داران تەڤاڤکرین، بەلگێن داران خوارن و دەمیٚ بەلگێن داران ژی تەڤاڤکرین، هێرش کرنە قورمێن داران کو بخۆن.

وەزیر: ئەڤە گروڤەکیٚ نوویە ددەتە خویاکرن کو خەلك هندەك گیانەوەرن هەر ژلاندکیٚ هەتا بن گوڕی هەر دخۆن و تێر نابن.

مەلیك: من فەرمان ددا زێرەڤان و سەربازێن خوە کو دەربێخن، لیٚ کەسیٚ گوهداری نە دکر.

وەزیر: وەی لەعنەت لسەر بن.

مەلیك: ببوونە هندەك پتێن بەری.

وەزیر: ببوونە پت، ژبەر پەشێمانی و ترسا ژ سەمیانیٚ خوە.

مەلیك: ژن و کەنیزەك و زاڕۆکێن منژی هەمی ببوونە پت.

وەزیر: ئەڤە پیلانەکا مەزنە لسەر پاشەرۆژا مللەتی و وەلاتیٚ مە.

مەلیك: ژنشکەکێڤە خەلکی ئاگەه ژ رۆژیٚ بوو، هێرش کرنیٚ و خوارن، هەروەکو ئێکیٚ برسی پرتەقالەکیٚ دخوت.

وەزیر: سەیرە، ما لێڤێن وان نە سوتن ؟

مەلیك: هەمی تشت خوارن، شویرهێن تەلارا منژی خوارن، سەربان و دیوارێن ژووران خوارن، دەرگەه و پەنجەرە خوارن، پەردە و کەفچك و سێنیك خوارن، مەحفیر خوارن، تەلارا من ما ڤە عەردەکیٚ رویت، ژبلی من چ تێڤە نە ما، چوار دەوری مندان و لدور من جغزەکا گرتی چێکرن، ددانێن وان دقیچ بوون

هەروەكو دەڤێ خەنجەران، جغز بەرە بەرە بچویك دبوو، ل وی دەمی ژ خەو هشیار بووم و ژ كرێتترین مرن قورتالبووم.

وەزیر: ئەركێ مللەتییە، هەفت و رۆژ و هەفت شەڤان ئاهەنگا ب گێرن چونكو مەلیكێ وان قورتالبوو.

مەلیك: شرۆڤەكرنا تە بو ڤێ خەونا سەیر چییە ؟

وەزیر: دلێ سەمیانێ من یێ مەزنە و دلوڤانە و مشتی ڤیانا خەلكییە، چونكو هەردەم دترسیت مللەتێ وی برسی ببیت، لەوا ئەو خەون یا دیتی.

مەلیك: ئەرێ تە ئەڤ شرۆڤەكرنا چڤێل بو ڤێ خەونا پر ترس دیت ؟!

وەزیر: سەمیانێ من ژ هەمی ئاقلمەندا ئاقلترە، هەردەمێ من ڤیای ژبەرسڤێ ب رەڤم ئەز نە شیایمە، ئەگەر ئەمانەتێ بدەتە من، دێ جرعەت كەم ل دویڤ دیتنا خوە شرۆڤەكرنەكا دروست پێشكێشكەم.

مەلیك: ئەمان بو تە .. باخڤە.

وەزیر: خەلك یێ عێجزە، چونكو تو دەرفەتێ نادەیێ ئەڤینی یا خوە بو مەلیكێ خوە دەربرن، ئەو نە دچەوتن، مافێ وانە دەرفەت بو هەبیت كو باجێن زێدەتر بدەن، باج بتنێ دەبرینێ ژ دلینی و ئەڤینی یا وان دكەت.

رۆژا پاشتر خەلكی پێ زانی كو باج زێدەتر لێ هاتن و برسا وان ژی زێدەتر لێ هات، ددانێن وان دبەرهەڤ بوون بەرهنگارییا تشتێن ژكەڤری رەقتر ژی بكەن.

## كەسكە سوور

مەلیكی گۆتە وەزیرێ خوە: ئەز ژ ئاخفتنێن ژیرمەندان بێزار بووم، د چێكری وكرێتن، ئەز پێدڤی هندەك ئاخفتنێن ژ جورەكێ دیمە، د سەیرو سەرنجراكێش بن، بلا خوە ئاخفتنا دینا ژی بیت.

وەزیرێ گۆت: ئاخفتنا ژیرمەندان یا نەزان و قەرفییە. وەكو مرنێیە، ئەو شەهنازی بو دینا بەسە، كو چ دین دوروییاتیێ نزانن.

مەلیكی ب سەرسومایڤە گۆت: تو ڤێ دژی ژیرمەندان دبێژی و مەدحێن دینا دكەی، ما تو یێ دینی یان ژیرمەندی ؟

وەزیری گۆت: ئەز تێكهەلەمە ژ ژیرمەندی و دیناتیێ، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ئەوە كو بابێ من ژیرمەند بوو، دایكا من یا دین بوو، هەروەسا باپیرێ من یێ دین بوو، داپیرا من ژیرمەند بوو.

مەلیكی گۆتە وەزیرێ خوە: مفایێ رۆژێ چییە ؟

وەزیری گۆت: ئەگەر رۆژ نەبا، چ سنوور دناڤبەرا شەڤ و رۆژاندا نە دبوو، ئوخەلكی نە دزانی كا دێ كەنگی بەرەڤ كارێ خوە كەنە غار.

مەلیكی گۆت: مفایێ بارانێ چییە ؟

وەزیر: ئەگەر باران نەبا چێكەرێن سیهوانا دا ژ برسا مرن، وەلات ژی دا ژ پیشەسازییا سیهوانان بێ بەهر بیت. ئەو پیشەسازییا وەلاتێ مە شەهنازیێ پێ دكەت دناڤ وەلاتێن دونیائێیدا.

مەلیك: مفایێ داران چییە ؟

وەزیر: هەر دارەك سیهوانەكە، خەلكێ هەژار ل زڤستان و هاڤینان بكار دهینن، بێیێ چ بهایەكی بدەنێ.

مەلیك: مفایێ نانی چییە ؟

وەزیر: نانی گەلەك مفا یێن هەین ناهێنە هژمارتن.

مەلیك: بو من بەحسی وان مفایێن نە هێنە هژمارتن بكە.

وەزیری ب درێژی بەحسی رۆلێ برسێ دچێكرنا هەڤوەلاتی یێن گوهداردا كر. بو مەلیكی سەربازەكێ نە نیاس ژ سەربازێن وی دیار بوو كو ب ئەختوباری خزمەتا وی دكەت و هێشتا چ رێزگرتنێن هێژای وی بو نە هاتینە گرتن.

مەلیك ل هەسپەكێ رەش یێ سوار بوو، ژنشكەكێڤە هەسپی مەلیك ژ سەر پشتا خوە هاڤێتە خوار، مەلیكی ب هەواركی گازی دكر.

وەزیری گۆت: ئەڤە چییە ؟

وەزیری گۆتە ڤە: دێ ل پشت هچكا گەریێبن، هەلبەت دێ ب سەر ڤێ نهێنیێ هەلبن. ئێكسەر هەسپێ رەش دەستەسەركر و كێشا بەر تویژاندنێ، تویژاندن ب دانپێدانا هەسپی ب دوماهی هات ، بێیێ چ كوتەكی لێ بهێتەكرن، دا بوو خویاكرن كو هندەك دوژمنێن مەلیكی و یێن مللەتی ئەو یێ پالدای كو وێ كریارێ بكەت. هەسپ هاتە سزادان و هەمی هەڤركێن مەلیكی ژی هاتنە سزادان.

مەلیكی گۆتە وەزیرێ خوە: ل پاشەرۆژێ دێ زانست پێشكەڤیت و زانا دێ هندەك تشتان چێكەن كو كەسەك باوەرنەكەت.

وەزیری گۆت: ل پاشە رۆژێ، زانا دێ بەرچاڤكا چێكەن..

مەلیكی ئاخفتنا وی بڕی و ب پێترانكیڤە ژێ پرسیاركر: ما تە نەزانییە كو بەری سەدان سالان وان بەرچاڤك یێن چێكرین.

وەزیری لێ ڤەگەراند: دێ هندەك بەرچاڤکێن جودا چێکەن، دەمێ مروڤ ددانتە بەرچاڤێن خوە، دێ هزرێن سەراو هەستێن دلان بینیت .

مەلیکی گۆت: خوەزی نهو ئەڤە پەیدا ببا..

وەزیری گۆت: هەروەسا زانا دێ هندەك کەسان چێکەن، نە دخون ونە دنڤن و نە گازندا دکەن و داخوازا چ مافان ناکەن.

دەمێ مەلیکی ئەڤ گوتنە بهیستی ب گەرمی و پر سەرسورماییڤە گۆت: ئەللاه..ئەللاه.. ئەڤ داهێنانە چەند یا جوانە ! مادێ بوچی خوە ل هیڤیا پاشەرۆژێ گرین ! بێژە زانایێن من ئەز نەشێم چاڤەرێ بم، من سەبر نەمایە.

وەزیری گۆت: دێ حەزێن تە یێن هێژا بو وان ڤەگوهێزم، هەروەسا دێ ژێ داخوازکەم کو دەمێ خەلك دهێتە قوتان نە کەنە ڤێژی چونکو ڤێژی بو گوها نە دباشن، هەروەسا بو خودانێن هەستێن نازك ژی نە دباشن.

مەلیکی گۆت: ئەگەر زانا دڤێ ئافراندنێدا سەرکەفتن، هەر ئێکی دێ دیاریەکا ژ هەژی دەمێ.

وەزیری ب گازندەڤە گۆتێ: سەمیانێ من یێ دادپەروەر، پا بەهرا وەزیرێ تە یێ خزمەتکارو ب ئەختوبار..؟

مەلیکی گوت: یێ ئێمن بە، دیاریا تە بتنێ دێ تەمەت دیاریا هەمیا بیت.

وەزیر ب کەیفخوشی گرنژی، دێ سامانەکێ بچویك لسەر سامانەکێ مەزن زێدە بیت، چونکو مەلیك نزانیت کو ئەوا ئەو ژ زانایان داخواز دکەت، ئەڤە ژمێژە هاتییە ئافراندن و بەری چەندین سالان یا هاتییە بەرهەڤکرن. هەڤوەلاتی یێن مەلیکی خەلکەکە نە دخون و نە دنڤن و نە گازندا دکەن و داخوازا چ مافان ژی ناکەن.

## ژن و زەلام

مەلیکی و وەزیرێ خوە جلکێن هەژاران کرنە بەر خوە و هەر ژ ئەلندا سپێدێ هەتا رۆژ ئاڤا بوی ل کولان وجاددەیان دگەریان، ب مایتێکرن ل رەوشا خەلکی دنێرین. دەمێ مەلیك وەستیای زڤریڤە تەلارا خوە و وەزیرێ وی ژی ب دویف ڤە دکرە غار. پشتی مەلیکی بێهنا خوە ڤەدای ژ وەزیرێ خوە پرسیارکر: ئەرێ ل دەمێ گەریانا مە، ئەوا من دیتی تە ژی ددیت؟.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەوا چاڤێ مەلیکی دشێت ببینیت. دشیانا وەزیریدا نینە ببینیت، خو ئەگەر دەه چاڤ ژی هەبن.

مەلیکی گۆت: من نە دیت کەسەك بکەنیت یان ژی بگرنژیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: خودێ رۆژا داین هەر ژبو کارکرنێ داینە، نەیا جوانە عەبد نەگوهدارییا دانەری بکەت و دەمێ کارکرنێ هەمیێ ب یاری و تراناڤە ببەت.

مەلیکی گۆت: باشە پا کەنگی ئەڤ خەلکە دکەنن یان ژی دگرنژن.

وەزیری لێ ڤەگەراند: چ پێدڤی بوکەنی و گرنژینا وان نینە، کەنیێ و گرنژینێ رەنجەك پێ دڤێت، باشترە ئەڤ رەنجە دخزمەتا وەلاتی و مەلیکیدا بهێتە مەزاختن.

مەلیکی گۆت: خو زارۆك ژی ،زارۆکەك بتنێ من نە دیت ب گرنژیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەڤ دەمە..دەمێ ئەزمونێن خواندنگەهانە.

مەلیکی گۆت: تشتێ سەیر ئەو بوو، من چ ژنك درێکێدا نە دیتن، من زەلام و زارۆك بتنێ ددیتن . پا کا ژنك؟

وەزیری لێ ڤەگەراند: ما ژنك بتنێ دێ لسەر جاددا چ کەن ؟ خودێ ژنك یا دای کو دمالڤە بژیت، جلکا بشۆت، مالێ پاقژکەت، خوارنێ ب لێنیت، زارۆکان بخودانکەت و چاڤەرێ بیت کا دێ کەنگی مێرێ وێ ژکاری زڤریت، داکەیفا وی بینیت. دەمێ سەمیانێ مە چ ژنك لسەر جاددێ نە دیتین ئەڤە گروڤێ هندێیە کو بهایێن رەسەن دپاراستینە و جڤاکێ مە یێ پاقژە، ئەڤە پەرگالەکە هەر وەفادارەك حەز دکەت کو یێ بەردەوام بیت و بمینیت. لێ، یێ بەردەوام نابیت، دێ زەمانەکێ پیس بسەر مەدا هێت و ژنك دێ نە گوهدار بن، دێ ژمال دەرکەڤن ، ئو.. دێ جلکێن وەکو یێن زەلامان کەنە بەر خوە و دێ وەکو زەلامان کارکەن، دێ هندەك مافان ژ زەلامان پتر وەرگرن.

مەلیکی گۆت: تو یێ چەوتی .. ئەوا ل ئایندەی دقەومیت، ژبلی دانەرێ دونیایێ بتنێ کەسێ دی نزانیت، چ مروڤ ژی پشکدارییا وی دڤێ زانینێدا ناکەن.

وەزیری گۆت: ئەوێ کوفرێ ب ڤەگوهێزیت نە کافرە، ئەڤا ئەز دبێژم بتنێ ئەوە یا من دهندەك کتێبێن کەڤندا خواندی، ئەو کتێبێن باشترین زانایان دانایین.

مەلیك گرنژی و گۆتێ: بو من بێژە تە چ ژ پێشبینی یێن پاشەرۆژێ خواندییە ؟

وەزیری لێ ڤەگەراند: ل پاشەرۆژێ دێ مەلیکەکێ تبعەت سەیر دەرکەڤیت، حەز ژ گوشتێ بەرخا و مریشکا وماسیا ناکەت، لێ حەز ژگوشتێ ژنکا دکەت. هەر رۆژ دێ ژنکەکێ مارەکەت و دێ ب شیڤێ خۆت، لێ رۆژکێ دێ ژنکەکێ مارەکەت کو حەز ژ گوشتێ زەلامان دکەت، ئەڤجا دێ مەلیکی خۆت، بەری مەلیك وێ ب خۆت.

مەلیکی گۆت: ئەڤە مەلیکەکێ ساویلکەیە، ئەگەر مەلیکەکێ ب دورستی با، دا هزرا خوە دڤی بویەرێ ژنشکاڤە کەت و دا ددانێن هەمی ژنکا ب فەرمانەکێ هەلکێشیت.

وەزیری ب سەرسورماییڤە گۆتێ: ئەڤە ئاخفتنەکا دیرۆکییە، هەر مەلیکەکێ رژد بیت لسەر مانا عەرشێ خوە وکەیفخوەشیا مللەتێ خوە، دڤێت ددانێن مللەتی ب هەلکێشیت و ئەو بتنێ بمینیت خودان ددان.

مەلیك کەنی، ددانێن وی وەکو کێلبێن هێرشکرنا گەردەنا دیارکرن، پاشی گۆتە وەزیرێ خوە: ئێ..چ دی دێ ل پاشەرۆژێ قەومیت.

وەزیری گۆت: ئەز هیڤی دکەم ئەوا ئەز دبێژم درەو بیت، پێشبینی یا ئێکی بوو، دگۆت: پشتی هزار سالێن دی دێ کارەساتەکا تەڤایی ل وەلاتێ مە پەیدا بیت وچ بیاڤێن ژیانێ ژ زەرەرا وێ قورتال نابن. ئەڤ وەلاتێ مە یێ پێشکەفتی، دێ بیتە خرابترین وەلات.

مەلیکی گۆت: ئەو چ کارەساتە ؟

وەزیری گۆت: ئەزبەنی، تو دزانی کو پیشەسازییا رستن وچنینێ ب ناڤودەنگترین پیشەسازییا وەلاتێ مەیە، ل پاشەرۆژێ، دێ هەمی کارکەرێن ڤێ پیشەسازیێ برسی بن و دێ هەمی کارخانە ژ کارکەڤن و بەرهەم نابیت. بازار دێ مشتی کوتالێ بێخێر بیت وکەس نابیت کو ب کڕیت.

مەلیکی گۆت: ئەڤ پێشبینی یە نە یا راستە، خەلك هەردەم یێ پێدڤێ جلکایە. جلك ژی ژقوماشی دهێنە چێکرن وقوماش بەرهەمێ کارخانا رستن وچنینێیە.

وەزیری گۆت: ئەوا دێ قەومیت ئەوە، ئەو ژنکێن ژ هەمی خەلکی پتر جلکا خەرج دکەن، دێ جورەکێ جلکا کەنە بەرخوە ل شوینا میترێن قوماشی بتنێ دێ یهوست بن.

مەلیکی گۆت: تە گوت کارەسات دێ یا تەڤایی بیت، کارخانا رستن وچنینێ بتنێ پشکەکە. لێ نە هەمییە.

وەزیری گۆت: ئەوا دقەومیت ئەوە، دەمێ ژنك دەردکەڤنە سەر جاددەیان ب وان جلکێن کورت و هەتکبەر. ئاقلێ زەلامان دێ ژ سەری فڕیت و دێ کارێن خوە هێلن، ئێدی بتنێ بەرێ وان دێ ل ژنکا بیت و هەروەکو گورك ب دویف بەرخیڤە، دێ وەسا ب دویف ژنکا کەڤن.

مەلیکی پیچەکێ هزرێن خوەکرن و پاشی گۆتە وەزیرێ خوە: ئەوا ل پاشەرۆژەکا دویر دقەومیت، دوور نینە ل پاشەرۆژکا نێزیك ژی ب قەومیت ئەم ب چاڤێن خوە ببینن، کەسێ ژیرمەند دڤێت یێ هشیار بیت و هەر ژ نهو خوە بپارێزیت. مەلیکی فەرماندا، مالێن وەکو زیندانان هاتنە ئاڤاکرن وجبەیێن رەش هاتنە چێکرن و لسەر خەلکی هاتنە بەلاڤەکرن، ب بەهانەیا هندێ کو ئەڤە رێکا بەهشتێیە.

## خێزان

مەلیك ل باخچەیێ تەلارا خوە بوو، وەزیرێ وی ژی ل نێزیکی وی یێ رونشتی بوو. مەلیکی هێڤ دکرە گیایێ کەسك ئەوێ دتەییسی و هێڤ دکرە دارا وگولێن رەنگاو رەنگ سەحکرە ئاسمانی .. یێ شین بوو. هەورەکێ سپییێ بچووك لێ دبوری، دلێ وی مشنی ئەڤینییا هەمی تشتێن لسەر عەردی بوو، ب کویری هێڤ کرە وەزیرێ خوە و پاشی ب دەنگەکێ دلپێڤە مایيڤە گۆتێ: وەستییانەکا زێدە یا لتە دیار بوی، ئەڤە چەندین سالن تە چ بێهنڤەدان نە وەرگرتینە.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەگەر وەستییان ژبو خزمەتکرنا مللەتی بیت، نە وەستییانە، یاگرنگئەوە وژدان نە وەستێیت.

مەلیکی گۆت: کارکەر ب رۆژێ کار دکەت و ب شەڤێ بێهنا خوە ڤەددەت، لێ تو ب شەڤ و رۆژ کاردکەی.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەز ب شەڤێ یێ هشیار بم، بو من باشترە کو رۆژا حیسابێ خودێ کێماسییەکا - ژ بێی من ژ من دەرکەفت بیت - دگەل من بکەت.

مەلیك بێ دەنگچو دهزرادا، ژنشکەکێڤە گۆتە وەزیرێ خوە: تو دزانی ئەز هزرا چ دکەم ؟!

وەزیری لێ ڤەگەراند: خودێ بتنێ دزانیت کا چ دسینگو سەرێ خەلکیدا یە.

مەلیکی گۆت: ئەز یێ هزرا رێکخستنەکا نوی ددەولەتێدا دکەم کو هندەك رەحەتی بو تە تێدا هەبیت.

بو هەر جورەکارەکی دێ وەزیرەکی دانم و هەمی وەزیر دێ لبن سەر پەرشتییا تە بن.

وەزیری نە ژ دل گۆتێ: یا گرنگئەوە ئەم د هە لبژارتنا کەسانێن وەفادار و شارەزادا دسەرکەفتی بین ، چ ژهندێ ب زەحمەتتر نینە کو کەسەکێ هەژی بهێتە دیتن داکو لسەر کورسیکەکا هەژی ب روینیت.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەکێ دەرڤەکاریێ یێ زیرەك دڤێت. نوینەرێ من بیت بو دەولەتێن جیهانێ، بگەریێت و پێکهاتنا بکەت و پێزانینان لسەر دوژمنێن من یێن ژ دەرڤە کومکەت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەڤە جهەکە هەژی کورێ من یێ ئێکێیە، هەروەکو یێ بوی کو ژیانا خوە ژ وەلاتەکی بو ئێکێ دی ب گەریانێڤە بیەت.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەکێ فێرکرنێ دڤێت، هەر کاربکەت، هەرکاربکەت هەتا کو نەزانەکێ بتنێ ژی ل وەلاتی نەهێلیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: فێرکرن کارەکێ هێژایە، لێ قەدەرا ماموستایان ئەوە کو هەردەم ژیانا وان یا نە خۆش بیت، ئەگەر یێ هەژار نەبیت دێ یێ حەسید بیت وحەسیدی دبیتە ئەگەرێ بێزاری و شەپرزەیی و هەلوەشیانێ. یا ژمنڤە باشترین کەس بوڤی جهی .. مێرێ خالەتا منە، گەلەك حەز ژ فێرکرنێ دکەت، زارۆکان لدورخوە خرڤە دکەت و وانەیێن خوە ددەتە دیواران.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەك بو چاندنێ دڤێت، کو وەلاتی بکەتە باخچە و بیستان و زەڤی یێن کەسك.

وەزیری لێ ڤەگەراند: پسمامێ من هاتە بیرا من، دەستێ وی یێ پیرۆزە، ئەگەر دەستێ خوە بکەتە هەر تاکەکێ هشك ئێکسەر دێ کەسك بیت و دێ وەرارێ کەت و دێ مەزن بیت.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەك بو دارایێ دڤێت، یێ ئەمین و باربەر و دەسپاك بیت.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ڤێ وەزارتێ کەسەك بو نینە ژبلی کورێ من یێ شەشێ، هەر رۆژ دەه جارکی دەستێن خوە ب سابینێ و ئاڤا گەرم دشوت.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەك بو رەوشەنبیریێ دڤێت.

وەزیرێ گۆت: من برایەکێ ژ خوە بچویکتر یێ هەی، چ کاران ناکەت و زولە ئەگەر بێ کار بمینیت، یا ژمنڤە وەزارتا رەوشەنبیریێ ژملێن وی دخۆت، نەمازە گەلەك پویتەی ددەتە بارێ هزری و رەوشەنبیری، چ گوڤارێن هونەری ژێ نابورن ئەگەر هەمیێ نەخوینیت و بابەتێن وێ ژبەر نەکەت.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەك دڤێت ژبو راگەهاندنێ.

وەزیری لێ ڤەگەراند: ئەو داپیرکا زارۆکێن مە ژ تارستانا زکی دەرێخستینە روناهییا دونیایێ، باشترێن وەزیرا راگەهاندنێیە ددونیایێدا، ئەگەر ل سپێدێ گۆتنەك بو بهێتە گۆتن، پشتی چەند دەمژمێرەکا دێ ل هەمی دونیایێ بەلاڤە بیت.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەك بو ساخلەمیێ دڤێت، پویته ب ساخلەمییا خەلکی بکەت وخەستەخانا ئاڤاکەت و خواندنگەهان بو دختورێن بسپور ب دامەزرینیت هەتاکو وەلێ بێت دیتنا نەساخەکی کارەکێ ب زەحمەت بیت.

وەزیری گۆت: تە وەزیرەکا ژن دڤێت یان ژی ئێکێ زەلام، ئەڤ کارە هەژی ژنکانە، هەرچەندە ئەز دژی کارکرنا ژنکێمە ژ دەرڤەی مالێ، لێ هەبوونا ژنکەکا وەزیر دوەلاتێ مەدا دێ بیتە ئەگەرێ هندێ کو خەلکێ ژدەرڤە ، ب چاڤەکێ باش هێڤکەنە مە ، ئوکچا من هەژی ڤی کارییە چونکو دژیانا خوەدا ژبلی جلکێن سپی چ جلکێن دی نە کرینە بەرخوە .

مەلیکی گۆت : من وەزیرەك بو پولیسان دڤێت کو دوست و دوژمنێن من ژێك جوداکەت .

وەزیری لێ ڤەگەراند: پشتی هەر وەزیرەك ب ئەرکێن خوە رادبیت ، دێ کارێن من کێمتر ڤەبن وئەز پێشنیار دکەم کو سەرەرای سەروکاتییا من بو ئەنجومەنێ وەزیران ئەڤ وەزارەتە ژی بو من بیت ، دوژمنێن سە میانێ من، بەری بریارا دوژمنکارییێ بدەن ئەزوان ناهێلم .

مەلیکی گۆت : من وەزیرەکێ هێژا بو لەشکەرێ خوە دڤێت .

وەزیری گۆت : مەلیکێن هێزدار و مەزن وێ دکەن یاکەس چ هزرا بو نەکەت ، ژنشکەکێڤە دبینن و پێ ئالوز دبن ، هەمی میرگەه و وەلاتێن دونیایێ پەهلەوانێن ب ناڤودەنگ دهەلبژێرن ژ بو سەرکردایەتییا لەشکەری ، ئەگەر مەژی وەکو خەلکێ دی کر ، ئەم چ تشتێ نوی ناکەین کو جهێ رێزگرتنا دیرۆکێ بیت . ئەزبەنی ئەگەر تە بڤێت هەرایەکا راگەهاندنێ ل جیهانێ پەیداکەی ، ئەز پێشنیاز دکەم  وەزیرێ تە یێ ترسنوك و بێ بها بیت کو نەوێریت ل تارییێ دەرکەڤیت ئەگەر دەستێ وی ددەستێ دایکا ویدا نەبیت ، لێ  ئەگەر تە وەزیرەك بڤێت کو دوژمن ژێ بترسن ، ئەز پێشنیاز دکەم کو ئێکێ کارێ وی گور کولان بیت ب هەلبژێری ، دێ دوژمن ژێ ترسن و دێ زانن کا دێ چ ل هیڤیا وان بیت ئەگەر جرعەتکەن هەڤرکیێ دمەیدانا شەرێدا بکەن .

مەلیکی گۆت : من وەزیرەك بو سنجێن باش دڤێت .

وەزیری گۆت : سوپاس بو خودێ ، وەلاتێ مە مشتی مروڤێن خودان سنجێن باشە ، خودانێن سنجێن خراب ژی یان یێن مرین یان ژی یێ دزینداناندڤە ل هیڤیا مرنێ .

مەلیکی گۆت : من وەزیرەك دڤێت یێ ئیستیرادێ بیت .

وەزیری گۆت : کەسێ وەکو کورمەتێ من شارەزایی دئیستیرادێدا نینە ، ئەم دێ ژنکێن جوان ژ هەمی جیهانێ ئیستیرادکەین ، نە ژبو خوەشیێ وشەهوەتێ. بەلکو ژبو باشکرنا ڕڤشتی ، ئەڤ رڤشتێ بێت ، دێ مللەتەك بیت ژ هەمی مللەتێن جیهانێ دێ جوانترو هێژاتر بیت .

مەلیکی گۆت : من وەزیرەکێ ئابوریێ دڤێت .

وەزیری گۆت :برایێ ژنا من بازرگانەکێ دێرینە ، هێشترا دفروشیت و بوخەلکی وەسا ددەتە خویاکرن کو پایسکلێن زارۆکانە.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەك ژبو شعرێ دڤێت، داکو هەلبەستڤانان پێگیرکەت دەربرینێ ژ ئازارێن خەلکی بکەت.

وەزیری گۆت: ئەزبەنی ئەز دێ جرعەتێ دەمە خوە و دێ بێژم کو ئەز بو ڤێ چەندێ نە دگەل تە دامە، خەلکی لسەر دەمێ تە بتنێ خوشی یێن هەین و چ ئازار نینن، دهەمی ژیانا واندا ژبلی سەرئێشیێ چ ئازارێن دی نینن.

مەلیکی گۆت: من وەزیرەك بو بیابانێ دڤێت، دێ ناڤێ وی کەمە وەزیرێ بیابانێ، دێ ئەرکێ وی ل بیابانێ چێکرنا رێکێن نوی بیت، ئەگەر بیابان ژ رێکان تژی بوو، دێ هندەك باژێرێن نوی ل وەلاتی زێدە بن، لێ فەرە لسەر وی وەزیری کو دگەل پالادا ل بیابانێ بژیت، ئەگەر پالا سار ببیت وی ژی سار ببیت و ئەگەر پالا گەرم ببیت وی ژی گەرم ببیت، دبیت نەساخ ببیت و دویر نینە بمریت ژی، لێ وەکو شەهیدێ ئەرکێ خوە دێ مریت.

وەزیری گۆت: ئەم دێ خەلکی ئاگەهدار کەین کو دێ بەریکانێیەکا ب شەرت هێتەکرن و هەرچیێ خودان شیان بیت ، وەزارەت بو وی پیرۆز بیت .

مەلیکی گۆت : دەمێ ئەڤ وەزیرە دەست ب کارێ خوە دکەن ، هینگی دێ تە دەلیڤە هەبیت ، بێهنا خوە ڤەدەی .

وەزیری لێ ڤەگەراند : لێ مە پێدڤی یا ب وەزیرەکی هەی بو رۆژێ ، خەلك ب شەڤێ مالێن خوە ب روناهییا کارەبێ روهن دکەن ، ل داوییا هەیڤێ ژی حەقێ کارەبێ ددەن ، ئەڤجا بوچی بێ پارە و ب هەروەیی دبینن ؟

چ وەزارەت نەهاتنە دانان ، لێ باج وەرگرێن دلرەق ل هەمی گوندو باژێران بەلاڤ بوون ، پارێ روناهییا رۆژێ ژخەلکی داخواز دکرن .

## نڤستن

چاڤێ مەلیکی دنقاندی بوون، لسەر تەختەکێ ژ زێر وحەریری کەفتبوو دنڤستنەکا کویردا. لێ دهەمان وەختدا یێ پشت چەمیایی و خەموکی و بوغومی بوو، ب پێخواسی لسەر خیزێ دەریایەکا پێل تەنا یێ راوەستیای بوو، تامەزرویێ دیتنا وی کەسی بوو، ئەوێ نانیاسیت و هەر لێ دگەرێیت. ژنشکەکێڤە ژنکەکا گەنج ژ ئاڤا دەریایێ دەرکەفت و ژێ نێزیك بوو، ب دەنگەکێ وەك یێ فەرمانان ژێ پرسیارکر: توکیی؟ مەلیکی بوماوەیەکێ درێژ ب هویری لێنێری، وەسا هاتە بەرچاڤا کو یا دروناهییا هەیڤێ وەربوی. خۆش، سێری، جوان،کو چ جاران بەری نهو جوانییا هوسا نەدیتیە، دڤیا ژێ پرسیارکەت کا ماسییە یان ژی ژنکە، لێ دەمێ ئاخفتی .. ترتری بوو، دبەرسڤا پرسیارا وێدا گۆت: ئەز.ئەز.ئەز. هەر وەکو پیرە ژنەك دگەل زارۆکەکی دئاخڤیت، ژنکی گۆتێ: توکیی وکارێ تە چییە ؟

مەلیکی گۆت: ئەز مەلیکم.

ژنك کەنی و لێ ڤەگەراند: ئەڤە کارەکێ سەیرە، ل وەلاتێ مە نینە.

مەلیکی گۆتێ: وەلاتێ تە ل کیڤە یە ؟

ژنکێ ب دەستێ راستێ ئیشارەت کرە دەریایێ وگۆتێ: وێهە وەلاتێ منە ل (بنی ) دەستێ وی گرت و برە دناڤ دەریایێدا، ل دویفچوو. دیت خەماوی نەما و لجهێ وێ بو خوشی و ئێمناهی، وەسا هزرکر کو دەستێ ژنکێ ئەوێ ددەستێ ویدا نە ژ گوشتییە. بەلکو سترانەکە بەحسی زارۆکێن دلخۆش دکەت .. ئەوێن یاریا لسەر زەڤیێن کەسك دکەن. دەمێ پێن وی گەهشتینە بنی دەریایێ، باژێرەکێ رەونەقدار دیت، روناهییەکا شین ژێ دپەشی، لسەر جاددەیێن وی باژێری گەریا و ل هەر دوولایێن جاددێ خانی و دکانێن شویشەی بوون، چ کەس نەدیتن، ب مایتێکرنەکا سەرسوماییڤە گۆتە ژنکێ: پا کانێ خەلك ؟

ژنکێ لێ ڤەگەراند: ماسی برسی بوون و هەمی خەلك خوارن، ئەز بتنێ یا ڤورتال بویم. هەردوو دەستێن خوە دانانە سەر ملێن وی و ب دەنگەکێ نەرم گۆتێ، ئالوز نەبە و خەما نەخوە، ژیان وەکو بەرێ دێ زڤریت، دێ شوی ب تەکەم و دێ مە گەلەك زارۆك هەبن، زارۆکێن مەژی دێ ب ژن کەڤن و دێ زارۆك بن، زارۆکێن وان ژی دێ ب ژن کەڤن ودێ زارۆك بن...جارەکا دی خەما وی ب گرانی لێ زڤری و گۆتە ژنکێ: من ئەڤینداری و زارۆك نەڤێن.

ژنکێ ب سەرسورماییڤە لێ ڤەگەراند: ئەرێ راستە ، تە ژنك و زارۆك نەڤێن؟!

مەلیکی گۆت : من ژنك دڤێن .ئو گۆتەڤە : من زارۆك ژی دڤێن.

جارەکا دی گۆت: لێ ئەز حەز ژ چ ژنکا ناکەم و من نەڤێت ببمە باب. من گەلەك ژن یێن هەین .. من نەڤێن وچ جاران ژی ئەز حەز ژێ ناکەم.

ژنکێ ب غەیدینڤە گۆتێ: ئەگەر تو گوهدارییا من نەکەی، دێ پەشێمان بی.

مەلیکی گۆتێ: ئها نهو دێ تە هێلم ودێ وەك مەلیك زڤرمەڤە وەلاتێ خوە، بێ دلبەر و بێ زارۆك.

ژنك تێکچوو، دەملدەست و ژنشکەکێڤە بو ماسییەکا هندی بەلەمەکا مەزن و بەرەڤ ویڤە هات وداعویرا، مەلیکی خوە زیندانکری دیت دناڤ تاریستانا زکێ ماسیێدا، یێ دئاڤەکا گەلەك نیسەکدا دگەڤزیت، ڤێژییەکا پر ب ترس راهێلا و روییێ وی ژ روندکان تەر بوو.

ل وی دەمی. ژخەو هشیار بوو، لەشێ وی هەمی ببوو خوە و بێهنا وی ژ ترسادا چك ببوو، گۆتە خوە "شەرم بکە وئارام بە، تو مەلیکی، خەلکی دترسینی و نا ترسی، نهو تو یێ دتەلارا خوەڤە، ئەوا ب سەربازێن چەکدار دورپێچکری، ئەگەر ژێ داخوازکەی دبەرهەڤن مرنێ بخوە ژی بکوژن، ئەڤجا چەوا ژبەر خەونەکێ ژ ترسادا درەجفی".

چاڤێن خوە دانانە سەرێك، هەولدا جارەکا دی بنڤیتەڤە، لێ ترسەکا ڤەشارتی دکویراتییا ویدا مابوو، نەهێلا بنڤیت، تەختێ خوە هێلا و ل بەرامبەر خودیکەکا درێژ راوەستاو هێڤ دکرێ.. زەلامەکێ مل خویل دیت، یێ سیس و زەرپەتخی، چاڤێن وی دسەریدا دلڤین، ب دەنگەکێ تنگژی و هشك فەرماندا کو بلەز وەزیرێ وی بەرهەڤکەن. پشتی چەند خولەکەکا، وەزیر ب غار هاتە دژوورا مەلیکیڤە، مەلیکی ژی پرسیارکر: نهو چ دەمە ؟

وەزیری ب حێبەتیڤە گۆت: ئەز نەشێم ب دروستی بەرسڤێ بدەم، چونکو هێشتا دەمژمێر نەهاتینە چێکرن، لێ ئەز هزر دکەم کو ئەلند هێژ یا دویرە.

مەلیك لسەر کورسیکەکێ روینشت و تبلا خوە یا شەهدێ کرە ددەڤێ خوەدا .. دگەل هزرکرنێ لەق لێ ددان، پاشی ژنشکەکێڤە گۆتە وەزیرێ خوە: بومن تشتەکی بێژە بێهنا من پێ بهێت وخەم وکولا ژ من دویر بێخیت.

وەزیری گۆت: هەمی دەما ئەز بویمە .. من شەرفا ب جهـ ئینانا فەرمانێن سەمیانێ خوە هەی، لێ نهو ئەز یێ هزر بەلاڤم و یێ شەپرزەمە، ئەز نەشێم چ بێژم کو گێول پێ خوش ببیت.

مەلکی گۆت: تە چییە ؟ ما تو یێ نڤستی بوی و تە خەونەکا نەخۆش دیتیە ؟

وەزیرێ گۆت: ئەڤ شەڤە ئەز نە نڤستیمە، من شەڤا خوە هەمی ب تویژاندنێڤە دگەل کەسەکێ گرنگیا بوراندی. مە گرت بوو، پاشی بومە دیار بوو کو ژلایێ دوژمنەکێ ژدەرڤە- یێ سەمیانێ من - هاتبوو هنارتن.

مەلیکی گۆت: ئەوان دڤێت من بکوژن ؟

وەزیری لێ ڤەگەراند : پیلانا وان پیسترە، ژسەرڤە بێگونەهە و ژبنڤە خرابییەکا زۆرە، پیلانا وان ژی ئەوە کو گۆتنێن لسەر سێکسی ب رێکێن سەرنجراکێش بەلاڤکەن .. داکو زەلام خوە دژنکا وەرکەن و ژنك خوە دزەلامان وەرکەن، زارۆك بوون زێدە ببیت . هژمارا خەلکێ وەلاتی ژی دێ زێدە بیت و دەولەت نەشێت خوارنێ وجهی بو دابینکەت، هینگی دێ دوژمن زێدە بن و دێ رژێما حوکمی ئێخن.

مەلیك کەنی وگۆتە وەزیرێ خوە: ئەڤ پیلانە یا پویچە، وی زەلامێ بێگونەھ نهو بەردە.

وەزیری ب نە رازیبون لێ ڤەگەراند: ئەزبەنی، لێ ئەوی یا دانپێدای کو خۆفرۆشێ دۆژمنانە.

مەلیکی گۆت: خوە ب ئاقل بێخە و ئاقلێ خوە بدە کاری، ئەگەر کارێ دوژمنێ من یێ دژی من دخزمەتا مندا بیت، دێ بوچی رێ ل کارێ وی گرم.

وەزیری گۆت: ئەز دانپێددەم کو مەژیێ من یێ ڤالنجبوی و نەشێت چ هزرا بکەت.

مەلیکی گۆت: ئەگەر هژمارا خەلکی زێدە بوو، دێ هژمارا سەربازێن منژی زێدە بیت و دێ هژمارا پولیسێن من یێن نهێنی و یێن نە نهێنی ژی زێدە بیت و دێ هژمارا زێرەڤانێن من زێدە بیت و هەروەسا دێ هژمارا وان برسی یێن هەمی تشتێن خوە ب چارێکا بهای و بێ بازار دفروشن دێ زێدە بیت .. ئو هوسا دێ بینی کو دەولەتا من دێ ب هێزتر کەڤیت ل شوینا لاواز بوونێ ئەو زەلام هاتە بەردان ب مەرجەکی کو ب چالاکی کار بکەت ژبو ب جھ ئینانا وێ ئارمانجا دوژمنێن مەلیکی بو دانای.

## وەلاتەکێ بێ ئەدیب

مەلیك گەلەك یێ غەیدی بوو، گەلەك هەول ددا کو کەربا خوە ڤەشێریت .. لێ چاڤێن وی نە دهێلا، چاڤێن وی مشتی رژدی و هشکاتی بوون. ب دەنگەکێ گەلەك هەولدای کو یێ سروشتی بیت گۆتە وەزیرێ خوە: ئەرێ تو یێ مجدی کو هەمی بویەرێن ل میرگەهێ دقەومن، تو دگەهینییە من ؟..

وەزیری لێ ڤەگەراند : هەتا لێککەفتنێن ژن ومێرا و عاشقا ودەنگوباسێن بەردانێ و ئەگەرێن وان ژی ئەز بوتە ڤەدگوهێزم.

مەلیکی گۆت: تو تشتێن بێ بها بومن ڤەدگوهێزی و یێن گرنگو ترسناك لمن ڤەدشێری.

وەزیری لێ ڤەگەراند : ئەگەر سەمیانێ من ئەمرکربا کو ئەز هەتا هەمە دزیندانێڤە بم بومن دلوڤانترە ژچارە نڤیسێ من یێ نهو.

مەلیکی گۆت: ئەڤرو سپێدێ ژنەکا من گۆت کو هۆزانڤانەکی دهۆزانەکا خوەدا یا هاڤێتییە من و خەلك دشەڤبوهێرکێن خوەدا ڤەدگێرن و پێ دکەنن، ئەرێ ئەڤە راستە یان ژی درەوە.

وەزیری گۆت: ئەو هۆزانڤانێ بێ ئول نهو یێ دزیندانێڤە دکەتە گازی وکەس دتانا وی ناچیت، ئو ژ زیندانێ دەرناکەفیت هەتاکو وێ هۆزانا خوە یا چڤێل ب هۆزانەکا دییا پەسندارییێ نەگوهوریت.

مەلیکی گۆت: ئانکو ئەڤ سوحبەتە راستە.

وەزیری سەرێ خوە و هەمی لەشێ خوە چەماند وگۆتێ: بەلێ راستە.

مەلیکی گۆت: پا تە بوچی ئەز بێ ئاگەهدار نە دکرم.

وەزیری لێ ڤەگەراند : چونکو شێوازێ من یێ کاری ئەوە کو ئەز ژبلی بویەرێن مەزن چ بویەرێن دی بو سەمیانێ خوە نەڤەگوهێزم و ب تشتێن بێ بهاڤە مژویل نەکەم.

مەلیکی گۆت: هوسا ناچیتە سەری، ئەوێن دهاڤێنە مە، مالێ مە دڤێت، دا دەڤێ خوە بگرن، ئەگەر مە نە دایێ دێ هەر هاڤێنە مە و دێ خرابتر لێ هێن، ئەوێن مەدحێن مە ژی دکەن، وانژی بەرامبەری وان مەدحان مالێ مە دڤێت، ئەگەر مە نەدایێ دێ ب دژی مە راوەستن. دێ هۆزانێن خوە یێن مەدحکرنێ ب هندەکێن دی یێن دژی مە گوهورن و دهەمی حالەتاندا زیان هەر ب مە دکەڤیت.

مەلیك بێدەنگبوو، چوو دهزرەکا کویردا و پاشی گۆتە وەزیرێ خوە: ماسیگر ماسییا درووباری و دەریایێدا دگرن، ما وان چ پێدڤی ب هۆزانان هەیە.

وەزیری لێ ڤەگەراند : ماسیگر پویتە ب چ ناکەن ژبلی نانی و گوشتی و ژنکا.

مەلیکی گۆت: ئو.. جوتیار عەردێ خوە دکێلن وتۆڤچینیێ دکەن و ئاڤ ددەن و سەخبێرییێ لێ دکەن، ما وان چ پێدڤی ب هۆزانان هەیە.

وەزیری لێ ڤەگەراند : چاڤێن وان هەردەم ب عەورانڤەنە، چ تشت ژبلی نەهاتنا بارانێ وان ئالۆز ناکەت.

مەلیکی گۆت: پالە خانیا و تەلاران ئاڤا دکەن و جاددە و رێکان راست دکەن، ما وان چ پێدڤی ب هۆزانان هەیە !

وەزیری لێ ڤەگەراند : هەمی خەما پالا ئەوە کرییا وان زێدە ببیت و رۆژ ب زویترین دەم ئاڤا ببیت.

مەلیکی گۆت:  بازرگان .. کرین وفروتنێ دکەن، چ پێدڤی ب هۆزانان هەیە ؟
وەزیری لێ ڤەگەراند : ئەز بازرگانان هەروەکو بالیفکا خوە دنیاسم، مادەم دکرن و دفرۆشن وقازانج دکەن، چ ژێ کێم نینە.

مەلیکی ب پویتەپێکرن پرسیارکر: ما دەم کەسێ چ پێدڤی ب هۆزانێ نینە، ما بوچی یاسایەکێ دەرنائێخین کو هۆزان ڤەهاندن یا قەدەغە بیت.

وەزیر گرنژی وگۆتە مەلیکی: دێ سەمیانێ من دەستووریێ دەتە من باخڤم.

مەلیکی گۆت: باخڤە ما کێ دەڤێ تە گرتییە.

ئەگەر بریارەکا هوسا دەرچوو، چ مفایێ خوە نابیت، چونکو هۆزان وەکو نەساخییەکا بێ دەرمانە، ئەوێ پێ نەساخ دبیت نەشێت ژێ ساخ ببیت و دڤێت هەر هۆزانان بێژیت.

هۆزانڤان وەکو قەلەرەشکێیە . قەلەرەشك یێن چێبوین دا دبەرخواندنێرا سەرێ خوە بهەژینن، هۆزانڤان ژی یێن چێبوین دا هۆزانان بێژن، ئەڤ بریارە بتنێ دێ ئەوێن بێ بها ترسینیت و دێ پێگریێ پێ کەن، لێ ئەوێن دی چ تشت نەشێت وان ژ نڤیسینا هۆزانان ڤەکەت، هەروەسا ژ نەباشی یێن ڤێ بریارێ ئەون کو دێ گۆتگۆتکێن  غەرەزدار و پرکێن لدور وەلاتێ مە هێنە ئازارندن ودێ بێژن کو دژی هۆزانێ و ئەدەبی و هزرکرنێ و ئازادیێنە، دوژمنێن مە .. دێ ڤێ بریارێ کەنە دەرفەت کو سمعەتا ڤێ میرگەهێ دناڤ هەمی میرگەهاندا کێمکەن.

مەلیکی گۆت: کەواتە ئەم دێ ناسناما هەڤوەلاتینیێ ژ هۆزانڤانان وەرگرین و دێ وان ژ وەلاتی دەرئێخین.

وەزیری گۆت: ئەم وان بتنێ دەرنائێخین، دێ هەمی خودان خامەیان دەرئێخین، نڤیسەرێن چیرۆکێ و یێن رۆمانێ و یێن شانوویێ و رەخنەگران ژی دێ دەرئێخین، دڤێت چاڤدێرییەکا تایبەت بدەینە دەرێخستنا رەخنەگران، چونکو ئەگەر رەخنەگر ژ رەخنەیا ئەدەبی هاتنە بێ بەهرکرن دێ رەخنەیا جڤاکی کەن و پاشی ئەڤ رەخنەیا جڤاکی دێ بیتە رەخنە یا رامیاری..

مەلیکی گۆت: هەر کەسەکێ خامەیەکی  راکەت و پەیڤەکێ بنڤسیت دێ دەرئێخین.

وەزیری لێ ڤەگەراند : ما دێ بوچیێ دەرئێخین ؟ ئەگەر مە دەرئێخستن دێ ژلاییێ مەعنەویڤە فایدەکەین و ژلایەنێ ماددیڤە چ مفا ناگەهتە مە.

مەلیکی گۆت: ئەز نزانم دێ چەوا ژلایەنێ ماددیڤە مفای ژێ بینین و ئەو بخوە خرابترین وچڤێلترین خازۆکن.

وەزیری لێ ڤەگەراند : هندەك وەلاتێن ساویلکە و نەزان هەنە ، حەز ژڤان توخمان دکەن و هەردەم ئامادەییا خوە دیار دکەن کو پێشوازییا وان بکەن، ئەم ژی بەرامبەری بهایەکێ نە یێ کێم دێ بو وان هنێرین.

مەلیکی ب سەرسومایی و دلخۆشیڤە گۆتێ: هەر ژ دەمێ ئەز ژ دایك بویم و هەتا نهو ئەڤە مەزنترین پێشنیازا پراکتیکییە گوهێن من بهیستین. پێشنیازا وەزیری بجه هات و وەلات ما بێ ئەدیب، لێ چ تشت نە هاتە گوهورین ژبلی هندێ کو گیا ل بهارێ سیس و بەهتی شین بوو، ئو رەنگێ خوەیێ کەسك ژ دەستدا.

*

# دوژمن

### 1. دەسپێك

پولیسی فیتکەك لێدا، تیرۆژکێن رۆژا سپێدێ هەلاتن، جاددەیێن باژێری ب رۆناهییەکا زەر مینا سێپێکەکا پیر رۆهنکر، ل وی دەمی مرۆڤ ب پەشێمانی و ئەنی گرێ. ژخەو هشیار بوون.

### 2. ئاسمانێ بەرزە

دوو چویچکان دادا سەر تاکێ دارەکێ ژوان دارێن لسەر لێڤا جاددەکێ، هەر دووا ب هەلاتنا رۆژا سپێدێ نە ستراند، لێ ب شەپرزەیی و پر ب چریسەت ل هەڤ دنێرین، ئێکێ گۆتە یا دی: دێ کیڤە فرین؟

ئاسمانێ مە ، فرۆکەیان یێ داگیرکری. ژبلی ئاسمانێ قەفەسکان، مە چ نەمایە. ئەم دێ پەرێن خوە بەرزەکەین. ئەم دێ ستراندنێ ژبیرکەین. هەردوو چویچکان ماوەرکرن فرۆکەیەکا رەش، بلەز ل ئاسمانی

دفرِی، ب چریسەت ل هەڤ نێرین، باژێر مینا دەڤەکێ ددان تیژ لێ دهات. دانێ کوژەك خوارن، هەر دوو چویچك ب مریانی کەفتنە سەر لێڤا جاددەیا چیمەنتویێ.

## 3. ئێخسیر

دوو کالە پیر لسەر لێڤا جاددێ ب هێواشی دچوون و ب خەموکی دپەیڤین.

- ئەڤ زەمانە، زەمانێ دوماهییێ یە.
- پەرگالێ مە ژ خرابییێ بەرەف خرابترە.
- دەم یێ هاتی داخوازنامە بهێتە نڤێسین.
- داخوازناما چ ؟ !
- ئەو داخوازناما پێدڤییە بو خودێ مەزن بهێتە بلندکرن.
- ئەم دێ چ دوێ داخوازنامێدا نڤیسین.

دێ نڤیسین، ئەم ئەڤێن مە ئیمزاکری، داخوازێ ژ خودانێ دونیایێ دکەین کو لەشکەرەکێ چەکدار ب نـویترین چـەك بومـە بهنێریـت و بهێنـە سـەرتوخیبێ وەلاتـی و شـەرێ دوژمنـان بکـەت و سـەرەدرەییا ئێخسیرا دگەل مە نەکەت.

- ئەگەر داخوازا مە بجھ نەهات، ئەم دێ چ کەین ؟
- ئەم دێ داخوازنامەکا دی بو بلند کەین و دێ ژێ داخوازکەین کو مە ژ هەر پێنج نڤێژان عەفوکەت.
- ئەگەر رازی نەبوو.
- نە خیر دێ قاییل بیت، هەروەسا دێ مە ژ رۆژییان ژی عەفو کەت .. خودێ یێ میهرەبان ودلوڤانە.

## 4. تۆلە

هندەك زارۆك ل گورەپانا خواندنگەهێ خرڤە ببوون، ب گەرمی یاریەکا نوی دکرن.

- ئەز تەرەزانم.
- ئەز عەنتەرم.
- ئەز ملیونێرم.
- ئەز داهێنەرێ قومبەلە یا ئەتومیمە.
- ئەز پولیسم.
- ئەز داهێنەرێ فرۆکانم.

هەمی زارۆك ب داهێنەرێ فرۆكان وەرهاتن و ب شەق و پێن و كۆلمان لێ دادان، وی ژی دكرە قێژی و هەوار كو ئێك وی ژ لەپێن وان رزگاركەت.

### 5. زەلام

( سوپاسی ژبو خودێ كو ئەم داین زەلام، ل دەمێن تەنگاڤیێ وەكو بابێ بەرێ بو پێشدا دكەینە غار، ئەم قورتال دبین وناكەڤین. سوپاسی ژبو خودێ كو نە داین ژنك. دمالڤە د روونشتی بومبایێن دوژمنان مە ب سوژن هەروەكو گورە ێین كەڤن. سوپاسی ژبو خودێ ئەوێ ژبلی وی كەس دی نە ).

### 6. مەترسی

ژخێفزانكەكی هاتە پرسیاركرن، دێ پاشەرۆژ یا چەوا بیت، بێی دوودلی گۆت: "مەزن دێ تێچن، زارۆك دێ تێچن، پشیك وبالندە وگول دێ تێچن، خانی وكتێب وئالا دێ هێنە سوتن، كورسیكێن خواندنێ و وێنەیێن یادگاران دێ بەرزە بن، ناپالم دێ گرنژینێ و ئەزمانێ عەرەبیێ وسومبلان ژبن هاڤێت، خەستەخانە دێ هەرفن، كارگەهـ دێ هەرفن، باخچە دێ هەرفن، ژنك بێ عەبا دێ لسەر جاددەیان پیاسا كەن ".

دەمێ ئەڤ غەیبە دپەرتوكەكێدا ب درێژی هاتییە بەلاڤكرن، هەموو وەلاتپارێزان بەرهەلستییا خوە بو چارەنڤیسێ ژنكێ دەربری و داخوازكر ب مال و ب گیان قوربانیێ بدەن ژبو رێگرتنا ڤێ مەترسیا دهێت.

### 7. بەهەشت

ئەو زەلامێن دا نڤێژێ كەن، ب چریسەت هێڤ دكرنە مەلایێ مزگەفتێ، زەلامەكی ب دەنگەكێ نزم پرسیار ژ مەلای كر: ئەرێ مەلا، فروكە ل بەهەشتێ هەنە ؟..مەلای لێ ڤەگەراند:چ فرۆكە ل بەهەشتێ نینن.

بێهنا زەلامان هات، ب دلخۆشی گوتن: سوپاس بو خودێ.

### 8. گۆتار

"ب خودێ بێدەنگییا مە لسەر دوژمنی . نە ژبەر لاوازیێ بوو، لێ ژبەر كوباری و مەزناهی وجوانمێری و باوەری بخوە هەبوونێ بوو.گۆتن مە نەفتا وە دڤێت، مە گۆت نەفتا مە ببەن، ئەم نەڤییێن حاتەمێ

تەینە،گۆتن شەڕەکێ بەربەرلاڤ دگەل هزرێن نووهاتی بکەن، مە گۆت ئەم خودانێن هات و باتێینە، مە سێپێك دانان ومە زیندان ئاڤاکرن. وان ڤیان باژێرەکی داگیرکەن، مە چەندین باژێرکرنە ددەستاندا، داکو بو وان ئاشکراکەین کو ئەم چ پویتە پێ ناکەین، ئەگەر وان فڕۆکە و بومبا هەنە، مە سنجێ راست و بنەمایێن ئاسمانی هەنە، چەند جوداهییەکا مەزنە دناڤبەرا هەییێ مە و هەییێ واندا، ئەم ب هێزترین . چونکو ئەم ب راستیێ و روحێ دچەکدارین، نە ب ماددەیێ چوننە و چەوتییا کەفتی".

## 9. نیشانا قورتالکەری

ئەزمانێ عەرەبی ب بلندترین نیشان هاتە خەلاتکرن ژبو پشکدارییا وی د ڤەگەڕاندنا شکەستنەکا لەشکەری بو سەرکەفتنێ، ناڤێ شەڕی کرە خۆڤەکێشان و ناڤێ خۆڤەکێشانێ کرە بەرگری و ناڤێ بەرگریێ کرە پەهلەوانی و ناڤێ پەهلەوانیێ کرە سەرکەفتن. ئەم لسەر دوژمنان ب سەرکەفتین ..
هەروەسا دێ لسەر تابوریێ پێنجێ ژی ب سەرکەڤین، ئەو تابوریێ شیانێن شەڕی یێن زمانێ عەرەبیێ پشت گوه دهاڤێت.

## 10. بوچی ؟

قوتابی ژ ماموستایێ خوە پرسی: جوداهی دناڤبەرا مرۆڤی وئاژەلیدا چییە ؟
ماموستای دبەرسڤێدا گۆت: ئاژەل نا ئاخڤیت، لێ مرۆڤ دئاخڤیت.
ماموستا راست دبێژیت، ئەم کارمەندێن رادیۆ و تێلەفزیون و رۆژنامەگەریێ باشترین پەیڤکەرین، لەوا پر ژدل سوپاسییا دانەرێ عەرد و عەسمانا دکەین کو ئەزمان دایە مە، مفایێن ئاخفتنێ زۆرن، ناهێنە هژمارتن، دەمێ مە شەڕێ دۆژمنی دکر، پەیڤێن مە رۆلەکێ گرنگ هەبوو، ب مێرانی بەرهنگارییا دۆژمنا دبوون، فڕۆکێن وان ئێخستن، دەبابەیێن وان سوتن و لەشکەرێ وان تارومارکر، لێ بوچی ئەوا بویی بوو؟!
هەر چەندە پەیڤێن مە مینا پەهلەوانان بەرەڤانی دکر، لێ دسەر هندێ را ژی هەر ئەم شکەستین.

## 11. نەهێلانا هەژاران

هێژا سلێمان قاسم برسی بوو، هەمی ئەو رۆژنامێن پەسن و باشییا سیستەمێ رژێمێ ژبو نەهێلانا هەژاریێ بەحس دکر خوارن، پشتی ژ خوارنا رۆژنامان تێر بوی، سوپاسییا خودێکر و باوەرەییەکا موکم ب ئاخفتنێن رۆژنامان ئینا.

## 12. بەرنامەکێ رادیوییێ

بێژەر: برا ناڤێ تە چییە ؟

گەنج: عبد المنعم الچلبی.

بێژەر: تە ژن ئینایە ؟

گەنج: نەخێر ئەز زگوردم.

بێژەر: کارێ تە چییە ؟

گەنج: ئەز بێکارم.

بێژەر: بوچی تو شول ناکەی ؟ ئەرێ تویێ زەنگینی یان تە گێولێ کاری نینە ؟

گەنج: ئەز نەیێ زەنگینم، ئو من گێولێ کاری ژی هەیە. ئەڤە چەندین سالن ئەز یێ بخۆل کارەکی دگەریێم.

بێژەر: ئومێدا تە چییە ؟

گەنج: نهو ئەز بمرم.

بێژەر: گوهدارێن خوشتڤی، بێگومانە کو برادەرێ هێژا عبد المنعم الچلبی وەلاتپارێزەکێ ب ئەختوبارە، هەروەکو هوین دبینن مرادا وی داخوازا مرنێیە. چونکو پشکداریێ دئاڤاکرناجڤاکێ مەیێ پێشکەفتیدا ناکەت.

## 13. زارۆک

زارۆکەکێ بچووك ژ دایکا خوە پرسی: مفاییێ هەردوو چاڤان چییە؟

ناڤجاڤێن دایکێ بونە گرێ و ب ترس و هایڤە بەرسڤا وی دا و گۆتێ: چاڤێن هاتینە چێکرن داکو ب ئەڤینی و رێزگرتن هێڤ کەنە وێنە یێن سەرکێشێن وەلاتی.

زارۆکی گۆت: ئوگوهـ ؟

ترسا دایکێ پتر لێهات وگۆتێ : داکو گوهدارییا فەرمانێن فەرمی و گوتارێن رامیاری بکەن.

زارۆکی گۆت: ئو ئەزمان ؟

دایکێ گۆت: ئەزمانی چ مفا نینن ژبلی هاریکارییا داعویرانا خوارنێ پشتی ب ددانا دهێته ڤەجوین و هویرکرن.

گرنژینەکا مژدار لسەر لێڤێن زارۆکی هاتە نەخشاندن، لێ دایك دناڤ ترسەکا کوژەکدا ڤە دلەرزی.

## 14. پە هلەوان

بێژەرا تێلەفزیونێ: سەیدا خالدێ کورێ وەلیدی، ئەگەر روخسەت بیت،کا چەوا تو بویە پەهلەوانەکێ ب ناڤودەنگ بو بینەرا شرۆڤەکە.

خالدێ کورێ وەلیدی: ئەز ب هاریکارییا خوێیا تەندروسی بومە پەهلەوانەکێ ب ناڤودەنگ هەر رۆژ سپێدێ دووکەڤچکێن خوێیا ئەندروسی دا کەمە دناڤ پەرداغەکێ ئاڤێدا و دا ڤەخوم، خوێیا ئەندروسی هەروەکو هەمی درانن کو مێلاکێ چالاك دکەت و رویڤیکا پاقژ دکەت و لەشی ب هێز دئێخیت و مەژی تێژتر لێ دکەت و دڤەژینتەڤە.

## 15. ئەڤینی

هێژایێ پولیس، تە چەوا بڤێت وەسا لێ بگەرە، ژنا من نە چاپخانەیە بەلاڤوکێن رامیاری یێن روخێنەر چاپ کەت، کەنییا وێ نە پیلانەکا ئیستعمارێیە ونەشێی لێکدەیەڤە . چونکو رەخنەیەکا راستەوخویا دژی سیستەمێ رژێمانە. ب تایبەتی بەری ئەز حەز ژێبکەم، من ژێ پرسی بوو کا رەئیا وێ لسەر رژێما دەستەلاتدارا نهو یا ڤی وەلاتی چییە ؟ هەر دەملدەست بەرسڤ دا بوو، گەلەك حەز ژێ دکەت، پاشی من دەرفەت دا بوو دلێ خوە کو ڤێ هاوولاتییا پێگەهشتی ب حەبینیت. ئودەمێ بو جارا ئێکێ من ماچیکری، ئەم هەر دوو ژخوشیادا ڤە دلەرزین، هەروەکو مە د پێڤاژوکەکا شورەشگێریدا دەست دقوتان.

هێژایێ پولیس : ماتشتەك ژڤێ دلسوزییا مە زێدەتر هەیە بو وەلاتی ؟

## 16. گونە هباری

ئەز هەڤوەلاتییەکێ هەژارم وەکو هەمی هەڤوەلاتی یێن دی یێن هەژار.. جلکێن من وەکو جلکێن وانە، ئاشکێ من وەك یێ وانە، ئەز ژی وەکو وان دترسم، لێ دەمێ دەولەتێ شەرەفا کارکرنێ دگارگەهەکا خوەدا دایە من .. بهایێ ڤێ دەسکەفتیێ من نە درانی، هەیامەك پێڤە چوو . من داخوازکر کو موچەیێ من زێدە ببیت و هەمی فەرمانێن فەرمی یێن ئابورکرنێ و پێدڤییاتییا مالی ژبو شەرێ دوژمنان من

پشت گوه هاڤێتن، من نه دزانی کا دێ چەند زیان ب وەلاتی کەڤیت ئەگەر داخوازا من بجه بێت، چونکو ئەگەر موچەیێ من زێده ببا، دا پارێ دەولەتێ کێم بیت و ئەگەر پارێ دەولەتێ کێم بیت، ئەو پارێ دهێته مەزاختن ژبو کرینا ویسکی وجلکێن ژنکا و ترومبێلێن نوی و بێلایێن بلند ژی دێ کێم بیت. ئەڤجا ئەگەر ویسکی کێم بوو، ژنك سل بوون، ترومبێل کەڤن بێن و بێلایێن بلند ببنه خانی یێن بچویك، بێگومانه کو دلخۆشیا بەرپرسان ژ هەردوو لایەنێن دیرۆکی و بابەتیڤه دەربارەی وەلاتی دێ کێمتر لێ هێت. ئو ئەگەر دلخۆشییا بەرپرسان کێم ببیت، دێ وورەیا وان دابەزیت و ئێدی گێولێ وان یێ خۆش نابیت، ئەڤجا هەمی گوتار و بەیاننامە و گوتنێن وان ژی دێ دسار بن و دۆژمن ژێ ناترسن.. ژبەر ڤێ هەمیێ . دەمێ من داخوازا زێدەکرنا موچەیێ خوەکری، دخزمەتا دوژمنان دا بوو، ئومن پشکداری یا دسەرکەفتنا وان یا دەروونیدا کری. لەوا فەرە ب نه خوشترین سزا، ئەز بهێمە سزدان.

**<u>تێبینی</u>: ئەڤ هشیارییا ژنشکەکێڤه بو من پەیدا بوی، چ هەڤبەندی دگەل دەستەسەرکرنا من و برنا من بو بنگەهێ پولیسان نینە، چونکو ل وێرێ چ پرسیار ژمن نه هاتنه کرن ژبلی پێشنیازێن من ژبو پێشڤەبرنا بەرهەمی ).**

## 17. سەمیانێ هەمی تشتان

پولیسی هەردوو ئەنیشکێن خوه دانانه سەر شویرها رووباری و ب دەنگەکێ زڤر گازی کرێ:

- ئەی رووبار.

+ کییه گازی من دکەت ؟

- ئەزم گازی ته دکەم.

+ تو کیی ؟

- ئەز پولیسم.

ئاڤا رویباری لەرزی، لێ پولیس پێڤه چوو، ئوگۆتێ: ئەگەر ته بڤێت نه هێیه دەرئێخستن و هەمی عەمرێ خوه ل خەریبییا نه بورینی، پێدڤییه ب نڤیسین مۆربکەی، کوچ جاران تو مایێ خوه دسیاسەتێ ناکەی.

+ لێ ئەڤ وەلاته .. وەلاتێ منه.

پولیسی ب گەف گۆتێ: ما ته دڤێت بهێیه زیندانکرن؟

رووباری فەرمانا پولیسی بجه ئینا و دا زانین کو رێزگرتن وتاعەتا سەمیانێ هەمی تشتان بکەت.

## 18. ژپێخەمەت وەلاتەکی دلێ رێڤینگان خۆش بکەت

بو هەر کەسێ شولە ژێ: ئەم گیاندارێن مرۆڤ.. ئەوێن پیستر ژ پیسیێ و ئەوێن ل کولانێن تەنگو تاری دژین.. داخواز دکەین:

1. رێ بدەنە مە کو رویس برێڤە بچین، داکو ئابوریێ دپارێ جلکادا بکەین و هەروەسا دا تێرۆژك و با ل لەشێن مە بدەن.

2. هەمی خەستەخانێن فەرمی ب هەروەیی ئاشکێ مە ژێڤەکەن، ئەو ئاشکێن ژیانا مە تێکددەت، بیێ هیچ بەهانەیەکا وەلاتپارێزی.

3. سەرێن مە ژێڤەکەن، نەمازە پشتی ب گرۆڤ هاتییە خویاکرن کو چاڤێن دیتنێ و گوهێن بهیستنێ وئەزمانێ ئاخفتنێ و مەژییێ هزرکرنێ و مەژییێ نەهزرکرنێ مروڤی خائین دکەن.

## 19. زنجیرێن مرییان

دبێژن زەلامەکی ژنکەك دڤیا، لێ ژنکێ شوی پێ نە دکر، ب سەرسورمایی ژێ پرسیاکر: تو بوچی شوی ب من ناکەی؟ ل وی دەمێ – هەروەك تو دبێژی – کو تە گەلەك ئەز دڤێم ؟.

ژنکێ گۆتێ: من تو دڤێی، لێ بنەمالا وە ژ بابکالکێن کەڤن ڤە مری یێن خوە نا ڤەشێرن، ئەڤجا چەوا تە دڤێت دگەل تە دژوورەکا مشتی جەندەکڤە بژیم.

زەلامی بێهنەکێ هزرێن خوەکرن و پاشی گۆتێ: تو راست دبێژی، مرییان گورستنانێن هەین، نە مالێن گیانداران. دەسپێکر، کورکەکا کویر کولا داکو تەرمێن بابکالێن خوە تێدا ڤەشێریت، لێ .. پێژنێن بابکالك و دوژمنان ب زنجیران گرێدا و دوێ کورکا کویر یا ئەوی کولایدا ڤە شارتن.

ژنك نەگرییا، لێ شیرێ دلدارێ خو ئینا دەرو بێی بێزاری ما ل ژڤانێ وی، داکو شەرێ بابکالك و دوژمنان بکەت.

## 20. رۆژو هە یڤ

ترسنوکێ ساخ باشترە ژ وێرەکێ مری، دەستێن ب هێز ماچی بکە و ددلدا بێژە بشکێ، ئەگەر تە داخوازەك ژ سەیەکی هەبیت بێژێ: ئەزبەنی، گوهدارێ ئێکێ بە و نەگوهدارێ دوماهیێ، ئەوێ نەگوهدار چ رەئی نینن و ئەگەر ئاخفتن زێرە، قایل بوون گەنجینەکا بێ دوماهییە، ئەوێ حەسید چ

جاران بخوه خۆش نابیت، یێ راست به هەروەکو فەرمان بوته هاتی وگوهدارییا سەردار و سەمیانان بکه و هەرکەسێ لسەر رێکێ چوی یێ گەهشتی.

## 21. زارۆك دكەنن

رۆژەکێ مەلیکی هندەك زارۆك لناڤ زەڤیەکێ دیتن، یاری دکرن و ب دلخۆشی دکەنین، ژێ پرسیارکر: هوین بوچی دکەنن ؟

زارۆکەکی گۆت: ئەز دکەنم، چونکو ئاسمان یێ شینە.

ئێکێ دی گۆت: ئەز دکەنم ، چونکو دار دکەسکن.

یێ سیێ گۆت : ئەز دکەنم، چونکو چویچك دفرن.

مەلیکی هێڤ دکرە ئاسمانی و چویچکا و دارا، دیتن د بێ کەنینە، بو وی خویا بوو، کو کەنییا زارۆکان ژبلی ترانە پێکرنێ ب مەلیك ودەستەلاتا وی چ ئارمانجێن دی پێ نینن. زڤریڤە قەسرا خوە و بریارەك دا،کو خەلکێ میرگەها وی ئێدی نەکەنن، خەلکێن پیروکال گوهدارییا بریارێ کر و ئێدی کەسێ نە دکرە کەنی، لێ زارۆکان چ پویتە ب بریارا مەلیکی نەکر و هەردەم دکەنین ، چونکو دار دکەسك بوون و ئاسمان یێ شین بوو، ئو چویچك ژی دفرین.

## 22. بەرتیل

زەلامێن گەرەکێ جڤینکەك بەست وتێدا بەحسی دین ودونیایێ کرن، زەلامەکێ ریهـ سپی ب گازندەڤە گۆت: دوژمن دشەڕیدا شیانە مە چونکو ئەم ژ دینێ خوە یێ پاڤژ دویر کەفت بوین، هوین بزانن کو ئەو شکەستن سزا و ئاگەهداری بوو، سزایێ گونەهێن وە بوو، ئاگەهدارییە کو ئاییندە مشتی ئاتاڤ و کارەساتە.

ئێکێ کولانێ رابوڤە وگۆت: ئەم چ بکەین، رێکێ نیشا مە بدە ؟.

زەلامەکێ ب ریهـ گوتێ: ب توبەداری و پەشیمانی ل دینێ خوە بزڤرن، داخوازا عەفویێ بکەن، ئو بریارێ بدەن کو ئێدی دباش بن.

زەلامەکێ دی گۆت: لێ ئەم نڤێژا دکەین و رۆژی یێن خوە دگرین و چ زەرگەهان ناگەهیننە کەسێ، سپێدە و ئێڤاران خودێ یێ ل بیرا مە.

ئەوێ ب ریهـ گۆت: ئەوا هوین دکەن نە بەسە، پێدڤییە هوین مزگەفتەکێ ئاڤاکەن، داکو پەیڤا خودێ لسەر بلند ببیت.

- لێ ئەم هەژارین وئاڤاکرنا مزگەفتێ، پارەکێ زۆر پێ دڤێت.

ئەوێ ب ریھ ژکەرب گۆتێ: هەی مال خرابینۆ! هوین مزگەفتێ ئاڤا ناکەن ژبەر هندەك بەهانەیێن چنه و بێ بها. هوین هەمی مال و پارەیێ خوە ل ژیانەکا فەنایی دمەزێخن، ب رەش بیت ئەوێ ژینا دونیایێ لسەر رەزامەندییا خودێ دچێترینیت.

زەلامان ب شەرمینی سەرێن خوە چەماندن.

خەلکێ وێ گەرەکێ، بو ماوەیەکێ درێژ مانه برسی، لێ وان مزگەفتەك ئاڤاکر، منارا وێ مینا رمەکا کەربڤەبوی بوو، هند بوو بگەهیتە ئاسمانا و فرۆکێن دوژمنان کون بکەت.

## 23. تویژاندن

تویێژینەری گۆتە ساڤایەکێ دلاندکێدا: هشیار بی درەوا نەکەی، هەر تشتەکێ تو ژ هوگرێن خوە ب زانی بێژه.

ساڤای بەرسڤ نەدا، تویێژینەر ژێ بێزار بوو، ژ کەربڤە گۆتە زارۆکی تو دوێری نە ئاخڤی ؟

زارۆکی بەردا گرییێ، تویێژینەر بێزار بوو، گازی رەشەکێن خوەکر، هەر دەملدەست هاتن....

قامچی و شەڤ ومرن و ستێر ددەستاندا بوون.

## 24. وەسیەت

ئەوکاله پیرێ لبەر مرنێ، گەلەك ژ کور و نەڤی یێن وی ب خەمگینی لدورا خرڤە ببوون، ب هەردوو چاڤێن خوە یێن وەستیایی هێڤ دکرە دێمێن وان یێن دامایی و جلکێن وان یێن دریای. ب دەنگەکێ نزم و پەشێمان و پرلەرزین گۆتێ: ئەڤە ئەزدێ مرم و چ تشتێ مفادار بو هنگو من ل دویڤ خوە نە هێلایه.

دڤیا بەردەوامیێ ب ئاخفتنا خوە بدەت، لێ ئێشانەکا دژوار. ژنشکەکێڤە بێدەنگکر، لەشێ وی هەمی دلەرزی، چاڤێن خوە دانانە سەرێك و دبن لێڤلێڤکاڤە، هێدی گۆتە کور و نەڤی یێن خوە: گەلی کور و نەڤییێن من، ژیان یا سەیر و سەمەرەیە، هەرتشتەکێ خراب وکرێت وێ بکەن، چڤێلیێ ل عەردی بەلاڤکەن، راستیێ نەبێژن خوە ئەگەر کنفا سێداریێ ب ستوییێ وەڤە بیت، درەوا بکەن، سالیسکی و مەلاقیێ بو زەنگین و بەرپرسا بکەن، تەمەلوقێ بو مرۆڤێ چنه و یێ کەفتی و یێ ڤالا و یێ ڤلڤل بکەن، چونکو پاشەرۆژا گەش بتنێ یا وانە، هەرکەسێ ژ نوی ب سەردکەڤیت دەستا بو ب قوتن، ئوهەر کەسەکێ دوو پێنگاڤان دواکەڤیت جڤینا بێژنێ، خوە سەرخۆش کەن، نڤێژا نەکەن، رۆژییا نەگرن.

باشيێ دگەل كەسێ نەكەن . ببنە چەپرەو . ببنە راستڕەو . ببنە رۆژهەلاتی و ببنە رۆژئاڤایی،كەربێ ژ كتێبان هەلگرن .. چونكو گرنژنیا بەرپرسەكی ژ هزار كتێبان باشترە، دوژمنێن لاواز و هەژارا بن، لبن سیبەرا ئەوێن پێ چێبویی یێن ب هێزدا ب رەزیلی بنڤن، پەسنێن هێژا بوكەسێن نە هێژا بكەن، دەستا بو رەوینا سا ب قوتن، دەهولا لێ بدەن دا كەسێ گوهـ ل بسترینا بلبلان نەبیت.

ئەو كالە پیرێ لبەر مرنێ ب دژواری تنگژی، گەلەك هەولدا كو ژهەمی دلێ خوە بكەتە ڤێژی وچ تشتێ بڤێت بێژیت، لێ دوی دەمیدا مرن هات و بێدەنگییەكا مشتی كوڤان و پەشێمانی، ئەوێ لبەر مرنێ گرت و نە بەردا.

### 25. دوماهیك

ماموستای گۆتە قوتابی یێن خوە یێن زارۆك: هەروەكو من گۆتییە وە، سال ژچوار وەرزان پێك دهێت، ئەو وەرز چنە ؟

قوتابییان پێكڤە گۆتن: پاییز.

ماموستای گۆت: دپاییزێدا بەلگێن دارا زەر دبن و زەڤیا دكێلن و عەڤر دهێن.

پاییز هات، بەلگێن دارا زەر بوون و وەریان، ئەو تەرمێن دشەڕیدا هاتینە كوشتن هەمی داپوشین و چ تەرم د گوڕێن كولایدا نەهاتینە ڤەشارتن.

قوتابییان پێكڤە گۆتن: زڤستان.

ماموستای گۆت: ل زڤستانێ باران دباریت و عەردی ئاڤ ددەت.

زڤستان هات ، فرۆكێن پرتكاندی و فروكڤانێن مە یێن مری و بێگونەهـ مینا تۆڤی كەتبوونە سەر زەڤییان، باران لێ دباری.

قوتابییان پێكڤە گۆتن: بوهار.

ماموستای گۆت: دبوهارێدا رەنگێ دونیایێ كەسك دبیت.

بوهار هات ، عەردی كراسەكێ كەسكێ گولگولی كرە بەر خوە، لێ باژێرا و دایكان هەركراسێن بەهیێ دبەر بوون.

قوتابییان پێكڤە گۆتن: هاڤین.

ماموستای گۆت: هاڤین وەرزێ دورینێیە.

هاڤین هات لێ عەردی چ سونبلێن گەنمی شین نەكرن، بەلكو هندەك فرۆكە یێن نوی شین كرن و هندەك زەلام بو مرنەكا دی دمەشین.

### 26. دوماهیکەکا دی

ب لڤینەکا مشت ژکەربێ ، زەلامەکی دەڤێ خەنجەرا خوه هەتا دەستکی دعەردی چکلاند و پاشی گوهێ خوه ب روییێ عەردیڤە نا ، ب سەرسورماییڤە گۆت: عەرد یێ دکەتە گری .

پاشی جارەکا دی گوهێ خوه پێڤەنا و ب کەیفخۆشی گۆت: عەرد مر .

ئو دەمێ بو جارا سییێ گوهێ خوه پێڤەنای ژبلی دەنگێ پوستالێن سەربازان ، چ تشتێ دی نە بهیست .

*

## بارکرن بەرەف دەریایێ

**( 1 )**

رۆژەکێ ژ رۆژا، من گۆتە دایکا خوە دێ سەفەرێ کەم، روندك ژ چاڤێن وێ نە بارین، چ خەموکیێ ژی دێمێ وێ نەگرت و ژنەدل پرسیارکر: ئەرێ دێ زەنگین زڤری؟ ئو.. دەمێ ل ئێڤاری بابێ من زڤریەڤە، ب لێنێرینەکا دژوار سەحکرە من و پاشی پرسیارکر: ئەو چییە تو دخوینی؟

ئێکسەر من گۆتیێ: هەلبەت قورئانا پیرۆزە.

رازیبوون لسەر دێمێ وی دیار بوو، ئوگۆت: دێ سورەتا توبێ بخوینە.

من دەسپێکر، بلەز خواند: ئارسینێ لوبین هێرش کرە ژوورێ و وەروەرا خوەیا مەزن راکر، لێ خوری: دەستێن خوە بلندکەن.

دایکا من کەنی، لێ بابێ من ژکەربڤە لن کرە ڤێژی: کرپە.

من ب گەرمی بەردەوامی دا خواندنا خوە: دزیکەر ب ترس پاشڤە زڤرین و لوبینی کەنیەکا سار و ترانەپێکەر بەردا. بابێ من کتێب ژ دەستێ من کێشا دەرو هاڤێتە بەر دەرگەهی .. جهێ پێلاڤا و شمکێن داری، ئوگۆت: خودێ دێ تە ئەشکەنجە دەت .. خەمەکا درندە ئەز گرتم. من ددلێ خوەدا گۆت: دێ بلا خودێ من ئەشکەنجەدەت هەتا کو دمرم. ئول سپێدێ، من خوارنا خوە هەلگرت و ژمال دەرکەفتم، ئەز بلەز دچوم هەتا ژ باژێری دویر کەفتیم، گەهشتمە زەڤی یێن پان و بەرین، ل وێرێ ئەز نەشیام ب رەڤم یان خوە ڤەشێرم، دەمێ هندەك هەسپێن رەش هاتین، هندەك زەلامێن دێم ئەسمەر لسەر پشتا هەسپا بوون، عەبایێن وان درەش بوون، ب دەزی یێن زێری دوری بوون، لدور کەمەرا وان شالێن قورمزی یێن حەریری بوون، شیرێن دەڤخوار ددەستیدا بوون، لدور من زڤرین، هەر چەندە ترسێ دلێ من مشت کربوو.. لێ من خوە ب مێرانی دئینا دەر، من ب دەنگەکێ بلند ژێ پرسی: ئەری دەریا یا دویرە؟

زەلامەکی ژوان ئاخفت و دبیت میرێ وان بیت: هش بە، ژنهو پاشڤە تو بویە کولەیێ مە.

چ نەمابوو بکەمە گری، من گۆتیێ: من دڤێت ب زەنگینی بزڤرمەڤە باژێرێ خوە.

- تو نا زڤریەڤە باژێرێ خوە، ئیللا ئەگەر تە بڤێت تو بمری.

- من نەڤێت بمرم ..دا دایکا من نە کەتە گری.

- دایکا تە ناکەتە گری.

- بابێ من کالە مێرە و دێ ژ خەمادا مریت.

- بابێ تە دێ ب خەما مریت.

وان زەلامان ئەز برمە بیابانەکێ، کوونێن زەر لسەر دبەلاڤ بوون، ئەز ژ کەسکاتیا زەڤی و دارا هاتمە دویرکرن. ئو بومە کولە: خوارنێ دلێنم. ئامان و جلکا دشوم. فنجانێن قەهوێ پێشکێش دکەم. ب رەزیلی خوە دچەمینم.

من ب بەردەوامی کاردکر ژبلی چەند دەمژمێرەکێن کێمێن نڤستنێ، ئەز چومە نك میری، من ب دەنگەکێ غەیدیڤە گۆتی: بتنێ دێ هەشت دەمژمێران درۆژێدا کارکەم، هەروەکو یاسایێ بریار پێ دای.

میری ئەنیا خوە کرە گرێ و ب دەنگەکێ مجد گۆتە من: ئەگەر جارەکا دی تو جرعەت کەی و باخڤی، دێ تە ب ساخی کەمە درەملێ را.

زەلامێن ڤێ عەشیرەتێ گەلەك ژن هەبوون ژ باژێرێن دویر رەڤاند بوون، ئوسەعدیا ژی ئێك ژ وانا بوو، ژنکەکا خۆش ومژدار بوو، دەمێ خەموکی دگریت ب دەنگەکێ مشتی بیرهاتنێن خۆش و نەمر سترانا دبێژیت.

من ب دزیکیڤە گوهێ خوە ددا سترانێن وێ، ئەز درەجفیم ومن هەست دکر کو هێشتا ئەز زارۆکم و ژمەمکێ دایکا خوە دویر نە کەتیمە، من دکرە گری و ب تەحلی دنالیم .. هەروەکو خەلك هەمی یێ ب سەر کوپیتکەکی کەفتی و ئەز یێ ل دویف خوە هێلایم وەکو زەلامەکێ فالنجیێ ب تنێ و دکویرترین نهالدا یێ کەفتی.

من ب دژواری حەز ژ سەعدیایێ کر، شەڤەکێ مینا گورگەکێ دەڤ برسی من هێرش کرە کوینێ وێ، ئو دەمێ ئاگر دخوینا مندا ڤەمریای و پیچەکا خولیێ بتنێ ژێ مای، من چاڤێن خوە گرتن. ستێرێن هنداڤ باژێرێن عەردی برسڤین وەك کوترێن زیڤینی. ل وی دەمی من گوهـ لێ بوو سەعدیایێ ب رجا دگوهێ مندا دگۆت: من ببە سەر دەریایێ. کانێ دەریا؟ دەریا دویرە، هەیڤ ژی زەرە و کزە و دێم درپایە .. لسەر بیابایێن رەملێ و کوتالی و گوشتێ گەرم یا جێگرکرییە، ئو دەمێ زەرزویری زڤرینەڤە بیستانی و هەکو هێلینێن خوەیێن کەڤن وێرانکری دیتین. بەردانە گرییێ. کانێ دەریا.. زەڤیا شینا رویس؟

من گۆتە سەعدیایێ: ئەز دێ تە بەمە چیای.

سەرنجراکێشن چیا... دێ ب سەر چیا کەڤین و دێ یاریا دگەل عەڤرا کەین.

دێ کوپیتك بومە بتنێ بیت و باژێرێن جیهانێ وەکو کەنیزەکێن ترسیای دێ لبەر پێن مەبن.

- من ببە سەر دەریایێ.

دبيت دەريا دهشك بن، ئو دبيت ئاڤا سوير بێزار بوو بيت ژ زيندانكرنا دكوركێن مەزندا، ژبەر هندێ رەڤى بن و بو عەڤرێن سپى هاتبنە گوهارتن و دناڤ بوشايى يێن شيندا بەلاڤ بوو بن.

- من ببە سەر دەريايێ.

دەستێن من گەهشتنە لەشێ تەڕێ سەعديايێ.. ئەو لەشێ بويە مولكێ گەلەك زەلامان. ژنشكەكێڤە من هەست ب نەڤيانەكا وێرانكەركر هێرش دكرە گيانێ من.

دبەريكا مندا كێركەكا سار يا ڤەنويساندى هەبوو، من هەلگرت و پيچەكێ لسەر حەفكا سەعديايێ شداند، يا پێدڤى بوو كو ب ترسيت وخوە بێدەنگكەت، لێ چاڤێن وێ يێن مشتى روندك هێڤ دكرە من و قەبێ من دخواست. من ب وێ كێركا دەڤلويا ژەنكى ڤەكوشت، پاشى ب دزيكيڤە ئەز ژ كوينێ وێ دەركەفتم، من هەسپ دزى و لێ سوار بووم، دێ .. دێ ب رەڤە، هەسپى غاردا هەروەكو هورەبايەكێ درندە، ئەز بو دوير ژ كوينا و زەلامێن وان يێن دلرەق و رەوينا سەيێن وان هەلگرتم.

دەمێ روناهى يێن باژێرەكێ نێزيك ببەر چاڤێن من كەفتين،كەيفەكا مەزن كەفتە من .. ئەز يێ وەستياى بووم، ژ هەسپى هاتمە خوار و من خوە لسەر گيايێ عەردى درێژكر، ل وى دەمى من بيريا سەعديايێ كر، رويێ خوە من ب ئاخێ ڤەناو ئەز گريم. بوچى من سەعديا كوشت؟ ئەز حەز ژێ دكەم ومن دڤێت بزڤريتەڤە ژيانێ. ئەز حەز ژێ دكەم. ئاخێ ژى دگەل من كرە گرى و گوٚت: دێمێ تە يێ وەستيايە. دێمێ من سالن يێن بورين.

ئەز حەز ژ عەڤران دكەم ..

لێ ، ئەز حەز ژ دەريايێ دكەم ..

هەيڤ مر. ددەريايەكا ئاڤ سوير دا خەندقى...

ئەز بو ناكەمە گرى. لەشەكە ژ بەرەكێ رەق و سپى..

هەيڤ پسميرەكێ دێم جوانە...

من چ بەرسڤ نەدان و چومە دنڤستنەكا كوير دا.

ل سپێدێ چويچكەكا بچويك ئەز هشيار كرم، لدور من ويچ ويچەك دكر و دگوٚت:

حەسەن.حەسەن.حەسەن.

من گوٚتێ: دەريا ل كيڤەيە؟

ب دلوڤانی گۆت: ئەز نزانم، ئەزا بچویکم، پەرێن من بتنێ ئەزا فڕاندیمە سەر سێ داران، پرسیارا دایکا من بکە.

من پرسیارا دایکا وێ کر.. ئەوا لسەر چقێ دارەکێ دادای: دەریا ل کیڤەیە؟

ئەز چ ژ دەریایێ نزانم، چویچکێن پیر بتنی بەحسی دەریایێ و فڕەندە یێن وێ یێن سپی دکەن.

من ب تامەزرویی پرسیارکر: ئو چویچکێن پیر ل کیڤەنە؟

ب دەنگەکێ پرخەمڤە گۆت: چویچکێن پیر یێن مرین.

بلەز ئەز ل هەسپی سواربووم و بەرەف وی بازێرێ نێزیك من دا رێ، ل وێرێ من هەسپ ل بازارەکی ژ بازارێن وێ فرۆت و من خوارنەك پێ کری و من ب کولافی خوار، پاشی ئەز چوم و دەنگێن خۆشیێ دکویراتیا مندا بلند دبوون. زارۆکەکێ دێم تفقی سەرنجا من بنك خوڤە راکێشا، لبەر پاسێ یێ راوەستای بوو، دەستێ وی ب کراسێ دایکا ویڤە بوو، ب ئەڤینی بو دگرنژی لێ دێمێ وی هەر یێ مری بوو.

بو ماوەیەکێ درێژ ئەز ل بەرامبەر دکانەکێ شت راوەستام، تەختەکێ بچویك ل وێرێ بوو، من ددلێ خوەدا دگۆت: ئەڤە تەختێ زارۆکەکییە. من ب دلوڤانی بەرێ خوە ددا تەختی .. لێ پەشێمانییەکا دڕندە دخوینا مندا دباری، ئەز پێ هەسیام کو بەرەبەرە دێ تێچم . ئەگەر ئەز مالەکێ و ژنەکێ و زارۆکەکی ب دەست خو نەئێخم، دەمێ ئێڤاری ژ کاری ڤەدگەریێم گازی من بکەت باب..باب.. بیرا من ل کچکەکێ هات یا ژمنڤە وەکو ژن یان هەڤژین دێ بکێر من هێت، لێ گۆتە من: تو بکێر ژیانا ژن و مێرینێی ناهێی، تبعەتێ تە زویکا دهێتە گوهورین. هەمی دەمێن خوە تو ل مەیخانە و چایخانە و جاددەیان دبورینی و تو پویتەی ژی نادەیە جلکێن خوە.

هینگی من گۆتێ: ئەز گەلەك یێ لاوم، سنجا من ژی گەلەك یا باشە و ئەز گەلەك بکێر ژن و مێرینێی دهێم، دەمێ ئەز ڤالا دبم .. ل مزگەفتا دبەمە سەر. من گەلەك حەز دکر بێژمێ: تو یا بێ ئاقل و ساویلکە و سەرڤەیی . لێ بتنێ هەردوو تلکێن تە یێن مەزن سەرنجا من رادکێشن.

ئەز زڤریمەڤە رێڤەچونا خوە و پاشی ل هەمبەر پەرتوکخانەکا مەزن راوەستام، من هزرا خوە دوان کتێبێن ل پشت جامخانا بەروکا پەرتوکخانێ کر، ئو من ددلێ خوەدا دگۆت: دێ هەمی کتێبا خوینم .. ڤەرێژا مەژیێ مرۆڤایەتیێ هەمیێ دێ دقەرقودێ خوەدا هەلگرم. ئەز ل پەرتوکخانێ ب ژوورکەفتم. من ژ خودانێ وێ یێ پیرەمێر پرسی: چ مفا دکتێباندا هەیە؟!

– بو خوە مژویل کرنێنە.

- نڤستنا دگەل ژنكەكێ مرۆڤ پتر پێڤە مژویل دبیت و خۆشترە.

- كتێب راستیێ ددەنە مرۆڤی.

- ما راستی چییە؟

- ئەوە تو بزانی دیٚ چەوا یا دلیٚ خوە دەركەی.

- دایكا من چ كتێب نەخواندینە و ب شەهرەزایی دزانیت كا دیٚ چەوا دلیٚ خوە دەركەت.

- تو یێ وەختیٚ من بەرزە دكەی.

- ئەز بیٚ دەریامە.

ئو من ئەو هێلا , ئەز ژ پەرتوكخانیٚ دەركەفتم و زڤریمەڤە سەر جاددیٚ , من گەنجەك دیت یێ خوە چەماندییە سەر عەردی و یێ ل تشتەكی دگەریێت , من ژیٚ پرسی: تو چ دكەی؟!

گوت: ئەز كورِكەكێ بچویكم.

جارەكا دی ئەز ژیٚ پرسیم: تو چ دكەی؟!

ئەزیٚ ل پرتەكا بەریٚ كلسی دگەریێم, دا لسەر عەردی بەلەمەكێ پیٚ ب نەخشینم و لیٚ سویار ببم... دیٚ من بەرەف دەریایێ بەت.

- منژی دگەل خوە ببە.

- بەلەم یا بچویكە , بتنیٚ تێرا كەسەكێ بچویكێ وەك من دكەت.

ئەزلسەر رێڤەچوونا خوە یێ بەردەوام بووم , هەتا گەهشتیمە گورەپانەكا مشت ژ زەلام و ژنكان , هەمی پێكڤە ل جهێن خوە دراوەستاینە .. هەروەكو پەیكەر و ژ بەری هاتینە چێكرن. دێمێن خوە یێن زەر بەرەف سەلال بلند كربوون , ب ساویلكەیی دەڤێن وان دڤەكری بوون , من ژ ئێكی ژوان پرسی: هوین بوچی هوسا دراوەستاینە؟!

- ئەم برسینە و یێ ل هیڤییێ ئاسمان نانی ب بارینیت.

چەند پێنگاڤەكێن دی نەچووم , من گوهـ ل مەزیقەكێ بوو مینا هەوارەكا دویر بوو, پاشی دەنگێ مەزیقیێ دژوارتر لێهات و ژ جەرگێ ویٚ قێژی یێن شەهوەتەكێ دەركەفتن , ل زەلامەكێ گەرمیٚ زڤر دگەریا. ئەز نەشیام زێدەتر بەرخودانیٚ بكەم و خوە راگرم. بلەز ئەز كەفتمە دبن ئاكاما مەزیقێڤە و ئەز ب دویف كەفتم هەتا گەهشتیمە هۆلەكا بەرفرەهـ , بانیٚ ویٚ روناهییەكا سپی بوو, ب دژواری

دبرسقی . هێشتا من تێر سەح نەکریێ ئاوازەکا سەماکەر هاتە لێدان و سەرنجا گەلەك ژ ژنك و زەلامان راکێشا. ئەز ب نك ژنکەکێڤە چووم . لسەر کورسیکەکا زێری یا روینشتی بوو. من گوتیێ: تو جوانترین ژنکی ژ دایکا خوە بوی. ئەی هەیڤا بیابانەکا بیێ ئاڤ.

ویێ ژنکیێ گوت: ئەز شاها ڤی باژێریمە.

– ئەز ژیژیمە.

– تو زارۆکەکیێ بێزاری.

– ئەز زەلامەکیێ ب تنێمە.

ژنك کەنی ، کەنییەکا سار.. ب دەنگڤەدانەکا ڤالا گۆتی: تو بیێ دەریایی.

سەریێ من کەفتە سەر سینگیێ من ، ترێنەکا ب گەلەك فارگون دەنگیێ خوە ییێ درێژ بەردا . ئەو دەنگیێ مینا سترانەکا بێزارییێ. عەرد ییێ رەقە. باخچە دبیێ رووبارن. رۆژیێ چ ستێر نینن. کا بنەفشا خەونوکییا ب دوو مەمکێن رەڤی ژ سوهتنا رۆژیێ ؟ بنەفش دناڤ باخچەیاندا شین نابن. بێهنا گیاییێ چرمسی بێزارییا ئاخێیە. سومبلێن زەڤیا دمرینە. دەڤیێ مری ییێ بیێ کێرە. بەلەمێن رەش ددەماراندا . چویچکێن سەر ژێکری. دارهنارا دەڤ ئەشکەنجەدای یا ل هیڤیا زەلامەکی خوینا خوە ب رێژتە سەر ئاخا ویێ یا تێهنی. ئەز حەز ژ ترێنا دکەم و داڤێن پرچا نەرم لسەر دەڤیێ بڤریێ خوینەلو ب خوینا داران. ژنك و زەلام هاتن و ژ کەیف هەڤ هەمبێزکرن. دارێن رویس بەلگ ب چڤێن وانڤە شین دبن.

ئەی شیرێن تەزی لسەر عەردیێ دێم خەموکی ب هەلیێ. ئەز کەفتمە سەرچوکا. ئەزبەنی.. ئەزبەنی. خوینا من بدە کەنیا زارۆکەکی ... دەریاییێ بدە من. من سەریێ خوە بلند کر. من دیت هۆل نەمایە و ئەز ب تنیێ ییێ مایمە لسەر جاددەیەکا درێژ. من هزرا رەملەکا زەر و کەڤرێن تەر و هندەك بەلەمێن پەرسپی و پاپورێن مەزن دکر. ژ بوری یێن ویێ کادییەکا زۆر دەردکەفت و من گوهـ ل دەنگیێ پێلێن لسەرێك سواربوی بوو.

ژنشکەکێڤە هندەك زەلامێن بیێ سەر بنك منڤە هاتن و گازی دکر: ئەڤە بکوژیێ خودێیە.

ئەز راکێشامە دئاڤاهییەکیڤە. بەرێن وی یێن زەر دبوشاییەکا بەلەکدا راست قوتای ، وەکو سەریێ رمەکا مەزن دهاتە پێش چاڤێن من و هند نەمایە دیێ روییێ ئاسمانی سمیت. دەمیێ ئەز بریمە دژوورەکا دیڤە. ترسا من زێدەتر لێهات. د ویێ ژوورێڤە کورسیك ل هەمی دورا دبەلاڤکری بوون و دوو مێزێن داری تێڤە بوون. ل پشت مێزەکیێ ژوان هەردووا .. زەلامەکیێ درێژیێ مل پان خوە پەحن کربوو. دێمەکیێ تفقی هەبوو. ئێکسەر گۆتە من: تو کیی؟؟

هەمی هەولا من ئەو بوو کو دەنگێ من نە رەجفیت ، من گۆتێ : من چ گونەهـ نەکرینە.

– درەوا نەکە .. دانپێدانێ بکە ، تە خودێ یێ کوشتی.

من ب دەنگەکێ لەرزیڤە گۆتێ : من کەس نە کوشتییە.

توێژینەری گۆتە من : گوهدە من ، من نەڤێت دگەل تە یێ دلرەق بم ، چونکو تو شکلێ برایێ من ددەی ، رەبەنی ، برایێ من یێ بچویك ، رۆژەکێ من شەرێ وی کر ، ب تورەبونڤە دەرکەفتە سەر جاددێ و ترومبێلەکێ لێدا ، رەبەنی برایێ من .. دێ باخڤە ، ئەگەر تو نە ئاخڤی دێ تە گورێم. من ب گەرمی گۆتێ: ئەز بێ گونەهم ... ئەز بێ گونەهم.

توێژینەری بو چەندین جاران سەرێ خوە هژاند ، تبلا خوە لسەر جهێ زەنگل لێدانێ شداند و ئەزێ بێدەنگبووم ، لێ جیهان دهاتە پێش چاڤێن من کو یا دڕیایی و پرت پرتە. ل وی دەمی من هەستا جردی زانی هەکو دکەفتە دتەلهەکێدا.

سێ زەلام هاتنە دژوورڤە و توێژینەری گۆتە وان: ئەڤە مێڤانێ مەیە .. وەکو هەرجار دێ بخێرهاتنێ لێکەین.

ئەو زەلام لمن خورین: پێلاڤێن خوە و گورە یێن خوە ژی بێخە.

ئێکسەر من وەکر و هەردوو پی یێن خوە من کرنە دناڤبەرا قاییشا تفەنگێ و دارێ وێ یێ رەقدا ، ب شفکەکا زراڤ ل پی یێن من راوەستان و دانانێ ، دوو زەلامان ژی خوە بسەر لەشێ من دادا بوو ، من هەول ددا قێژی یێن خوەیێن پر ئێش دگەوریا خوەدا ب خەندقینم ، من ددانێن خوە لسەر لێڤا خوە یا خوارێ دشداندن.

توێژینەری لێ دکرە هەوار: لێ بدەن.. لێ بدەن ، ئەو نا ئێشیت.

لێدان دژوارتر لێ دهێت ، دکەمە قێژی ، هەول ددەم خوە ژدەستان پاڤێم.. لێ توێژینەری لمن دکرە قێژی: باخڤە .. تە خودێ یێ کوشتی ، بێژە کێ تو پالدای کو خودێ بکوژی. شفکا ئێکێ ب منڤە شکەست و ئێکا دی ئینا ، ئاگر دخوینا مندا گوشتێ من دخۆت . ئەی خودێ یێ من تو ل کیڤەیی؟؟!

باخڤە .. باخڤە .. باخڤە

پشتی بێهنەکێ لێدان راوەستیا ، توێژینەری فەرمان دا من کو رابمەڤە ، ئیشارەت کرە سەتلەکا ئاڤێ و گۆتە من: پی یێن خوە بکە تێدا... نهو ژی دێ ب رێڤە هەرە. ئەز هێدی ب رێڤە چووم ، هەمی هەولا من ئەو بوو کو پێنگاڤێن من دجهگیر بن. من هەست ب کرێتکرنێ دکر .. هەروەکو هندەك زەلام دێ لدەف

خویشکا من نڤن و ئەز ب رەخ وێڤە ب وەریسێن ستویر یێ گرێدایمە. توێژینەری ب تورەییڤە لمن کرە ڤێژی: ڤوتان دگەل تە یا بێ مفا بوو.. کێ تو پالدای کو خودێ بکوژی؟؟

ئەز بێ گونەهم .. من کەسەك نەکوشتییە.

تو درەوا دکەی ..

ئەز راست دبێژم ..

کولم و زللەه بارینە سەر دێم و زك و سینگێ من ، ئەز نەدشیام چ ببینم ژبلی رۆناهییەکا شین کو بلەز ل بەرامبەر چاڤێن من دبرسقی. لێڤێن من شەق بوون و خوین ژێ هاتە خوار. ژ دفنا منژی خوین باری.. چاڤێن من وەرمتن، ئێشانەکا وەکو برویسیێ کەفتە لەشێ من .. هەروەکو هەموو هەستیکێن سینگێ من هەرشین.

توێژینەری کرە ڤێژی: ببەن ..

وان زەلامان ئەز برمە بنداڤەکێ و ژ وێرێ ژی ئەز دناڤ لیوانەکا تەنگو تاری را برم، گلوپەکا کز یا کارەبێ لیوان رۆهن دکر، ل هەردوو رەخان دەرگەهێن ئاسنی بوون، دەرگەهەك ڤەکر و ئەز پالدامە دزیندانەکا بچویکڤە، وایرەك ژبەر بانی دهاتە خوار و گلوپەك پێڤە بوو، زیندانییەك بتنێ تێڤە بوو، لسەر پشتا خوە یێ درێژ کری بوو. دەمێ ئەز دیتیم ئێکسەر رابوڤە ، لێ ، بلەز من خوە هاڤێتە سەر گوینیکەکێ تژی کا و من خوە لسەر درێژکر.

ئەوێ زیندانی گۆت: تو مێڤانەکێ نوی یی ؟!....

ئەز ژبەر ئێشانێ دنالیم، ئەوێ زیندانی پرسیار کرەڤە: تو ئەشکەنجەدای ؟؟؟. تو نە ئاخفتی؟، گونەها تە چییە؟؟...

- من چ گونەه نەکرینە.

- هەمی ئەوێن دهێنە ڤێرە، ل دەسپێکێ وەکو تە دئاخڤن، پاشی پشتی ئەشکەنجەدانەکا کێم دانپێدانێ دکەن. ئەشکەنجەدانەکا کێم: وەکو ڤوتانا ب داری .. هەلکێشانا نینوکا .. کارەبکرن .. شکاندنا هەستیکا ..........

- هش بە

- تو مێڤانێ منی، پێ نەڤێت کو پشتی دەمەکی دێ من هێلی، ئەڤە چەندین سالن ئەز زیندانکریمە.. ئووووف. من ناڤێن رۆژ و هەیڤان یێ ژبیرکرین و دێ پەیڤان ژی ژبیرکەم ئەگەر ئەز

ب بەردەوامی نە ئاخڤم, من هندەك پرتێن توتیایێ درزی بون. جارەكێ بتنێ تویژاندن دگەل من كرن و پاشی ئەز پشت گوھ هاڤێتم. لڤێرە كارێ من ئەوە, ئەز ژوورا پاقژ دكەم, جارەكێ ئەز لسەر پی یێن خوە یێ روینشتی بووم, من عەرد دمالی, بێهنا گوشتەكێ براشتی هاتە من .. من نەعلەت ل بابێ خوە و دایكا خوە و باپیرێ خوە و داپیرا خوە باراندن, ئەز گەلەك یێ برسی بووم, پشتی هینگی من زانی كو ئەو گەنج وەكو تە یێ ركویی بوو, نە دئاخفت. ل دوماهیێ مەجبوركر كو لسەر توتیایەكا گەرم روینیت, هەر دوو تلكێن وی یێن رویس هاتنە سوتن, ئەز حەز ژ گوشتی دكەم, تو حەز ژ گوشتێ براشتی دكەی؟؟!.. دبن لێڤلێڤكاڤە من گۆتێ: خوە كر كە.

من ب ئەزمانێ خوە خوینا لێڤێن خوە دئالیست, ژناڤ لیوانكێ دەنگێ رێڤەچوونا پێلاڤەكا گران هاتە گوهێن من , پشتی بێهنەكێ دەنگێ بادانا كلیلەكێ دكونا قفلا دەرگەهیدا هات و ئەو زیندانی ئێكسەر چوو خوە درێژكر و وەسا دا خویاكرن كو یێ دخەوەكا كویردا. دەرگەھ ڤەبوو , سیرێنەكا دژوار ژێ هات. ب دەنگەكێ نێر گۆتن: هلوڤە...

ئەز ب دویف زێرەڤانی كەفتم هەتا گەهشتیمە ژوورا توێژینەری, ئێكسەر گۆتە من: لڤێرە روینە.

دەستێ خوە درێژكرە كورسیكەكا داری و جارەكا دی گۆت: تە ئەز وەستاندم .. دڤێت تو باخڤی

– ئەز بێ گونەهم .. من چ گونەھ نەكرینە..

– چ كەس دبێ گونەھ نینن , من مەجبور نەكە كو تە جارەكا دی ئەشكەنجە دەم, دێمێ تە وەكو دێمێ برایێ منە.. رەبەنی برایێ من .. من نەڤێت وی ئەشكەنجە بدەم. باخڤە .. سەرۆكێ من گەلەك گرنگیێ ددەتە پرسا تە, ئەگەر ئەز دگەل تە نەگەهمە چ ئەنجامان, دێ ئارێشە بو من پەیدا بن.

– ئەز بێ گونەهم

– ئەگەر تو دانپێدانێ نەكەی, دێ كارێ من ژ دەستێ من چیت, ئەز یێ ب ژنم و ئەز حەز ژ ژنا خوە دكەم, من زارۆكەكێ جوان یێ هەی, ئەگەر تو ببینی دێ حەز ژێ كەی, ما تە دڤێت زارۆكێ من و ژنا من برسی ببن؟

– من نەڤێت كەسەك برسی ببیت..

– یا دێ باخڤە. خوە ژڤێ نەخوشیێ قورتالكە و بێژە كو تە خودێ یێ كوشتی, ناڤێ وی بێژە, ئەوێ تو پالدای كو خودێ بكوژی.

- ئەز بێ گونەهم.

- گوهێ خوە بدە شیرەتا من, دەڤێ تە یێ گرتی دێ تە وەستینیت, هەمی ئەوێن دکەڤنە ددەستێ مەدا حەز دکەن رۆلێ پەهلەوانان ب گێرن, لێ پشتی چەند رۆژەکا دهەلوەشیێن و دانپێدانێ دکەن, پتر ژ ئەوا مە دڤێت... دێ باخڤە.

- ئەز بێ گونەهم..

توێژینەری ژ کەربڤە تفکرە سەر عەردی و گۆتێ: تە گوهێ خوە نەدا شیرەتا من, وان هەرسێ زەلامان جارەکا دی هلدا ژوور, گەلەك دوەستیای بوون, حەزا نڤستنێ ژ چاڤێن وان دکرە هەوار, ئێکی ژوان گۆتە من: پانتورێ خوە بێخە و خوە لسەر زکی درێژکە. من ب توندی بەرەڤانی ژ خوە دکر, لێ دەستێن وان هەرسێ زەلامان ژمن ب هێزتر بوون, دەمێ سەروچاڤێن من ب عەردیڤە دنویسیای من شیا وی سۆندەیێ درێژ یێ لاستیکی ئەوێ ب حەنەفیا ئاڤێڤە بەستی ببینم, من گوهـ لێ دبوو, توێژینەری دگۆت: تو نا ئاخڤی .. ئانە ؟!

هەمی لەشێ من رەجفی, دەمێ من هەست پێکری کو ئەو سۆندە کرە دناڤبەرا هەردوو تلکێن منڕا, پاشی ئاڤ دسۆندەی را هات و چوو دناڤ هناڤێن مندا.

- باخڤە..

وان هەرسێ زەلامان خوە ب سەر من دادا بو, دەستێن وان ئەز گرت بووم و نەدهێلا ئەز ب لڤم. ئێکی ژوان ب پێترانکیڤە دکەنی و ئێکێ دی ژی تف دکر. کا جگارەکێ بینە, جگارەکێشان ددەمێ کارکرنێدا قەدەغەیە.

توێژینەری پێلاڤا خوە لسەرێ مندا و لمن کرە قێژی: باخڤە .. ئەگەر نە, ئەڤ ئاڤە ب بەردەوامی دێ چیتە هناڤێن تە .. هەتاکو دگەهتە کلوخێ تە. من چاڤێن خوە گرتن, دەریایەکا ب ترس ژمن نێزیك دبوو, ب دیناتی پێلێن خوە بەردانە دگوهێ مندا, ئاخینکەکا کویر ژمن دەرکەفت, لێ ل وی دەمی گرانییەك ب هۆڤاتی لسەر زك و سینگێ من زێدە دبوو, ژنشکەکێڤە دەنگێ توێژینەری ژ دویر هاتە گوهێ من: نهو بەسە .. ببەن.

ئەز هەلگرتم و برمە درینداننێڤە, ئەز هاڤێتمە سەر گوینیکێ کایێ و ئێکسەر ئەز دخەو چووم. دەمێ ل سپێدێ هشیار بویم, ب دلرەشی من هێڤکرە دورماندوری خوە, ئەو زیندانیێ پربێژ من نەدیت, من ددلێ خوەدا گۆت: چ پێ نەڤێت .. نهو یێ ژووران پاقژ دکەت. من هزر دکر ئەو زەلامەکە نامریت و کارێ وی پاقژکرنا ڤان ژوورێن بێ هژمار بیت. ب رەخ خوڤە من کۆپەکا ئاسنی دیت و

کلورەکا مەزنا نانێ ئەسمەر. کۆیا ئاسنی یا تژی چایەکا رەش بوو. من دەسپێکر کلورە دا بەر لەقا و هەر نافبەین نافبەین من فرەکا مەزن ل چایا سار ددا . پاشی ئەز رابووم و بنك کونەکا بچویکڤە چووم. تبلێن من شفشێن تەزی گرتن و من سەحکرە پرتەکا ئاسمانێ شینێ تاری. رۆژ ژی یا گەش و بریقەدار بوو. من ددلێ خوەدا گۆت: چ رۆژەکە. وەکو دەریایێیە!... من ب ئاڤرویەکا بچویك سەحکرە دیواری. هندەك پەیڤێن نەڤاڤێرا یێن مەزن ب بەرچاڤێن من کەفتن. هندەك ژ وان پەیڤان من ب دەنگەکێ هشك و بلند خواندن: خودێ .. هاریکاریا من بکە.

من هەست پێکر ئێشانەکا دژوار یا د پی یێن مندا و ئەز زڤریمەڤە سەر جهێ خوە لسەر گوینیکێ کایێ. من خوە درێژکرە سەر.. لێ لەشێ من هەمی درەجفی. لەشێ من بونەوەرەکێ سەیرێ هەرشاندییە. من گوه ل قەلەبالغەکێ بوو . ژ زیندانا من نێزیك دبوو. ب ترس من خوە کرە قورمك .. دێ دانپێدانێکەم.

دەرگەه ڤەبوو. توێژینەری ب دلوڤانی گوتە من: سپێدە باش

گرنژی و پاشی گۆت: هلوڤە .. پێلاڤێن خوە بکە پێ خوە و نەترسە.

گەلەك یا ب رەحمەت بوو کو پی یێن خوەیێن وەرمتی بکەمە دپێلاڤێدا. توێژینەری جگارەك دا من و گۆت: مە ئێکێ گرتی. خودانێ خوە و گەلەك کریارێن پێشینە .. یا دانپێدای کو وی خودێ یێ کوشتی!

من جگارەك بەردایێ و ئەز پشت چەمیای راوەستام . ب ساویلکەیی من هێڤ دکرێ. ئینا توێژینەری گۆتەڤە: ما تو تێ نەگەهشتی کا من چ گۆت؟ نهو تو یێ سەربەستی. لێڤێن من ب توندی جگارە شداند و دەنگێن کەیفێ دهناڤێن مندا بلند بوون. پاشی من دویکێلا جگارا خوە بەردا و ب دەنگەکێ پر خەموکی من گۆتە توێژینەری: ئەرێ گەلەك هاتە ئەشکەنجەدان؟

توێژینەر کەنی و ب دلخوەشی گۆت: لڤێرە چ ئەشکەنجەدان نینە. ئەڤێ ژبیر نەکە داکو توشی چ ئاریشان نەبی . تو دشێی نهو بچی .. ئەز دێ هەتا دەرگەهی دگەل تە هێم داکو زێرەڤان رێکێ ل دەرکەفتنا تە نەگرن. لبەر دەرگەهێ ژ دەرڤە. توێژینەر ب ئەڤینی هاتە دەستێ من و گۆت: تو گەلەك وەکو برایێ منی. رەبەنی.. یێ مری. هەرە و جارەکا دی نە زڤرەڤە. ئەز هێدی هێدی دچووم. دەمێ گەهشتیمە سەرێ کولانێ لدور خوە زڤریم. من ئاڤاهیێ زەر دیت. وەکو ئاژەلەکێ درندە بوو. من دڤیا پێنگاڤێن خوە بلەزتر لێ بکەم. لێ پی یێن من گەلەك دئێشاندم و ئەز مەجبور دکرم کو هێدی هێدی ب رێڤە بچم.

چ رۆژەکە ..!!

هەرایا گەرما جاددەیان ئەز حەبیراندم. مەکینەیێن ترومبێلان کاردکەن. خەلك لسەر چیمەنتویا شوستەیان ب رێڤە دچوون. رۆژنامە ب پێشیا پەرتوکخانێن بچویکڤە دهەلاویستینە. کچ و کورێن گەنج لبەر دەرگەهێ سینەمایێ دراوەستاینە. دێ ل ئاهەنگا سپێدێ ئامادە بن.. رۆژ. ئاسمانێ شین.. ژنکەکا دکەنیت.. زەلامەك ب چریسەت یێ ب رێڤە دچیت.. زارۆکەکێ زەعیف یێ کارتێن بەختی دفروشیت.. من گەلەك شەرم ژخوە کر دەمێ کچکەکا بچویك سەح دکرە من. جارەکا دی من هەست پێکر کو لەشێ من یێ هەرشاندی بونەوەرەکێ سەیرە. دەمێ هێدی هێدی من پێنگاڤ دهاڤێتن، من بیرییا دایکا خوە دکر. دایکا من دگۆتە من: دەمێ مرۆڤ دمریت، دسەر پرا سیراتێ را دێ ب رێڤە چیت. من هزرا سیراتێ کر. دەزیيەکێ پیلاییيە. وەکو مویەکێ زراڤە. وەکو دەڤێ شیری یێ تیژە. ل هنداڤ سۆلەکا کویر یا هەلاویستییە. مرۆڤێ باش دێ ب ساناهی دسەر را بوریت و ئەوێ خراب پشتی پێنگاڤا ئێکێ دێ کەڤیت. من ددلێ خوەدا دگۆت: بەری پێنگاڤا ئێکێ .. ئەز دێ کەڤم. من هەست پێکر ئەز مێشەکا بەرزەمە یا ل بانەکێ رەق دگەرێێت کو خوە پێڤە ب نویسینیت. ئەو خوینا ب لێڤێن منڤە هشکبوی من ئالیست و من گۆتە خوە : دێ ل دەریایێ گەرێێم.

ئەز هەر چووم وچووم .. هەتا گەهشتیمە پارچەکا مەزن ژ عەردی. خانییەکێ بتنێ ل نیڤەکێ یێ ئاڤاکری بوو. لبەر دەرازینکا دەرگەهی کچکەك یا راوەستای بوو. بیرا من ل سەعدیایێ ئیناڤە. من ددلێ خوەدا گۆت: سەعدیا یا مرییە و دڤێت هەمی ژنك بمرن. بەری دەستێ خوە بکەمە وێ کچکێ، ئەز کەفتمە دکورکەکا پری کرمدا و ئەڤ کرمە ب گوشتێ منڤە مان و ب کولافی خوینا من دمێژت. من ب هەوارکی گازی کر. ئەو کچك بلەز هات و ئەز ژ کورکێ کێشامە دەر. برینێن من دەرمانکرن و ب دلوڤانی گۆت: تو حەز ژ پشیکا ناکەی؟

ئاه ... خەم دناڤ ژوورێن ب تنێ و دەرگرتیدا شین دبن. ئو دبیت مرن بهێت .. بەری ئاڤا دەریایێ پیستێ من بشۆت.

من ژ کچکێ پرسیارکر: دەریا ل کیڤەیە؟.. کچکا کەهی گۆت: دبیت دەریا ل پشت دارستانێ بیت و ب دەستی ئیشارەت کرە دارستانەکا کەسك و مەزن.....

دەریا .. دەریا .. دەریا

ئەز نەشیام خو پەیڤەکێ ژی بێژم.. من بەرەف دارستانێ کرە غار و دەمێ گەهشتیمە ناڤ دارێن وێ ، دناڤ گێژەڤانکا دەنگاندا خەندقیم.

کوترەکا سپی: دەریا جوانە.

داران: دەریا زارۆکە.

گولان: دەریا دویرە.

گێژەڤانکەکا توند ئەز برم ، هەروەکو بەرەك ژ بلنداهیێ دکەڤیت ئەز کەفتمە سەر عەردی ، ئێکسەر تاریستانەکا بۆش ئەز داعویرام ، زڤریمەڤە زیندانا خوە ، من خوە چەماند و خامەیەکێ رساسیێ پیس ژ سەر عەردی راکر و ب دەستەکێ جێگر من لسەر دیواری نڤیسی: ئەی خودێ .. تو هاریکاریا من نەکە .

هێزەکا نەدیار ئەز کێشامە دادگەهەکێ ، دادوەر یێ سەروچاڤ هشك بوو، خەلکێ وی ب ترس ب کورسیکێن داریڤە دنویسیای بوون. دادوەری گۆتە من: باخڤە .. دانپێدانێ بکە .. راستیێ بێژە.

من هەست پێکر کو مرۆڤەکێ پیلایی یێ دهناڤێن مندا ڤەشارتییە ، ئو ئەوی خوە ئامادەکر کو باخڤیت ، ب دەنگەکێ هێدی و لسەر خوە من گۆت: بابێ من حەز ژ دایکا من دکەت. بابێ من هەردەم سەرخۆشە و دەمێ ب رێڤە دچیت رادهژیێت. ئەز دبێژم هەردەم وی حەز دکر بێژیت: پشتی مرنا من گیا شین نابیت.

ئەز ددلێ خوەدا دکەنیم و من ترانە ب دفنا وی یا گەلەك سور دکرن. دایکا من حەز ژ راوەستانا بەر خودیکێ دکر، ئو دەمێ دروینشت حەز دکر کراسێ خوە ژسەر رانێن خوە راکەت ، ئەز یێ بچویك بووم دەمێ من گوھ ل دایکا خوە بوی دگۆت: یێ نڤستییە.

من گوھ لێ بوو بابێ من دگۆت: ئەز یێ وەستیایمە.

ئو من گوھ ل دایکا خوە دبوو دگۆت: یێ نڤستییە.

ئو پاشی من گوھ ل دەنگێ هەناسەیا وان یا گەرم دبوو ، ئەز ژی هەردەم حەز دکەم ب رەخ ژنکەکێڤە یێ درێژکری بم و بێژتە من: یێ نڤستییە. دێ بێژمێ : ئەز وەستیایمە.

دەمێ خوە بمنڤە ب نویسینیت بێژتە من: یێ نڤستییە و پاشی زارۆکەکێ بچویك گوھ ل هەناسەیا من ببیت و بێهنا وی ژی دبن لحێفکێڤە تەنگببیت.

دادوەری گۆت: تو درەوا دکەی .. بابێ تە مرۆڤەکێ باش و هەژارە, دایکا تە ژی رەبەنەکا وەستیایە, باخڤە .. باخڤە .. بێدەنگنەبە . من ب دەنگەکێ پیچەك رەجفینڤە بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و من گۆت: سەلما کچەکا جوانە, رۆژەکێ ب تەعدا من کرە دمالا مەڤە, ئو دەمێ من گوهـ ل ئاخینك و نالینا وێ دبوو, من هزر دکر کو ئەز میرێ هەمی دونیایێمە و ئەز زەلامێ ب تنێمە .. یێ ساخ لسەر رویێ عەردی, بتنێ درۆژانێن ئێکێدا دکرە گری, لێ پشتی هینگی هەکو لەشێن مە ڤێك دکەفتن کەیفا وێ دهات و دەڤێ وێ یێ سور ب توندی ئەز ماچی دکرم.

دەمێ شەڤەکێ ئەز نڤستیم و من گرێ نەدای , نە رەڤی .. من وەلێ کر کو ل شەڤا حەفتێ تبابەکا باش ژ عەرەڤێ ڤەخوت, گەلەك سەرخۆش بوو , ئەز ژی سەرخۆش ببووم , لێ دیناتیێ ئەز نەگرت بووم هەتاکو دەستێن من گەهشتینە مەمکێن وێ, پیچەکێ دبچویك بوون, دتژی و گەرم بوون. سەلما دکەنی و قورنجیك ل من ددان و خەبەر دگۆتنە من .. ب دەستێن خوەیێن بچویك زلللەهـ لمن ددان و گلیزانکێن من ڤەدکرن داکو بکەنم . بو من دا خویاکرن کو حەز ژ گەنجەکی دکەت ل کولانکا وان دژیت .. پێڤە چوو , ئو دگوت دەمێ ب دزیکیڤە دگەهشتنە ئێك , وێ دهێلا ماچی کەتێ و یاریا ب هندەك پارچێن لەشێ وێ بکەت .. لێ دەمێ گۆتی "دێ شوی پێ کەم", ئەز یێ سەرخۆش بووم , تورەبوونەکێ ئەز گرتم و من خوە لێدا و ب عەردی دادا , پاشی من گوشتێ وێ قەتکر و پرت پرتکر. سەلما گەلەك نەئێشا چونکو کێرك یا دەڤ تیژ بوو .. ئها ئەڤە خوینا وێیە بمنڤە , هشك نا بیت .

دادوەری ب تورەییڤە گۆت: سەلما نەمرییە , سەلمایێ یا شوی ب ئێکێ دی کری .. کا بەحسی وێ کچکا بچویك بکە.

ب دوودلیڤە من گۆت: کچا هەڤدەرێ مە گەلەك یا جوان بوو , لەشێ وێ یێ ئەسمەر و بچویك ئەز دئاراندم , ئەز ب ترسا مەزنا دچاڤێن وێدا سەرخۆش دبووم, دەمێ چاڤێن خوە گرتین چ نەما بوو خۆشیا من نەمینیت .. ئو چەند کەیفا من دهات دەمێ ب دەنگەکێ هێدی و دبن لێفلێفکاڤە گازی دکر "دادێ .. دادێ". ئەڤ کچکە دێ مەزن بیت , لێ چ جاران وێ رۆژێ ژبیرناکەت دەمێ ب گەف گۆتییە من: دێ بێژمە دایکا تە , من ب کەنیڤە گۆتێ: مرۆڤێن تە .. دێ تە ل هنداڤ بەلوعەکێ سەرژێکەن. دبیت ل رۆژەکا نێزیك بمرم لێ دهزرا کچکەکا ئەسمەردا هەر دێ یێ ساخ بم.

دادوەری گۆت: باخڤە .. باخڤە , بێدەنگنەبە.

- ژنكەك دكولانكا مەدا دگەل مێرێ خوە ب شەر هات بوو. ئەو ژەهر ڤەخوار ئەوا مێرێ وێ ژبو كوشتنا سیسرکا ئینای .. ئو سیسرك مانە ساخ .

دادوەری گۆت: باخڤە .. باخڤە.

- دكولانكا مەدا پشیكەك هەبوو، پشتی زانێ زارۆكێن خوە دخوارن ، پاشی بو گەلەك شەڤان دا مینیت و ل ناڤ مالان دگەریا نەونەوەكا كویڤیا دژوار دكر.. گازی زارۆكێن خوە دكر.

دادوەری گۆت: باخڤە .. باخڤە .

- رۆژا ئەز نەساخ بویم دایكا من كرە گری ..

دادوەری ب هشكی گۆتێ : تو حەز ژ دایكا خوە ناكەی؟

- ئەز حەز ژ دایكا خوە دكەم .. حەز ژ بابێ خوە دكەم .. حەز ژ خەلكی و خودێ ژی دكەم .

دادوەری كەنییەكا درێژ بەردا و پاشی ب ساری گۆتێ: ببەنە دناڤ ئاگریدا.

من ب ترس چاڤێن خوە ڤەكرن ، دەمێ ئەز لسەر عەردی یێ درێژ كری .. رۆژێ گەرمیا خوە دهاڤێتە سەر لەش و دێمێ من ، رابومەڤە ، من دارستان بجه هێلا. لێ دەنگێن وێ ل دویف من دهاتن: دویرە .. دەریا دویرە . من ددلێ خوەدا گۆت: ئەگەر من دەریا دیت ئەز نامرم و وەكو عەردەكێ ڤەلەو دێ هەر مینم. ل بەرامبەری من باژێركەكێ بچویك بوو ، بلەز چوومێ، ئەز ل كولانێن وی گەریام. ژنشكەكێڤە من هەڤالەكێ خوەیێ كەڤن دیت ، سەرسورماییێ ئەز گرتم و من گۆتێ:

- چ تشتی تو گەهاندییە ڤێرە ؟!!

كەنی و ژمن پرسی و گۆت: ما چ تشتە تو گەهاندییە ڤێرە !!؟

ئەم پێكڤە چوین و چوینە دمەیخانەكێڤە ، پاشی مە عارەڤا تێكهەلكری دگەل ئاڤێ ڤەخوار. هەڤالێ من ب خەموكیڤە گۆت: چ گرنژین نەماینە ددونیایێدا. من ب چریسەت گۆتێ: گوهدە من .. ئەڤە یا دڤەومیت ، ئاژەل ب سەردكەڤن. لەشێ مرۆڤی دبن ئاكاما گوهارتنەكا نەدیار دایە، پشتی چەندەكا دی دێ بیتە بونەوەرەكێ سەیر. دلێ وی جردە و چاڤێن وی تەڤنپیركن ، مەژیێ وی دوپیشكە و تبلێن وی كرمن ، خوینا وی كێم وئەداڤە و دەڤێ وی سیسرکەكا مرییە.. هەمی پەیڤ دێ بەرزە بن و دەنگێ بتنێ ل جیهانێ دێ ڤێژی یێن دوڕندە بن و دێ دەنگڤەدەن. روندكان رویێ هەڤالێ من تەر كر و گۆت:

- ئەز ڤێژیا نا راهێلم..

- ئاڤا دەریایێ دێ لەشێ مە شۆت.. رۆژا دەریایێ دێ ئاژەلان ئێخیت .. مژدارییا مرۆڤی نامینیت و کا چەوا وی دڤێت دێ یێ وەسا بیت, زارۆك .. هوزانڤان .. کەسەکێ پیرۆز.. پەهلەوان.

- کا دەریا .. تە دەریا نە دیتییە؟!!

من خاترا خوە ژ هەڤالێ خوە خواست و ئەز ژ مەیخانێ دەرکەفتم, رێکێن باژێرکی دتەنگو درێژ و ب چەپ وچویر بوون. ژنکەك ژمن نێزیك بوو, ئو ژمن پرسیار کر: تە پارە هەنە؟ من لێ ڤەگەراند: ئو تو بوچی پرسیار دکەی؟

ب گرنژینەکا دل بچیتێ گرنژی و گۆت: ما ئەز نە یا جوانم؟ ب درێژی من لێ نێری .. چاڤێن وێ دشین بوون, خەریبییەکا دژوار ئەز گرتم ژبو دەریایێ .. پاشی من گۆتێ: بەلێ تو یا جوانی.

گوت: ئەگەر تە پارە ڤێ بن .. ئەز دێ تە بەمە مالا خوە.

ئەز دگەل چوومە مالا وێ , ل وێرێ ژی ب باوەری گۆت: ئەز یا جوانم.

- تو وەکو دەریایێ یی .. گوشتێ تە رەملا بەرلێڤایە.

- پشتی بێهنەکا دی دێ تە گوھ ل ڤێژی یێن پێلا بیت.

من ب توندی کێشا ببەر سینگێ خوەڤە و دەڤێ من تامکرە خوێیا گوشتێ وێ , ل وی دەمی ژی دەنگێ پێلا ددەمارێن مندا دکرە هەوار. من گۆتێ: دەریا دخوینا مندایە . پشتی ب درێژکرنێ خوە نەرم کری, گۆت: دەریا دلەشێ مندایە.

پێڤە نویسیانا من ب وێڤە دژوارتر لێهات و ئەزێ سەرخۆش ب کەیفا خوەیا وەرارێ دکەت, ئەڤە ل دوماهیێ ئەز ب دەریایێ کەفتم, کەرەکێ گورگان هشیار بوو, بەرەف گوشتێ سپی هاتن , خوە دشهێ و خوناڤێ ڤەدا. ژنکێ هێدی دگوهێ مندا گۆت: ئاهھ .... بەرە بەرە گورگ نەمان, ئو دەریا ژمن دویر کەفت, ب شەلەژانی لدور من زڤری, لێ چاڤێن ژنکێ یێن شین .. دەریا بو من ڤەگەڕاندەڤە . من ب دلوڤانی هەمبێز کر و گۆتێ: ئەز تە ناهێلم .. دێ دگەل تە ژیم.

- تو یێ زەنگینی؟؟

- ئەز نە یێ زەنگینم .

- ما تە نەڤێت ب خۆشی بژی ؟

- من دڤێت ب خۆشی بژیم .

- تو نەشێی ب خۆشی بژی ، ئەگەر نە یێ زەنگین بی.

- هەتا مرنێ دێ دگەل تە ژیم.

- ما دێ هەر دڤێ مالا هەرفتیڤە ژین ؟ ئەڤ مالە وەکو گورییە.

- دێ بێی شەرم بێژمە تە .. من تو دڤێی .

- ئەڤینی نە نانە ...

دەمێ من پرچا وێ ماچیکری ، من گۆتێ : دێ مە مالەکا جوان هەبیت, باخچەیەك دناڤدا .. دباخچێ خوەدا دێ دارلیمویا چینین .. ئەز حەز ژ بێهنا بەلگێن لیمویا دکەم.. تو ژی حەز ژێ دکەی؟ .. دێ بنەفشا چینین .. دێ گیایێ کەسك شین بیت. دێ مە زارۆکەك هەبیت ، دێ گازی تە کەت ( دادێ .. دادێ ) , ئو دەمێ ژ تشتەکی دترسیت دێ خوە هاڤێتە دهەمبێزا تەدا ، دا بەرەڤانیێ ژێ بکەی. ژنکێ ب بێدەنگی دکرە گری, لێ ب گەرمی ئەز ب ئاخفتنا خوەرا چووم : دێ کارکەم .. دێ کارەکی بو خوە بینم .. دێ مە مالەکا بچویك هەبیت .. مالەکا کەهی ، کەل و پەلێن جوان .. دێ مە رادیویەك و دەنگرەك و گەلەك قاون هەبن .. ب شەڤێ دێ گوهێ خوە دەینە مەزیقێ ، دەمێ ئەم دپێکڤە نویسیای و زارۆکێ مەیێ نڤستی .. پێکڤە دێ هەڤرکیا جیهانا رەش کەین, ئەم ناشکێین .. ئەم سەرێن خوە نا چەمینین . ژنکێ سەرێ خوە دناڤ سینگێ مندا ڤەشارت و گۆت: دێ دگەل تە ژیم . ئو دەمێ من ب دلوڤانی دەستێ خوە دکرە پرچا وێ یا رەش و نەرم ، من گۆتێ: ناڤێ من حەسەنە .

وێ ژی ب خۆشی گۆت: ناڤێ من ژی لەیلایە .

**( 2 )**

من حەز دکر هەمی خەلکێ باژێرکی بمرن, ژنك ب مایتێکرن سەحدکەنە من, ئو ب جەمبازی دگرنژن .. ئو زەلام ژی ب پێترانکی دکەنن و پستە پستێ دکەن و ب کرێتی تف دکەن, ئو رۆژەکێ گەنجەکێ سەرخۆش رێکا من گرت, گۆتە من:

- تویی مێرێ لەیلایێ .. سوپاسیا من بکە ئەگەر یا بحال بیت .. نە نە ، سوپاسیا هەمی نێرێن ڤی باژێرکی بکە.

شەڤەکێ ژ شەڤان دەرگەهێ من هاتە قوتان , هێشتا من دەرگەهـ نەڤەکری چوار زەلامێن سەرخۆش هێرش کرنە من , ئەز ب وەریسەکێ ستویر گرێدام و برمە دژوورڤە , ئەز نەشیام چاڤێن خوە ب نقینم .. من دیت لەیلایێ بەرخودانەکا بێ مفا دکر و پاشی کەفتە بن لەشێن وان , ئو ئەز نەدشیام چاڤێن خوە بگرم .. وەسا هاتە پێش چاڤێن من کو لەزەتەکا سەیر لسەر دێمێ لەیلایێ هاتە نەخشاندن. دەمێ چوین و دەرگەهـ ل پشت خوە پێڤەداین , نالینا وێ دهاتە گوهێ من.

من ب دەنگەکێ لەرزوکی و رەزیل گۆتێ: لەیلا .. لەیلا

ژمن نێزیك بوو , ئەز ڤەکرم , خوە پەیڤەك ژی ژدەڤێ من دەرنەکەفت , لەیلایێ هەر دکرە گری هەتا وەستیای و نڤستی. ئو ل دەمێ ئەو نڤستی من مال هێلا و ئەز ژوی باژێرکی دەرکەفتم. بلا بمرن هەمی خەلکێ ڤی باژێرکی .. بلا ژنێن وان کەرێن بزنان بن , دێ بلا جرد ژ کونێن خوە یێن لبن عەردی دەرکەڤن و بلا زارۆکێن وان دلاندکێن واندا بخۆن.. بلا هەتا هەتایێ ئەڤ باژێرکە یێ بێ زارۆك بیت .. سەمیانێ وان ئاژەلەك بیت , ئو ئها ئەڤە شەڤ وەکو بانەکێ ژ حاجی رەشکا داددەتە سەر عەردی و ئەز بێ ژنکم. من چ مال نینن .. ئو زارۆکێ من ئەوێ گەلەك ب کەیف و خەریبی مایمە ل هیڤیێ , من هێلا و وەکو بایەکێ تۆرە من کرە غار. دێ سوباهی هێت , ئاخ پیستێ زڤرێ عەردییە , ئاخ دێ پویچ بیت.. عەرد پیلایەکێ سارە , گێسن دبێزار و هەرشینە , نە سومبلن .. نە دارن .. رووبار درەشن .. برینێن بێ ئاڤن .. مال گورستانن .. میر بێ سەر ب مەزناهی ب رێڤە دچن ..ئو سەرێن وان لسەر سێنیکان بو مللەتی پێشکێش دکەن. دلبەرا من . دەڤێ تە نە نانە , ژنکێن پیرەژن قەهوێ ڤەدخون و بەحسی وان زارۆکان دکەن ئەوێن نەهێن , ئو زەلام لسەر رێکان , دێمێ وان پێتییە , ئو جەندەکێ پاییزێ دچاڤێن واندایە .. وان هەیڤ یا ل سێدارێ دای. ئو رووبارەك ژ سترانا وەکو عەڤرەکێ هزار پەر هەین , ژ باژێران دویر دکەڤیت. کولی کەسکاتییا عەردی ناهێلیت , دایك زارۆکێن خوە دخەندقینن و جەندەکێن وان دهاڤێنە بەر وان سەیێن دەڤ ڤەکری یێن ئەزمانێن لەرزوك و درێژ ژێ دهێنە خوار. گەنج بابێن خوە سەرژێدکەن و دروینن سەر چیمەنتویا شوستەیان و خوە سەرخۆش دکەن. مێش دچنە ددەڤێ گەنجاندا و پاشی دگەهنە ناڤ سەرا و ل وێرێ دێ بیتە ڤزرێنا وان هەتا مرنێ .. ئەڤە دەمێ شیڤێ هات , خێزانا دلخۆش زارۆکەکێ کەلاندی خوار – زارۆکەك بوو ژ زارۆکێن وێ – پاشی دەڤێن خوە شویشتن و گوهێ خوە دانە سترانەکێ . ئاهـ لەیلا .. دێ سوباهی هێت.

من پیرەمێرەك دیت خوە ب دارەکێڤە گرت بوو , پشتا وی یا خوار بوو , پێنگاڤێن وی دهێدی بوون , گۆتە من :

- ئەز فروشیارەکێ گەروکم.

- تو چ دفروشی؟

- ئەز پەیڤان دفروشم .. دێ کڕی؟

- پارێن من دکێمن.

- بو من خۆشە ئەڤ شەڤە بێ پارە پەیڤێن خوە خەرجکەم.

چەندین جاران کوخی و پاشی گۆت: رێزێ ل کەسێ نەگرە .. خرابی ناهێتە شکاندن , راستی ئارێشەیان بو خودانی پەیدا دکەت , چ مرییان نەڤەشێرە . من ئاخفتنا وی بڕی و گۆتێ: ئەز یێ ل دەریایێ دگەرێم .

گوهـ نەدا من , ب ئاخفتنا خوەڤە چوو, ئو گۆت: خۆشی وەهمە و کەیف ژی بو ماوەیەکێ درێژ نا ژیت.

- دەریا ژنکەکا دلوڤانە.

- شکەستن یا ل هیڤیا مرۆڤان.

- شکەستن یا ل هیڤیا مرۆڤان.

- هەیڤ دێ مریت .. ستێر دێ مرن .. رۆژ دێ مریت .. جیهان دێ دڕەشاتییێ وەربیت.

ئەوێ پیرەمێر بێدەنگبوو, پاشی دەسپێکر ستران گۆتن, دەنگێ وی یێ ستویر و بلند و خەموکی بوو, کولەکا رەش ددلێ مندا شین بوو, دەنگێ وی نانەکا ب روندکان تەرکری بوو, من گۆت: دێ گوشتێ من رزیت ئەگەر دەریایێ نەبینم.

پیرەمێر ژ ستران گۆتنێ راوەستا و گۆت: هێرشکە بیابانێ. من ب بێدەنگی سەرێ خوە چەماند, ئەز ب رەخڤە چووم, ئو دەمێ ئەم گەهشتینە گوندەکی, بێی هیچ ئاخفتنەك ئەم ژێکڤە بوین, لێ من ددلێ خوەدا دگۆت: جارەکا دی دێ ڤی پیرەمێری بینم کو بسمارێن دگوشتێ ویرا. تاریستان ل گوندی یا بەلاڤ بوو, لێ کولکەك هەبو رۆناهی ژ پەنجەرکا وی دپەشی, ئەز ب نکڤە چووم و من دەرگەهـ قوتا, ئەز گەلەك مامە ل هیڤیێ .. لێ چ لڤین نەهاتنە گوهێ من, ئو ژنشکەکێڤە دەرگەهـ ڤەبوو, زەلامەکێ دێم کرێت ل بەرامبەری من راوەستاو بەرێخودانەکا سار و تاری ژ چاڤێن وی دباری. ب هشکی گۆتە من:

- تە چ دڤێت؟؟

- ئەز مرۆڤەکێ بیانیمە.

ئو دەمێ ئەز چویمە دکولکیڤە، وی زەلامێ کرێت ژمن پرسیار کر: تو یێ برسی؟! ئێکسەر من گۆتێ: نەیێ برسیمە.

- ژمەیا من ڤەخوە.

ئو من پەرداغێ شویشەیێ پری مەی راکر و ژ چاڤێن خوە نێزیك كر. مەی هەروەكو خوینەكا رشتییە بەر روناهیا رۆژێ یا قورمزی بوو. من فرەكا بچویك لێدا و پاشی من گۆتێ: ئەڤە چ جۆرە مەیەكە!! زەلام ب زڤری کەنی و ترسەکا ڤەشارتی دگەهێن مندا چاند. پاشی گۆتی: من حەز ژ ژنکەکێ دکر.

- من ژی حەز ژ ژنکەکێ دکر.

- ئو چ جاران من هەست پێ نەدکر کو یا منە.

- ما حەز ژ تە نەدکر.

- ب دیناتی حەز ژمن دکر.

- چ ژنك بوو ؟!

زەلامێ کرێت جارەکا دی کەنی و زاری منڤە کر: چ ژنك بوو! بتنێ دەمێ خوینا وێ بویە مەیا من ژنوی من زانی کو یا منە. من فرەکا مەزن ژ مەیێ ڤەخوار و من گۆتێ: ئوهـ .. چ جۆرە مەیەکە !

- تو ژ بەفرێ یی ..

- ئەز ل باژێرەکی دژیام ، جار جارە بەفر لسەر دباری و رێك و سەربانێن وی داپوشین، ئو ل وی دەمی خەلکی هەیبەتا خوە ژبیر دکر وەکو زارۆکان رەفتار دکرن.

- ئەز حەز ژ زارۆکان ناکەم.

- زارۆکێ من پشتی هەیڤەکێ دێ رۆناهیێ بینیت، ئو دێ هندەك هەیڤێن دی ژی هێن ، ئو زارۆکێ من دێ هەولدەت بێژیت: بابو.. دادێ.

- زارۆك وەکو سەیێن بچویکن ل هەمی جها دمیزن و بەردەوام درەون.

- تو ژی زارۆك بوی.

- ژنك ديناتى و زارۆكان ددەتە زەلامى ، ئەرێ تو دزانى ل دەمەكێ نێزيك دێ چ قەوميت؟. ژنك دێ نەزوك بن ، مرۆڤ ژى بەرە بەرە دێ كێم بن هەتاكو ب دوماهيكى نەمينن .. ئو ل وى دەمى ژبلى من كەسەك دى نامينيت.

- تو ژى دێ مرى .

- ئەز نامرم .. بتنێ دێ دناڤ باژێرێن ڤالادا گەريێم.

ئو ئاگرەكێ درِندە دچاڤێن ويدا هەلبوو ، من خوە بێدەنگكر، ئو من باوشكێن خوە ئينان ، زەلامێ كرێت گۆت: هلو.. هەر نوكە باركە.. پشتى هەيامەكا كێم دێ گەهييە باژێرەكێ مەزن . من لێڤێن خوە مۆچكرن و ژێ پرسيار كر:

- تو دزانى دەريا ل كيڤەيە ؟!

- ئەز ب تنێ ب كولكێ خوە دكەڤم ، دبيت دەريا ل باژێرێ مەزن بيت .

من قەستا باژێرێ مەزن كر و خەريبێ ديتنا وێ بووم ، ئو من ديت كو جاددەيێن وێ دفرەهن ، ل هەردوو رەخان ئاڤاهى يێن مەزن دبلندن ، دەمێ من سەح دكرێ من هەست ب كێماتييەكا سەير دكر. من ژوورەك دمالەكێڤە كرێ كر و من ل كارگەهەكا مەزن كاركر، ئاميرێن وێ هندەك بونەوەرێن هەردەم ددەنگتورە بوون . ل دەسپێكێ ل هەمبەرى وان من هەست ب ئەڤينييەكا دژوار كر، من ب دلوڤانى دەست دكرێ، دحلى و نەرم و تەزى بوون ، بێهنا ئاسنى و زەيتێ ئەز بەنج دكرم و دبرمە بەر لێڤا دەريايەكا نە ديار. ئو رۆژەكێ ژ رۆژان .. ئاميرەكى تبلا كاركەرەكى داعويرا ، سينگێ من پربوو ژ خەمێ و دلپێڤەبوونێ ، لێ كاركەرێن دى ژ كەربڤە خوە عێجزكرن ، خودانێ كارگەهێ داخوازا لێبورينێ كر، هەر دوێ رۆژێدا بەرخكەك ئينا لبەر پێن وى ئاميرى ڤەكوشت. ئو دەمێ خوينا سور ژ حەفكا بەرخكى دهەلاڤێت ، ئارامييەك دلەشێ مندا بورى و خەريبيا من بو دەريايێ هشيار بوڤە ، ژبلى دەريايێ .. ئەز حەز ژ چ تشتێن دى ناكەم.

ل دەمێ ئێڤارى من گولەكا سۆر كرِى ، گۆتە من : من دايكا خوە ل زەڤيا هێلا.

- ئو تو بويە گولەكا فروتنێ ؟!

- تو رۆژا خوە ژى دفرۆشى !

- دەريا بتنێ چ ميرلسەر نينن و كەسەك نەشێت بكريت.

ئو هندەك ژ دەمژمێرێن شەڤێ من ل گەل كاركەرەكێ كارگەهێ بوراندن ، گۆتە من : خويشكا من مر .. مر.

– هەمی دەمژمێران ب هەرشینە ولناڤ ئاخێ ل ستێران نەگەریێ.

– مر.

– چاڤەرێبە دێ دەریا هێت .

– دەریا ؟!!

– دەریا ل دەمژمێرێن تەناهیێ زارۆكەكە .. ئوهـ ، چەند جوانە ل دەمێ تورە دبیت .

– ئەز نزانم دەریا چییە ؟!

– دەریا نە ئامیرە و نە ئاڤاهییە و نە ترومبێلە و نە تبلەكا ژێڤەكرییە و نە بەرخكەكە خوینا وی یا سۆر ...

– من ببە سەر دەریایێ .

– كانێ دەریا ؟ چ پێ نەڤێت ، خویشكا تە یا بویە فرندەكێ سپی و ل هنداڤ ئاڤا وێ یا شین دفریت.

ئو دەمێ ئەز دڤەگەریامەڤە ژوورا خوە ، من زەلامەكێ سەرخۆش و راهەژوك دیت ، من رێكا وی گرت و ژێ پرسیاركر: كانێ دەریا ؟ ئەوێ سەرخۆش هند نەما بوو رویێ وی ب رویێ منڤە ب نویسیێت ، گۆتە من: ل دوماهیا جاددێ مەیخانەیە .. هەرە وێرێ . ئو ئەز چوومە مەیخانێ ، من ب كولافی عەرەق ڤەدخوار و پاشی ئەوا من ڤەخواری من بهایێ وێ دا و ئەز دەركەفتمە سەر جاددێ. چەند پێنگاڤەكا نەچووم ، ئەز ب هەلوەشیایی كەفتمە سەر شوستەی. ئو ل وی دەمی بو من دەریایەكا سەیر خویا بوو. پشتا من ب لێڤا سار یا شوستەیڤە یا نویسیای بوو ، ل هنداڤ دێمێ منژی ئاسمانەكێ باركری ب هژمارەكا زۆر یا ستێران خویا دبوو. من دیت دایكا من ب توندی دكرە گری و دگۆت: حەسەن .. سەفەرێ نەكە .

دكرە گری و دگۆت: بزڤرەڤە نك من ، دكرە گری و دگۆت: كورێ من .. كورێ من . بابێ من تف دكر و دگۆت:

– پشتی مرنا من گیا شین نابیت .

سەلمایا دلبەرا من ، ئەوا شوی ب ئێكێ دی كری دنالی و دگۆت: حەسەن .. مرۆڤێن من ئەز ب تەعدا یا دایمە كەسەكی ، ئەز حەز ژێ ناكەم . عەرەبانێن خەمێ هاتن. دارستانێن ئاگرین

ددەمارێن مندا شاپەڕان دسوژیت. ئەزیێ ل بنێ عەردی ، رمێن شەڤا مژدار ددلێ مندا دچاندینە .
سەلما دبێژیت : من تو دڤێی ..

دایکا من دگریت و بابێ من دبێژیت : پشتی مرنا من گیا شین نابیت .

ل وی دەمی زێرەڤانەکێ شەڤێ خوە چەماندە هنداڤ من و گۆت:

- هلوڤە .. دێ هاریکاریا تەکەم درێڤەچوونێدا ، مالا تە یا دویرە؟

وی زێرەڤانی ئەزگەهاندمە ژوورا من و من سوپاسیا وی نەکر. ل بەرامبەری خودیکێ راوەستام و من سەحکرێ ، دێمێ من یێ زەر بوو ، بەرێخودانەکا رەش دچاڤێن مندا خویا دکر. ل دەسپێکێ من هەست پێکر کو ئەو نە ئەزم و بەرە بەرە من هەست ب ئەڤینی یا وی کر. من چاڤێن خوە ل دورماندۆری خوە گێران ، من سیسرکەك دیت ب دیواریڤە بوو. من گرت و زەندکا خوە هەلدا ، من هێلا سیسرك ل گوشتێ من پالە ببیت ، رەجفینەکا دژوار و ب ئێش ئەزگرتم ، من باوەرکر کو هێشتا یێ ساخم و دەریا نەیا دویرە. دەریایەك ئاڤا وێ ل دەسپێکا رۆژێ یا کەسکە و پاشی شین دبیت و پێلێن وێ گلیزەکێ سپیێ هەی. بێ بێزاری ب کەڤرێن بەرلێڤا دکەڤیت. ل رۆژێن ددویفدا ، ئەزنەچوومە کارگەهێ ، پرانیا دەمێ خوە من ل چایخانەکا مەزن لبەرلێڤا جاددەیا سەرەکی دبوراند. چایخانەك بوو ، خەلك ژ هەمی تەخان دهاتنێ و هندەك رۆژێن کێم تێ نەبن ، کەسانێن دهێنە ڤێ چایخانێ ناهێنە گوهورین. ل وێرێ من زەلامەك نیاسی ، دێمێ وی یێ هشك و پرچا وی یا گژاڤژ بوو ، جگارە ژ دەڤی دویر نەدکەفت. وی حەزژکچکەکێ دکر ئەو نە دنیاسی ، دەمێ بەحسی هۆزانێن خوە دکر ، بو وی یا خۆش بوو. یێ ل هیڤیێ هەمی هۆزانێن خوە کومکەت و ددیوانەکێدا بەلاڤکەت. جارەکێ من گۆتێ: ئەگەرجارەکێ تو گەهشتییە دلبەرا خوە ، ما تو هۆزانێن خوە نا سوژی؟!

ئو هەرل وێ چایخانێ من زەلامەکێ دی ژی نیاسی ، یێ لەش مەزن بوو ، ریهێن وی درەش بوون ، دێمێ وی وەك یێ شەیتانان بوو. کارێ وی ژی ئەو بوو دەست دخواندن ، ئەو رابردووی و دەمێ نوکە و پاشەرۆژێ ژی درانیت. لێ هەروەکو وی گۆتییە من کو گەلەك ب زەحمەت نانێ خوەیێ رۆژانە پەیدا دکر.

گۆتە من: مرۆڤ درازینە .. ب رێکەکێ ژ رێکا دژین و پویتە ب ژیانا خوە ناکەن.

- ما تە دڤێت چ بکەن ؟

- ببنە عاشقێن رۆژێ.

- عشقا دەریایێ باشترە.

- ئەز حەز ژ رۆژێ دکەم . چونکو ل دوماهیا هەیڤێ دەرگەهێ من ناقوتیت و داخوازا بهایێ رۆناهیا خوە ژمن ناکەت.

دوێ چایخانێڤە هژمارەکا قومارچییان هەبوو. ئێك ژوان یێ حەوێس بوو. دەمێ قازانج دکر ژ کەیفادا ستران دگۆتن . ژبەر هندێ هەڤالێن وی ناڤێ وی کربوو عەندەلیب. من گۆتێ: تو هەست ب چ دکەی دەمێ خسارەت دبی؟

ئەوی گۆت: ئەز هەست پێ دکەم کو ئەز دەستاڤەکا پیسم.

من گۆتێ: ئو تو هەست ب چ دکەی دەمێ فایدە دبی .

ئەوی گۆت: ئەز هەست پێ دکەم کو ئەز زەلامەکێ لاوم ب کوباری دمیزتە د دەستاڤەکا پیسدا.

ئو هەروەسا هندەك گەنجێن هێشتا قوتابی ژی ل وێرێ بوون. یێ ژ هەمیا کەیفخۆشتر "خودێ" بوو – بڤی ناڤی گازی دکرنێ– هەردەم دگۆت: هەر کەسێ سێ جاران لسەرێك خەبەرا بێژتە من , دێ بەمە بەهەشتا خوە و دێ تانجەکی دانمە سەر سەری و دێ سەد ژنکا دەمێ. وێ چایخانێ دەریا ژبیرا من بر. وەل من کر کو دناڤ ژیانا وێدا ب خەندقم . لێ پشتی دەمەکی ژێ بێزار بووم و خەرییبیا من بو دەریایێ مەزنتر لێ هات. ئەز دەرکەفتم و لناڤ بیستانێن لدور باژێری دگەریام. لبن چقێن دارهنارەکێ روونشتم . گۆتە من: دوهی لبن چقێن من دوو عاشق نڤست بون.

- گەنجەك و کچەك .

- گەنجەك حەز ژ رابردووی دکەت و کچەك حەز ژ پاشەرۆژێ دکەت.

- ئێکودوو ماچیکرن ؟

- لێڤێن کچکێ درەجفین و دمانە چاڤەرێ .

- ئەوێ گەنج ئەڤینیا خوە بو خویاکر؟

- گەنج یێ شەپلی و شەرمین بوو. ئو دەمێ گوتییە کچکێ "من تو دڤێی" دێمێ وی وەکو لێڤێن وێ لێهات.

- ئەز نە ئەڤیندارم .

- دێ هێدی هێدی مری.

– هەتا دەریایێ نەبینم ، ئەز نامرم.

– مادەم بێ ئەڤینی دێ هەر مری، درندەك دێ تە خۆت لبن پیستێ تە، یێ ڤەشارتییە.

– من دڤێت جارەکێ بتنێ بەری مرنا خوە بکەمە کەنی .

دارهناربێ دەنگبوو ، لێ گولەکا سپی یا دێم ، دەسپێکر دگەل من ئاخفت و گۆت:

بلبل بو من دسترینن.

بلبل حەز ژ دەریایێ ناکەن.

بلبل حەز ژمن دکەن.

بلبل حەز ژ سترینا خوە بتنێ دکەن.

ئەز حەز ژ ئاسمانێ شین دکەم.

قەلەرەشك حەز ژ ئاسمانی دکەن.

قەلەرەشك دێ مرن.

رابومەڤە ، پیچەکێ چووم و من بایەك هەلدکێشا .. یێ شهدار و خوناڤگرتی بوو، ب بێهنەکا مژدار یێ تێکهەلکری بوو. جوکەکا بچووك گازی من کر: حەسەن .. حەسەن

ئاڤا تە نە یا سویرە.

ئاڤا من ژ عەڤرانە.

خوەزی تو کەچا دەریایێ بای.

سیتافکا من یا رەش ول بەرامبەر من کەفتی، گۆت: گری دێ یا بێ روندك بیت.

ئاخێ گۆت: خوەزی باران باری با ...

من گۆت: ئەز عاشق بووم و عەرەبانێن خەمێ ئەز دبرمە پەراڤێن دویر.

ئاخێ گۆت: هەسپا لسەر پشتا من وەکو هۆرەبایێن تورە غاردان یا کری و شیرلبەر رۆناهیا سپێدێ یێن برسقین، من خوین یا ڤەخواری و گولێن سور یێن داین.

ئەز کەفتمە سەر عەردی و هەمی لەشێ من خەریبێ بهیستنا سترانەکا خەمگینە .. تێلێن عودەکێ لێدەت و بێژیت.

ئاخێ گۆت: رۆژ, شەڤ, هەیڤ, ستێر و رۆژا گەرم .. هەمی حەز ژمن دکەن و ئەز حەز ژ بارانێ دکەم.

ل وی دەمێ باران دئاخفت, من لێڤا خوە ب ئەزمانی دئالیست, بارانێ دگۆت: ل دەورێ بەرێ کچکەکا جوان هەبوو, لەشێ وێ حەز ژ گەنجەکی دکر, ئو دزانی کو برایێ وێ لبەرە وێ بکوژیت, لێ نەیا دوودل بوو, خوە دگەل دا رەڤاندن و بەرەف عەردەکێ دویر ژ باژێری بر. ئو دەمێ ساتۆرا لەرزوك ژێ نێزیك دبوو, کچکێ حەزەکا گریانێ و رەزیلیێ و لەزەتێ دچاڤێن برایێ خوەدا دیت, ئێکسەر نهێنییا وی یا ڤەشارتی زانی و کرە هەوار " برا .. برا " ئووووهه .. من گەنم و گول و دار و گیایێ کەسك یێ دایە مرۆڤان.

من گۆتە ئاخێ: هزاران شەڤ ل دویف ئێك بورین و من دەریا نەدیت.

ئو لسەر پێ خوە زڤریمەڤە باژێری, بەرەف ژوورا خوەیا نوی چووم, ئەوا من ل شوینا ژوورا کەڤن کرێ کری, من ژوورا خوەیا ئێکێ هێلا بوو.. چونکو من دوێ ژوورێڤە هەست ب گەفلێکرنەکا نەدیار و مژدار دکر, من هزار پێچە هەبوون, ژبەر هندێ خودانێن وێ مالێ حەز ژمن دکرن, ئەز – هەروەکو دگۆت – شەرمینم و سنجێ من یێ باشە, ژنا خودانێ مالێ ژمن داخواز کر کو هاریکاریا کورێ وێ بکەم دخواندنا ویدا, هەڤدەرا من .. خزمەتەك من ژتە دڤێت. کورێ وێ دژیێ چواردە سالیێ دا بوو, گەلەك لاو بوو, لێ خویشکا وی ژوی جوانتر بوو, چەند سالەکان ژێ مەزنتر بوو. من هەست پێ دکر کو ئەو گەنج ب شێوەیەکێ مژدار دبن کونترولا منڤەیە, ئو من دەسپێکر پرسیارا خویشکا وی کر. ل دەسپێکێ پرسیارێن من دسروشتی بوون, لێ پاشی کرێت و بێ سنج بوون: تە خویشکا خوە رویس دیتییە؟ تە رانێن وێ دیتینە؟ تە دەست کریێ؟ ئەرێ دنەرمن؟ مەمکێن وێ دمەزنن؟ تە تشتەکێ ژڤێ پتر دیتییە؟ ئەوێ گەنج ب شەلەژانی بەرسڤا پرسیارێن من ددا. دەمەکێ درێژ پێ نەچوو, من دیت ئەو یێ خوشیێ ب بەرێخودانا خویشکا خوە دبینیت و ب گەرمی بو من بەحسی پەسنێن جوانێن ڤەشارتی یێن خویشکا خوە دکر, رۆژەکێ ژ رۆژان .. خویشك و برا بتنێ ل مال بوون, من خویشك گرت و من هەولدا کو ماچیکەم, نەهێلا و بەرەڤانی ژخوەکر, من گۆتێ: ما تو ژبرایێ خوە شەرم دکەی؟ ئەو دێ هێلیت و نابێژتە کەسێ ژێ.. من بەرێ خوە دایێ, یێ زەر و پێتی بوو, کینەکا زیانبەخش دچاڤێن ویدا دکرە هەوار و ترسەکا نەدیار ئێخستە لەشێ من, ڤێ چەندێ وەل من کر کو ل رۆژا پاشتر خوە ب ڤەگوهێزمە ژوورەکا دی یا نوی.

ل بەرامبەر پەرتوکخانەکا بچویك راوەستام . من رۆژنامەك کڕی و یا گرنگلنك من ئەو بوو کو بەرپەرێن وێ گەلەك بن. ئو ئەز ژڤریمەڤە ژوورا خوە یا نوی. ل وێرێ من خوە لسەر پشتا خوە درێژکر. لسەر پشتێ من رۆژنامە خواند و من دراند و دپەنجەرکا دهنداڤ جاددێدا هاڤێت. پاشی پیچەکێ دژوورا خوەڤە گەریام و ل پشت جاما پەنجەرێ رۆژ چویچکەکا زەرا حەیری بوو. هێلینکا خوە بەرزە کربوو. ئوووهه .. کولی دخوینێدا شین دبن. جیهان شکەفتەکا تارییە. ئاڤ یا دویرە .

من هەولدا سترانا بێژم . لێ خەموکییەکا دڕندە ئەز بێدەنگکرم.. بلەز شەڤێ دادا. باران بارین. من خوە بەردا سەر جاددەیان. باران ب خوشیەکا نایاب یا بارکری بوو. ئو باژێر ژنکەك بوو هەردوو چاڤێن خوە نقاند بوون . ب لەزەتا وێ . سترانا بارانێ دگۆت .. ژنکەکە لەشێ وێ یێ پێگەهشتی رویسە و حەز دکەت بتنێ بژیت.

من ددلێ خوەدا گۆت: خوەزی خوینا من ژەهرەمار با ..

من زەلامەك دیت هێدی ب رێڤە دچوو بێی گوهدەتە وێ بارانا جلکێن وی تەر دکرن. ب گەرمی دنالی. من خوە ژێ نێزیك کر و من پرسیارکر: تە چییە؟؟! چاکیتێ خوە ئێخست. لەشێ وی یێ مشت بوو ژ برینێن کویر و درێژ. هندەك مشکێن قەبارە بچویك . سەرێن وان ژ دەرێن برینان دەردکەفتن. لبەر بارانێ و ب غار ژێ دویر کەفتم و گلوپێن زەر ب بێ سەروبەری ل هنداڤ من دبەلاڤە بوون . لبەر دەرگەهێ مالەکێ راوەستام . ژنکێن وێ مالێ دەهمەن پیس بوون. من ددلێ خوەدا دگۆت: " دڤێت خوە ڤەشێرم " ئەز چوومە دژوورڤە . من ژنکەکا ئەسمەر و بەشوش هەلبژارت. گۆتە من:

- بلەز جلکێن خوە بێخە . ئەز دجهێ خوەدا جەمدی مام. گۆتەڤە:

- ما تو شەرم دکەی ؟ وەکو کەسەکێ ب سنج من کرەکەنی و گۆتێ:

- ما کی دژوورا تەڤە شەرم ناکەت؟؟

- تو ژ ئاسمانی هاتی؟!

- تە چەوا زانی؟ ئو کێ گۆتە تە؟! ئەز یێ ژ ئاسمانی هاتیم. " ئەز ب تنێ نەبووم. هەڤالەك دگەل من بوو. شەهوەتا مرۆڤان ددەمارێن مەدا بوو.

- کا شاپەرێن تە؟!

- من شاپەرێن خوەیێن بەرزە کرین. باژێران دزین. دەریا بتنێ دێ شاپەران دەتە من.

- ئەگەر تە ئەز ماچیکرم .. دبیت شاپەرێن تە ، بو تە بزڤرن.

ئو دەمێ لێڤێن وێ خشیاینە ناڤ لێڤێن من ، ئێکسەر من هەست ب تامەکا سەیرکر ددەڤێ مندا ، من پیچەکێ ژنك ژخوە دویرکر و ب کویری من هێڤکرە دێمێ وێ یێ نەگەلەك جوان ، لێ گرنژینەکا دچاڤێن وێدا ، وەسا دهاتە بەرچاڤێن من هەروەکو ئاگرەکێ دویر دکەفتە بەرچاڤێن رێڤینگەکێ بەرزە ل بیابانەکا بەرفرەه . ب لڤینەکا ژخافلەتی و بێزارڤە من ئەو دەهمەن پیس کێشا ببەر سینگێ خوەڤە و ژدەرڤەی ڤێ ژوورێ باران ب بۆشی دباری ، وەختێ ئەز ژ ژوورا دەهمەن پیسێ دەرکەفتیم ژی باران هەر ب بەردەوامی دباری ، بو ماوەیەکێ درێژ ئەز مامە دبن بارانێڤە و پاشی من ددلێ خوەدا گۆت:

"بێ مفایە .. دەریا دویرە و شاپەر جارەکا دی هاتنە سوتن ". من تبابەکێ چاڤێن خوە گرتن و جیهان ل وی دەمی یا رەجفی و مژدار بوو ، دلێ وێ ب تامەزروویەکا دژوار لێددا .. ب ترس چاڤەرێیا هاتنا تشتەکێ نەدیارە ، بلەز بەرەف ژوورا خوەڤە چووم ، من کارەب هەلنەکر ، ب نەرمی من خوە درێژکر و مەزیقە ژ رادیویێ دباری. مەزیقە بلند بوو ، ئو دگەل بارینا بارانا ژ دەرڤەی ژوورێ تێکهەل بوو ، بلوورەکا خەمگین یا دنالیت ، ئو جۆقەك .. ئاوازەکێ مری ژ خوشیێ لێددەت ، بلوور هەر دنالیت و هەر دگالیت .. ئەز ژی چاڤ گرتیمە.. هەولددەم بیرا خوە ل رابردوویەکێ دویر بینم .. ناڤێ من حەسەنە .. لێ ژ کەڤندا من ئەڤ ناڤە نەبوو ، ژیانا من یا سپی بوو ، دەمەکێ رەشێ وێرانکەر دڤیا هات با .. ئو دەمێ رەش هاتی .. نە نە .. ، ئەز خوە بو کومەکا ئاخێ ناچەمینم ، ئو جیهانا سپی وەریا و کەفتە دناڤ جیهانەکا نویدا .. من زارۆکەك بەردا .. من دایك و بابەك دان ، هەولا من ئەو بوو کو وەل من بکەن ئەز ژی وەکو وان بژیم ، لێ ئەز ئەو دەمێ رەش بووم دناڤ بونەوەرەکێ ژ خوینێ و گوشتیدا .مەزیقێ کەرب و خەموکییا خوە نەما ، ئو بو سەمایەکا کەیفا سەرخۆش ، ب ساویلکەیی کەنیم ، من حەز ژ کەنیا خوەکر ، جارەکا دی کەنیم ، رابومەڤە ، من گلۆپا کارەبێ هەلکر ، ل بەرامبەری خودیکێ راوەستام و من سەحکرە دێمێ خوە ، ل دەسپێکێ بەرێخودانا سار یا چاڤێن من ، ئەز هنگافتم ، لێ بلەز من هەست پێکر کو یا ژ ناخێ من دەرکەفتی .. ئەزم بەرێخودانا سار و تاری .. دەریا دویرە .. ئەز وەستیایمە .. دێ زڤرمەڤە باژێرێ خوە .

## ( 3 )

ئها ئەڤە باژێرێ من یێ خازوك نڤستییە .. بەری بێهنەكێ من زەلامەكێ ترسیای دیت, گۆتە من: هندەك زەلامێن دلرەڤێن بیانی باژێرێ من یێ داگیركری, ئو ئەز شیرەتكرم كو ژێ دویر كەڤم, لێ خەرییبیا من بو باژێری ژ هەر ترسەكێ مەزنتر بوو. ئو ئها ئەڤە باژێرێ من یێ خازوك و نڤستی , بهارا زەڤی یێن كەسك یا مرییە, ژهەمی لایانڤە شویرهێن بەرا یا دورپێچكری. ئەز لەرزیم .. دەمێ من خوە نێزیكی دەرگەهێ باژێری كری, هندەك زەلامان رێكا من گرت , دێمێن وان دتاری بوون .. من گۆتێ: من دڤێت بچمە ژوور.. ئەز كورێ ڤی باژێریمە , من سەفەر كربوو.

ب پێترانكیڤە گۆتنە من: ئەڤجا تو كورێ ڤی باژێری یی ؟!...

ئەز نەبەردام هەتا چەند رۆژەك ب سەرڤە چوین , دەستێن وان یێن زڤر ئەز یێ كریمە بونەوەرەكێ وەسا , دبیت دلێ وی بچیتە ژنكەكێ و ماچیكەت و ژ عەشق دەست كەتە لەشێ وێ , لێ دێ نەچار بیت كو ب پەشێمانییەكا رەجفیڤە وێ بهێلیت. مال دبێ دەنگبوون , جاددە دنیڤ ڤالا بوون , عەردێ وێ پێلاڤێن هندەك زەلامێن بیانی دكەفتنە سەر, ئو دەرگەهێ وێ مالا ئەز تێڤە بویم یێ نیڤ ڤەكری بوو, چوومە ژوور.. دایكا من دكرە گری و پاشی دكەنی و پاشی تلیلی ڤەددان.. من ژێ پرسیاركر: كا بابێ من ؟! ب دەنگەكێ رەجفی گۆت: نانەك دزی .. دەستێ وی بڕی, نانەكا دزی .. دەستێ وی یێ دی بڕی .. پاشی رۆژەكێ زڤریڤە مال گوشتەكێ پرتكاندی یێ بێ سەر.

دادێ .. كا پرچا سپی یا بابێ من ؟ كا سمبێلا وی یا بۆش ؟ كا چاڤێن وی یێن كەهی و بێدەنگ؟ كەنیا وی یا سپێدە .. كا كەرب و كەیفا وی ؟ ئەز دێ ل دوریانێن جاددەیان راوەستێم و دێ دەستێ خوە درێژكەم , دێ چەند قرووشان خوازم. دێ سەرێ خوە ژ لەشێ خوە ڤەكەم و دێ دەمە جەندەكێ بابێ خوە .. بنڤە دایكا من . ئەگەر تو مری , دێ ب گەرمی كەمە گری , لێ دێ كەیفا منژی هێت چونكو دێ تەختێ تەیێ فرەه بو من مینیت. دایكا من گۆت:

– ئەوێن بیانی نانێ مە هەمیێ دخۆن.

– بنڤە .. دایكا من بنڤە.

– زەلامێن مە كۆلەنە.

– بنڤە.

– دوهی سەد زەلام كوشتن .. سەد زەلام , دارستانەكا كەسك بیانییان سۆت.

- بنڤه .. دایکا من.

بو ماوەکێ درێژ مامه بێدەنگ, برسێ ئەز ئێشاندم , من ب شەرمینی و رەزیلی گۆته دایکا خوە: ئەز برسیمه .

گۆت: ئەڤه چەندین رۆژه من تام نەکرییه خوارنێ .

دەرکەفتمه سەر جاددەیان, من ددلێ خوەدا گۆت: دڤێت بو خوە کارەکی ببینم , کارگەهـ و دکان هەمی ببوونه مولکێ زەلامێن بیانی. لبەر دەرێ کارگەهەکێ راوەستام و من گۆتێ: من دڤێت کار بکەم . خودانێ کارگەهێ کو ئێکێ بیانی بوو سەحکرە من و گۆت: تو یێ زەعیفی . من هەست پێکر , ئەز سەیەکم دڕەوم ژبو ئالیستنا هەستیکەکی, من گۆتی:

- ئەز یێ بێهێزم.

- هەرە .. تو یێ زەعیفی و بێ ئەدەبی , هەرە و بمرە.

بێ هیڤی نەبووم , ب بەردەوامی من رێك دشەقاندن و ل کارەکی دگەریام , من کومپانییەك دیت , فەرمانبەرەك دڤیا , من گۆته رێڤەبەرێ وێ: یا ژمنڤه من شیانێن پێدڤی هەنه کو ل کومپانییا وە کارکەم.

ب کێمکرنڤه گۆت: چ بیاڤێن کاری لنك مە نینن.

دەمێ ئەز ژ ژوورا وی دەرکەفتیم, فەرمانبەرەکی گۆته من: ئەگەر تە دڤێت کارکەی .. بلا پێلاڤا تە یا تەییسوك بیت و جلکێن تە دپاقژ بن و ریهێن تە دتراشی بن .. هەردەم بگرنژە , خوە گەلەك ب چەمینە , ب خوشکاندنڤە بێژە: فەرمانا تەیە ئەزبەنی .. فەرمانا تەیە ئەزبەنی. من گۆتێ: تو ب شیرەتێن خوەڤە هەرنە جەهنەمێ.

جارەکا دی ئەز کەفتمە سەر جاددان .. ئاهـ ئاهـ .. درۆژێن بوریدا بازێرێ من گولەك بوو ژ گولێن ئاسمینا ب مشەیی دحەوشێن مالاندا چاندی بوو, لێ پشتی پێلاڤێن وان زەلامێن بیانی پێ لێنای , دێمێ خوە یێ سپی یێ ژدەستدای. زارۆك نا کەنن .. یاریا ل کولانێ ناکەن .. ب بەران شەرێ ئێکودوو ناکەن, هەمی ژنك دەهمەن پیسن .. زەلام ب گرانییەکا رەزیلڤە ب رێڤە دچن .. سەرێن وان دچەمیاینە , دێمێ وان یێ زەرە و گەلەك ژ وانا ئەزمانێ وان یێ بڕی بوو .

ژنکەکێ سەحکرە من و ب خوەشی کەنی ، ب سەرسورماییڤە من لێنێری ، گۆتە من: تە ئەز نەنیاسیم .. ئەز سەلمامە.            سەلما .. کچکەکا جوان بوو ، لێ ئەو ژنکا ل بەرامبەری من ، دێمێ وێ یێ زەر و چرمسییە ، دەڤێ وێ ژی بێ ددانە.

من ب ترس گۆتێ: سەلما .. چ قەومییە؟!

- زەلامێن بیانی مێرێ من کوشتن ، ئو پشتی من جوانیا خوە ژ دەستدای .. وول کرنە من.

- تە هێشتا ئەز دڤێم ؟!

من ب کویری سەحکرە دێمێ وێ و پاشی ب دلرەش بوون ژێ بوریم بێی کو هیچ پەیڤەکێ ژی باخڤم. ئو پشتی بێهنەکێ دەمێ من زەلامەکێ پیر دیتی و هەولددا کو نەهێلیت زەلامێن بیانی کچا وی یا بچویك ژێ بستینن ، ئەز راوەستیام و ئەو پیرەمێر گەلەك وەکو بابێ من بوو ، من خوە دیت ب رەخ ویڤە و ب دژواری من شەر دکر. چ نەکێشا هەتا تفەنگکرینە دسینگێ مەرا و ئەز دتۆفانەکا ئاگریدا خەندقیم. ئو چ دیوار ل پشت پشتا من نەبوون. دەمێ ئەز ب هەلوەشیایی کەفتیمە سەر عەردێ رەق ، من عەڤرێن ژ کولیا دیتن ، ئاسمانێ شین یێ داگیرکری و دێمێ رۆژا زەر یێ نخافتی.

**( 4 )**

ئەرێ رۆژ هەر رۆژ سپێدێ دهەلێت؟ دادێ ئەز بێزارم .. ما پێن تە دئێشن ؟.. بەری نڤستنێ پێن خوە بکە دناڤ ئاڤەکا گەرمدا .. ئەرێ هندەك جاران تو دکەیە کەنی .. دادێ؟ گەلەك بکە کەنی .. ئەز نەشێم بکەنم یان بکەمە گری چونکو کرم و جردا پشێن من و چاڤێن من و گەوریا من یێن خوارین ، هندەك جلکێن هریێ بو من ب هنێرە .. ئاهە ئاهە ، دادێ .. گورِ یێ سارە و رۆژا دەریایێ یا دویرە .

*     *     *

# ئەوا ل وی باژێرێ نڤستی قەومی

### 1. ئەوێ دین ...

دەمێ مەلیکی بهیستی کو زانایەکێ بناڤ و دەنگدبێژنێ حەسەنێ کورێ هەیسەمی ل میرگەها وی دژیت ، ئێکسەر هنارتە ددویف را و کرە چاڤدێرێ گەرمکرنا کوچکا خوە و موچەیەکێ هەیڤانە یێ مەردانە بو تەرخانکرو گۆت: ئەو وەلاتێ بهایێ زانایێن خوە نەزانیت دێ مینیتە دتاریستانا نەزانیێدا. دیروکڤانان دەملدەست ئەڤ گۆتنە ب زێری نڤیساند .

رۆژەکێ هژمارەکا خوێندکاران لدور حەسەنێ کورێ هەیسەمی خرڤە بوون و ژێ داخوازکرن کو بو بێژیت کا چ تشتێ هیژایە مروڤ گیانێ خوە درێکا ویدا بکەتە قوربان. بێی ڤەمانی حەسەنێ کورێ هەیسەمی گۆتێ: چ تشت هێژای قوربانیکرنا ژیانێ نینە ژبلی زانستی و راستیێ. دەمێ ئەڤ گۆتنا حەسەنێ کورێ هەیسەمی گەهشتییە گوهێن مەلیکی ب تورەیڤیە گۆت: ئها هوسا دئاخڤیت ئەوێ مە ب مەردینی چاڤێ خوە دایێ. پاشی پرسیارکر: ئو مەلیك  ما نە هێژای خوە  قوربانیکرنێیە ؟

مەلیکی دگەل خوە بریاردا کو زەرگەهەکێ بگەهینتە حەسەنێ کورێ هەیسەمی ، لێ وی کەربا خوە ددلێ خوەدا هێلا و خوە بسەرڤە نەبر هەتا دەلیڤەك بو هەلکەڤیت . دەمێ حەسەنێ کورێ هەیسەمی هەست پێکری کو کەربەکا ددلێ مەلیکیدا هەی و ئەڤ کەربە گەفان ل ژینا وی دکەت ، ئێکسەر ل کوچکا مەلیکی ئامادە بوو، گۆتێ: ئەزبەنی من مزگینییەکا مەزن یا هەی! مەلیکی ب دلخۆشیەکا چێکری گۆتێ: مزگینی ! ئەز حەز ژ مزگینیا  دکەم، کا بێژە چییە ؟ حەسەنێ کورێ هەیسەمی گۆت: من ئالاڤەکێ نایاب یێ چێکری ، کو چ یێن وەك وی نەبن. مەلیکی ب ترانە پێکرنەکا ڤەشارتیڤە گۆتێ: ئەو ئالاڤ چییە ، ئەوێ سەیر و سەمەرە و بیانی!؟ حەسەنێ کورێ هەیسەمی گۆتێ : براستی ئالاڤەکێ سەیرو غەریبە ، ئەگەر تو حێشترەکێ بکەیە تێدا دێ بیتە فرەندەکێ مادەنی و دێ ژ بالندەکی باشتر فریت ، لبەر ڤی ئالاڤی رائێخا بای چ نینە و ئەگەر رم و شمشێران بکەنە تێدا دێ بنە بومبا و دەبابە ، ئو ئەگەر..... مەلیکی ئاخفتنا وی بری و پرسیار ژێکر: بومبا و دەبابە چنە ؟ حەسەنێ کورێ هەیسەمی گۆتێ: ئەو هندەك ئالاڤن دوژمنان دشکێنن وقەلاتێن وان وێران دکەن. مەلیکی ب دەنگەکێ پێترانکیڤە گۆتێ: ئو ئالاڤێ تە دکاریت چ دی بکەت؟ حەسەنێ کورێ هەیسەمی گۆت: ئەکەر هەسپەکی بکەنە تێدا دێ بیتە ترومبێل. مەلیکی ژێ پرسیارکر: ترومبێل .. ترومبێل چییە ؟ حەسەنێ کورێ هەیسەمی گۆتێ: عەرەبانەکا مادەنییە ، ئەو بخوە لسەر چوار خرخالێن مەتاتی برێڤە دچیت بێ کەسەك بکێشیت . ل وی دەمێ تبلا خوە درێژ دکرە حەسەنێ کورێ هەیسەمی .. مەلیك ب دلخۆشی گرنژی وگۆتە جڤاتا خوە: ئەڤ بەلەنگازە یێ دین بوی ، ب دیناتیەکا بێ دەرمان. نافچاڤێن مەلیکی

بونە گرێ و ب دەنگەکێ هشك دئاخفت. حەسەنێ کورێ هەیسەمی ژکارێ وی ئێخست و فەرماندا کو دمالا خوەڤە بیت هەتا دمریت . فەرمانا مەلیکی هاتە بجهئینان وحەسەنێ کورێ هەیسەمی ب دریژیا گەلەك سالان دمالا خوەڤە هاتە زیندانکرن, دەمێ مەلیك مری, حەسەنێ کورێ هەیسەمی ئازاد بوڤە وگەلەك کەیفا خەلکی پێ هات .. لێ دەمێ بهیستین کو هێشتا یێ بەحسێ ئالاڤێ خوەیێ سەیرو سەمەرە دکەتن ب پەشێمانی و خەموکیڤە سەرێن خوە دهژاندن .

## 2. رەڤین

ئەو زەلامێ ژکاغەزێن کەڤن چێکری, خوە تەسلیمی کێلبێن وی پلنگێ ژ دارستانێن تاری هاتی کر و پاشی بانگکرە پەیڤان , ب دەنگەگێ خازوکی گۆتێ: نانی بدە من .. پەیڤان بەرسڤا وی دا و گۆتێ: نان نینە .. ژ ستێرا خواست خوە ڤەشێرن, چانتایەکا مشتی کتێب هەلگرت و ژ مال دەرکەفت , گەهشتە بازاری , کتێب ل وێرێ فروتن و ب بهایێ وان نان و حەبکێن خەوێ و دوو قەرەنفل کرین .. ب دلخۆشی زڤریڤە مال , بەرانبەری خودیکێ راوەستا و ب هویری ماوەر دکرێ , زەلامەکێ خوین پێڤە دیت, خوە دیت کو بەرە بەرە دگەل دەنگەکی ژخوینبەرێن وی دەردکەڤیت یێ کەهی دبیت.
دئاسمانێ ژوورێڤە ب دوو شاپەرێن رەش دفڕی .. سەرێ خوە ب سەرشۆری چەماند و ل وی دەمێ ب لێنیرینەکا پێترانکی و سەرکەفتیڤە هێڤدکرە نانی و هەردوو قەرەنفلان حەبکێن خەوێ داعویران .
قەرەنفلەکێ گوتێ : تە چ کر؟ .. تو بویە بکوژ.
زەلامی گۆت : هش بە .. ئەگەر دێ تە هاڤێمە دتەنەکا گلێشیدا.
قەرەنفلێ گۆتێ : یێ ب ئەدەب بە .. ئەز نە قەرەنفلم.
زەلامی ب ئەزمانەکێ حەنەکیڤە ژێ پرسیار: تو کی یێ؟
قەرەنفلێ گۆت : ئەز پولیسەکێ نهێنیمە.
زەلامی گۆت : ئەز دێ ژتە باوەر کەم .. هەکو دین دبم.
قەرەنفلێ گۆت: خوە ب ئەدەب بێخە .. ئەگەر دێ تە گورێم و دێ پیستێ تە تژی کا کەم, هەروەکو باپیرێن من وەسا ل باپیرێن تە کری .
زەلامی چاڤێن خوە دانانە سەرێك, خەم تێ بوری و تەسلیمی حەبکێن خەوێ بوو, ئو دگەل خوە برە بنێ کویراتیەکا تاری و ل وێرێ هەفت مێش چێکرن .
مێشا ئێکێ گۆت: ئەڤرو بمرە , مادەم دێ هەر سوباهی مری.
مێشا دووێ گۆت: روندکێن تە بتنێ دێ گورێ تەرکەن.
مێشا سیێ گۆت: وەغەرا تە بو میرگەها ستێران , پێدڤی ب پاسپورتەکێیە چ جاران تە نابیت.

مێشاچواریێ گۆت:  ئەگەر تو ب رەڤی دێ ژ گورەکی رەڤییە ئێکێ دی.

مێشا پێنجێ  گۆت:  دێ جانگێ  تە ژ کاغەزێن زەر بیت.

مێشا شەشێ" گۆت: کەسەك ل جەنازێ تە ناچیت ژبلی کتێبان.

مێشاحەفتێ گۆت:  ئەڤرو رۆژا مرنا تەیە.

زەلامی دەستەکێ کەرب ڤەبوی بلند کر و داوەشاندە سەر هەر هەفت مێشان و هەمی پێکڤە هەرشاندن ,  پاشی بو ماوێ شەش رۆژان کاردکر کو ل رۆژا هەفتێ ببیتە مێشا هەشتێ,  ب دلخۆشی فڕی و چو دژوورا خواندنگەهێڤە , دەمێ گوهداریا دەنگێن زارۆکان دکر ب خوەشی دلەرزی , ئەوێن ب ئەڤینی هندەك پەیڤێن لسەر تەختە رەشی نڤیسای دخواندن. دەمێ ژنشکەکێڤە دادایە سەر مێزەکێ , زارۆکەکی ب لڤینەکا بلەز گرت و دناف تبلێن خوەدا پەرچقاند .. نەکرە ڤێژی ژبەر ئێشانێ  , لێ ب ئارامی ئاخینکەك راهێلا .

### 3. دارا هەیڤێن سور

هندەك زەلامێن بیانی  هێرش کرە زەڤیەکا مشتی داریرتەقال , ژنك گوللە بارانکر و زارۆکێ وێ ژبەر سینگێ وێ یێ پری شیریێ گەرم دویرکر , پاشی ڤەگوهاستە ژوورا تویژاندنێ – ئەو ژوورا مشتی کومێن ئاسنی . زارۆك گریا, زەلامەك لپشت مێزەکێ یێ روونشتی بوو , هژمارەکا زۆر یا کاغەزێن سپی لبەر بوون ,  خامەیەك دناڤ تبلادا بوو هەروەکو کێرەك ددەستاندا , تویژینەری گۆتێ: بنڤیسە .. ئەڤ زاروکە ژ پێشەمانیێ دکەتە گری چونکو عەرەبە.

پاشی گۆتە زارۆکی: دێ باخڤە و هەول نەدە درەوا بکەی یان ئینکاریێ بکەی , یا خویایە کو دەمێ تو مەزن دبی دێ دژی مە چەکی راکەی و دێ مە کوژی , دا زەڤیا مە ژ مە بستینی , ئەو زەڤیا بەری نهو یا تە.

ل وی دەمی کومێن ئاسنی ڤیژاند: مرن بو بکوژی.

تویژینەری گۆتە زارۆکی:  دادگەهێ تو ب مرنێ سزا دای .

کومێن ئاسنی دەسپێکر کورکەك لناڤ زەڤیێ کولاَ , ئەو زەڤیا مشتی داریرتەقال, زارۆك کرە د وێ کورکا لسەر عەردێ کەسك کولایدا , ئو ئاخ و بەر رادانە سەر.. زارۆکی ڤیژاند  ( دادێ ) هەموو ئەو خوینا ژ لەشێ دایکا وی دهات گەهشتێ .. دەمێ بویە بهار , زارۆك بو داریرتەقال .. ئو بەرهەمێ وێ هەیڤێن سوور بوون ... شەڤێن ب ئەلند دوور دسۆتن .

**4. نەء ..**

ئەو زەلامێ پیر ل بەرسڤکا خانی لسەر کورسیکەکا داری یا پێپك کورت روینشتی بوو ، پالا خوە دابوو دیوارەکێ رەنگسپی و چاڤێن وی دنقاندی بوون ژسەرخۆشیا تیرۆژکێن رۆژەکا گەرم ، دئاشوپێدا وە هزر دکر کو یێ بویە مەلیك و سەر بو دچەمیان و عەرد ژبەر تورە بوونا وی درەجفی .. هزرا کتکەکێ دکر دکوخی و دگۆت: ئەز دێ مرم چونکو جگارا دکێشم .. هزرا زارۆکەکی دکر دسۆت و ب هەوارکی گازی دکر ( دادێ ) .. دایکێ چ پویتە پێ نەدکر و لبەر خودیکەکا مەزن یا مژویلی خوەجوانکرنێ بوو. زەلامێ پیر دەمێ ڤەکرنا دەرگەهی بهیستی چاڤێن خوە ڤەکرن: دیت هەر هەفت کورێن وی یێن دهێنە ژوور مشار و دار و چەکوچ یێن ڤێ ، ژێ پرسیارکر: ئەو چییە ڤ هەوە ، کەسەکێ ژوان ب پەیڤەکێ ژی بەرسڤ نەدا ، بارێ خوە دانا بەرسفکا مال و دەست ب کارێ خوە کرن ، د بێدەنگو بوغومی بوون .

کالێ پیر ژێ پرسیارکر: ئەو چییە هوون چێ دکەن. پرسیارا وی ب بێدەنگیێ کەفت ، پێدا چووڤەو گۆت: وەسا دیارە هوین یێ سندوقەکێ چێ دکەن ، ب پێترانکیڤە کەنی و گۆتێ: ما دێ چ ل سندوقێ کەن .. دێ جلکێن خوە یێن کەڤن تێدا هەلگرن ، کورێن وی بەرسڤ نەدا و بلەز کارێ خوە دکرن ، کالێ پیر گۆت: ئەز دزانم دێ چ چێکەن .. هون یێ سندوقەکێ چێ دکەن دا خوارنێ تێدا ب هەلگرن ، ما بوچییە .. مادەم مشك نینن ، ئەڤە ژمێژە مشك ناهێنە مالا مە ، چونکو دزانن چ نینە بخون ، هەر هەفت کورێن وی دبێدەنگبوون ، ناڤ چاڤ گرێ و دبونمومی بوون ، لسەر کارێ خوە دبەر دەوامبوون ، کالێ پیر ب دەنگەکێ پر کەربڤەبوونڤە گۆتێ: وەی لەعنەت لسەر وەبن ، ئەڤە چ رەفتارە؟ بابێ هەوە یێ دگەل هەوە دئاخڤیت و هوون بەرسڤێ نادەن .. لسەر کورا فەرە رێزێ ل بابێ بگرن ، رەنجا من ژبو پەروەردەکرنا وە ب ئاڤێدا چوو!.. کالێ پیر زڤریڤە سەر چاڤ نقاندنا خوە و دئاشوپێدا هندەك زەلامێن سەرخۆش دیتن .. لسەر شوستەیان لبەر مرنێ بوون ، دنالێن و دگۆتن: چەند یا نەخۆشە ژیانا مە و دوماهیا وێ ! مە نڤێژ نەکرن ، مە رۆژی نەگرتن ، ئەم نەچوینە حەجێ ، مە زکات نەدایە.....

دەنگەکێ ستویر و نزم گۆتێ: هوین وەکو سا یێن ژیاین و وەکو سا بمرن.

بێدەنگییەکا ژنشکەکێڤە خوە بەردا سەر بەرسفکا مالێ ، کالێ پیر چاڤێن خوە ڤەکرن کورێن وی ژکارێ خوە ئەڤاڤ ببوون ، ب سەرسورماییڤە گازی کرێ: هەوە چ چێکر؟ سندریك ! کێ ژهەوە دڤێت بمریت؟!

کورەکی ژ کورێن وی گۆتێ: ئەڤ سندریکە بوتەیە .. کالێ پیر لێ ڤەگەراند: تو چ کورەکێ بێ ئولی ! هەردەم وەکو دینا دئاخڤی ، سندریك بومریانە و ئەز هەتا نهو ژی یێ ساخم و یێ بەرهەڤم ببمە مێرێ کچکەکا پازدە سالی. هەر هەفت کورێن وی هێدی و ب خەمڤە ژ بابێ خوە نێزیك بوون. بابی ب ترسڤە گۆتێ: وەچییە؟ هوون دین بوینە دێ چ کەن؟!..

دەمێ کورێن وی راکری و کرییە دسندریکێدا ، گەلەك بەرگری دکر لێ دەستێن وان یێن بهێز کالێ پیر ب بنێ سندریکێڤە نەلڤکر ، کرە گری و روندکا ریهێن وی یێن سپی و سەروچاڤێن وی یێن چرمسی تەرکر.. گۆتیێ: هوون ددینن .. کورەکێ ژکورێن وی ب ئارامی و هێدی گۆتیێ: دەم یێ هاتی کو تو بمری .. کالی پیر لێ خوری و گۆتیێ: هوون دزانن هوون چ دکەن؟ هون یێ بابێ خوە دکوژن، ما من چ کرییە هەتا هوون هو لن بکەن ؟!

کورێ ئێکێ گوتیێ: تە ئەم فێرکرین چەوا سەرێن خوە بچەمینن.

کورێ دوویێ گۆتیێ: تە ئەم فێر کرین، ئەو دەستێن زللەهان لە ددەن ماچی بکەین.

کورێ سێی گۆتیێ: تە ئەم ژجلکێن ژنکێ ترساندین.

کورێ چواریێ گۆتیێ: ئو دەمێ پیڤێن ژنکەکێ دبینین ، وەکی گورەیێن کەڤن لێ دهێین!

کورێ پێنجێ گۆتیێ: ل رۆژێن هورەبا ، تە ئەم فێری نڤستنێ کرین.

کورێ شەشێ گۆتیێ: نە مە رابردوویە و نە نوکەیە و نە پاشەرۆژ.

کورێ حەفتێ گۆتیێ: ئو ئەم نەوێرین ل ئاسمانی بنێرین.

کالێ پیر لێ ڤەگەراند: لێ ئەز نە مریمە!!..

کورێن وی چ پویتە ب گازیا وی نەکرن و بزمار دپێراخا سندریکێ قوتان ، ئو پاشی هەر پارچە قوماشەکێ نافمال کو بکێر ئالایەکێ سپی بهێت ، سۆتن و سندریك برە گورستانێ.

* * *

## برس

ئەحمەد نە مەلیك بوو.. ژچایخانەکێ دچوو ئێکا دی .. بێی کەسەکێ نیاس ببینیت، نەچار بوو قەستا هەڤالێ خوە یێ نیگارکیش بکەت، ئەوێ گەلەك هەژار، نیگارکێشی ب گەرمی بخێرهاتنا ئەحمەدی کر، خودان سنج و مەرد و جوانمێر بوو، مریشکەکا قەلەو یا سورکری لسەر کاغەزەکا سپی نەخشاند و گۆتە ئەحمەدی، بتنێ من ئەڤ خوارنە هەیە.

ئەحمەد ژدل کەنی و مریشك خوار، لێ وی حەز دکر کو دناڤ زەیتەکا تێکهەل ب سویرێن هویر گرێدا با، دەڤێ خوە ب پشتا دەستێ خوە پاقژ کر و دگۆت: سوپاسی بو خودێ.

ب گەرمی سوپاسیا هەڤالێ خوە یێ نیگارکێش کر. تبابەکێ بێدەنگما و پاشی ب گرنژینەکا فێلبازڤە گۆت: خوەزی ئەز سەرخۆش ببام.

- نەء !

- بوچی نەء ؟

- ئەز دژی مەیێ مە.

- بتنێ ژەمەکا بچویك.

- هیڤیا نەکە. هەر مرۆڤەکی پێدڤییە دوژمنەك هەبیت. ئو دوژمنێ من ژی مەیە.

- مەیێ چ زەرەر تێ نینە.

- چ مفا د هیڤیادا نینە. ئەز هەلویستێ خوە نا گوهورم.

ئەحمەد ژ هەڤالێ خوە یێ قەلس تورە بوو. ب تورەییڤە ژ مەرسەما وی دەرکەفت و لبن هەتاڤا تەباخێ مینا کالەپیرەکێ هزار سالی لسەر جاددەیان دمەشی. ب دەنگەکێ بلند دگۆت: ئاخ دایکێ.

هێشتا گەلەك ب رێڤە نەچوی راهژیا و هند بوو بکەڤیت. ب تەعدا چاڤێن خوە نقاندن. رۆژ بەرێڤە بوو.. تاریستانێ دادا. لوی دەمی هندەك دەستێن نەنیاس هاریکاریا وی کرن هەتا ل عەرەبانەکێ سوارکرین.

بهیست هندەك کەس یێ پستە پستێ دکەن. سەمیانێ مە. ئەحمەدێ مەلیك یێ نەساخە.

عەرەبانە ب رێکەفت. ئەحمەدی نە دەنگێ خرخالێن وێ و نە دەنگێ پێن هەسپا نە بهیستن. پشتی ماوەیەکی عەرەبانە راوەستیا. ئەحمەدی هەست ب هێزەکا ژنێشکەکێڤەکر. رابوڤە و ژ عەرەبانێ هاتە خوار. گەلەك خەلکی خو بو دچەماند. د تەلارەکا مەزندا ب ژوور کەفت. ل دورماندۆری وی.. هەمی خزمەتکار و پاسەڤان بوون.

- ئەز برسیمە.

ئەحمەد لسەر جهەکێ خۆش روینشت. خزمەتکاران بلەز سێنیەکا مەزن ئینا. دانا بەر و گۆتنێ: ئەڤە باشترین خوارنا لێنانگەهێن مەلیکینە.

ئەحمەدی پەردە ژسەر سێنیێ راکر. بچویکەکێ ساخ ئەو هەلنگفت.. تەزینك بسەر لەشێ ویدا هاتنە خوار. دڤیا ب رەڤیت. لێ دەستێن وی ب ساری گەهشتنە کێرکێ و چەنکالی. ب کێرکێ هندەك ژگوشتێ ملی ژێڤەکر. زارۆك ب دژواری دنالی و ددانێن مەلیکی ئەو پارچا گوشتێ تەرێ خوینەلۆ هویر هویر دکر.

ژنکەکا جلك رەش هات ، ب دەنگەکێ کزگریوکی گازیکر: تە کورێ من خوار ، ئەحمەدی ب ساری لێ ڤەگراند: دێ تە ئێکێ دی بیت.

- مادێ چەوا بێی زەلام من زارۆك بن؟

- زەلام گەلەکن.

ژنك کەفتە سەر چوکا و ژێ داخوازکر: زەلامەکی بدە من.

ئەحمەدی ئیشارەت کرە زەلامێن ل دورماندۆری خوە و گۆتێ: بو خوە بهەلبژێرە ، تە کیژ ڤان زەلامان دڤێت.

ژنکێ ب هویری هێڤ دکرە زەلامان پاشی گۆت: ئەوێ من دڤێت .. من هەلبژارت.

- کیبە؟

- تویی!

ئەحمەد دکاری فەرمانا برینا سەرێ وێ بدەت ، لێ ل وی دەمی گەلەك یێ دلخۆش بوو ، رابوڤە و دەستێ وێ گرت و برە دژوورەکێڤە ، هەر ل دەمێ دەرگەه گرتی ژنکێ ب هەردوو دەستێن خوە قرکا وی بلەزگرت و کەنییەکا فێلباز بەردا . ئو پاشی بوو مارەکێ رەش خوە لدور حەفکا وی ئالاند ، خوە لسەر حەفکا وی شداند ، ئەحمەدی هەوار کر ، دایکا وی د هەوارێ هات و ب تامەزرویی هەمبێزکر و گۆتێ: ها دەرمانێ خوە ڤەخۆ.

سەرێ خوە ب خەرییەکا کەڤنا هەلچۆی کرە دسینگێ وێ را ، ئێشانا وی پیچ پیچە نە دما ، چاڤێن خوە ڤەکرن ، خوە لسەر کورسیکا سەرتراشەکی دیت ، گەلەك خەلك لێ خرڤە بوینە و سەروچاڤێن وی دتەربوون ، ئێکسەرزانی کاچ یێ قەومی ، سەرتراش زەلامەکێ پرچ سپی بوو ، ب هەڤالینی بوو ئەحمەدی دگرنژی و دگۆتێ: هەکو تو لسەر جاددێ ب رێڤە دچوی ، دلبورینێ توگرت بوی.

ئەحمەد رابوو ژپێڤە ، سەرتراشی ژێ پرسیارکر: تو دشێی ب رێڤە بچی؟

ئەحمەدی سەرێ خوە هەژاند و دکانا سەرتراشی بجهـ هێلا ، جارەکا بتنێ پیاسە لسەر جاددێ دکرن ، ب رێڤە پیرەمێرەکی رێکا وی گرت و ژێ پرسیارکر: تو مالا دختور بەشیرێ بارودی ڤێ دکەڤی.

ئەحمەدی گۆتێ: نە ، پیرەمێری ب گازندەییڤە گۆتێ: پا چەوا تو عیادا وی ڤێ ناکەڤی؟ مانێ دختورەکێ گەلەك ب ناڤودەنگە. ئەحمەد دگرنژی و ب گرانی ددا رێ ، بادا کولانکەکێ ، گەلەك ئاڤاهی لبەر هەر دوو لایێن وێ درێز بوون.

چوو ددکانا بەقالەکیڤە و گۆتیێ: تو ب مالا دختور ئەحمەدیێ نیزامی دکەڤی؟

- من چ جاران ئەڤ ناڤە نە بهیستییە؟

- دختوریێ زارۆکانە, ئەز چومە نك ل عیادیێ, من نەدیت, سیستەریێ گۆت بو من یێ ل مال, مالاوان ژی لڤێ جاددێ یە, ئەز هیڤی دکەم , کوریێ من یێ بچووك یێ نە ساخە و رەوشا وی نەباشە.

- ئەز چ دختوران بڤی ناڤی نانیاسم.

ئەحمەدی ب مخابنی سەریێ خوە هژاند و ب دێمەکێ خەموکی مەشیاڤە .. خدامەك دیت ژئاڤاهیەکی دەردکەڤت, راوەستاند و گۆتیێ: ئەریێ تو مالا دختور ئەحمەدیێ نیزامی ڤێ دکەڤی؟

خدامیێ گۆت: ئەحمەدیێ نیزامی ... ئەحمەدیێ نیزامی؟! ...

- بەلێ .. ناڤێ وی ئەحمەدیێ نیزامییە, دختورەکێ زیرەکە, ژنکا من نەخۆشە و گەلەك یا پێدڤی وییە.

خدامیێ دەستێ خوە درێژکرە ئاڤاهییەکێ رەنگزەر و گۆتیێ: ئەو دوێرا هەڤە دژیت, لێ ئەز نزانم دکیژ قاتێدایە.

ئەحمەدی گۆتیێ مەمنون و بەرەڤ ئاڤاهییێ زەر چوو, ب ژوور کەفت و زەنگلا دەرگەهێ قاتێ ئێکێ لێدا, ئێکسەر دەرگەه ڤەبوو, سەریێ پیرەژنەکێ دەرکەفت, ئەحمەدی گۆتیێ: ئەڤە مالا دختور ئەحمەدیێ نیزامییە؟

- نەخێر.. ئەو ل قاتێ دوویێ دژیت.

ئەحمەد ل دەرەجکێن قاتێ دوویێ ب سەرکەفت و زەنگلا دەرگەهی لێدا, بێهنەکێ چاڤەریێ ما, پاشی زەلامەکێ سەرگژاڤژ دەرڤەکر, ئەحمەد ژێ پرسی:

- ئەڤەیە مالا ......؟

ئەوی زەلامی ئاخفتنا وی بری و گۆتیێ: ل قاتێ سییێ دژیت.

ئەحمەدی ب سەرسورماییڤە گۆتیێ: کی ل قاتێ سییێ دژیت؟

- ما تە مالا دختوری نەڤێت؟ ئەو ل قاتێ سییێ دژیت.

ئەحمەد ل قاتێ سییێ ب سەرکەفت بێی سەرسورمایی وی بەردەت, تبلا خوە دانە سەر کاپکێ زەنگلێ, چ دەنگنە بهیستن, کەواتە .. زەنگل یا ژکارکەفتی, ب دەستی داریێ دەرگەهی قوتا, دژوورڤە دەنگێ ژنکەکێ دهات دگۆت: هەی عفریت دێ هەرە دەرگەهی ڤەکە.

کچکەکا بچویکا سیس دەرگەه ڤەکر و ب سەرسورمایی هێڤ دکرە ئەحمەدی, ئەحمەدی گۆتیێ : کا ئەحمەد؟

- ئەحمەد ؟!

- دختور ئەحمەد.

- دختور ئەحمەد؟!

- بەلێ .. دختور ئەحمەدێ نیزامی.

- دختور ئەحمەدێ نیزامی ل ڤاتیێ ئێکێ دژیت.

- سوپاس خانم, ببورە من رەحەتیا تە تێکدا , مێرێ تە ل مالە؟

- مێرێ من ؟!

- ما تە شوی نە کرییە؟

کچکێ ب ترس هێڤ کرێ و دەرگەهـ گرت, بلەز ئەحمەد ژدەرەجکا هاتە خوار و ب غار چوو سەر جاددێ, هزر دکر پولیس دێ هێن و دێ وی گرن و دێ سەرێ وی ب پۆستالێن خوە پێن گران قوتن.

گەلەك ب رەحەتی بێهنا خوە هەلکێشا, دەمێ گەهشتییە دژوورا خوەڤە, ل بەرامبەر خودیکێ راوەستیا, گەنجەکێ دێم زەر و پێتی دیت, گۆتێ: ئەڤە تویی .. دختور ئەحمەد؟ ئەز گەلەك لتە گەریام, ئەز نەخۆشم, من فەحسکە.

دختوری گۆتێ: تو نەساخی ؟! باشە .. ئەز دێ ڤێ شیرەتێ لتە کەم , گوشتی و سێڤا بخو.

- ما خوارنا سێڤا بو من باشە.

- ئو دڤێت رەنگێ سێڤێ زەرەکێ بسەر سوریڤە بیت.

- ئو هرمیك.

- ئێك بتنێ بەسە.

- ئو تری.

- نە یێ خرابە, هندی تە دڤێت بخو.

سەرێ خو چەماند و ل ژوورا خوە گەریا کو تشتەکی ببینیت بهێتە خوارن, نیڤ نانا هشك دیت, لبن کتێبێن سەر مێزێ یا ڤەشارتی بوو, ب ئاڤێ تەرکر و هێدی هێدی خوار.. ئو خوە لسەر تەختی درێژ کر. هەر ئێکسەر دغای چوو, ژنکەکا جوان دخەودا دیت, ب دلوڤانی و ب گەرمی هەمبێزکر, گوشتێ وێ نانەکا سپی یا گەرم بوو.

*  *  *

# بوهارەك دناڤ خوليێدا

لسەر دەمێ بەرێ باژێركەكێ بچويك هەبوو, دناڤ نيڤەكا زەڤى و باغێن كەسكدا هات بوو ئاڤاكرن, رووبارەكێ بۆش دناڤدا بوو, هەمى خەلكێ ڤى باژێرى هەر ئێكى پارچەكا كاغەزا ستوير دبەريكێدا بوو, ئو هەر كاغەزەكێ ناڤەك لسەر هات بوو نڤێسين. خەلكێ ڤى باژێرى تێكهەلە بوون ژ هەژاراو زەنگينا, ئەوێن زەنگين دسوحبەت خۆش و باش بوون, دەرپوشێن سپى و پێلاڤێن بريقەدار هەبوون, دزانين كا چەوا ب نەرمى باخڤن وسەمايێ بكەن و ب جوانى خوە بچەمينن و دەستێن خانمان ماچ بكەن, زارۆكێن وان گەلەك ب نەرمى گازى دايكێن خوە دكەن: "ئو.. دا".

لێ هەژارێن ڤى باژێرى ددەمێن كەيفێدا ب دەنگبلندى و زڤرى دكەنن, گەلەك تف دكەن و وان باوەريا هەى كو رۆژەكێ دێ بنە مێڤانێن بەهەشتێ, ب دەنگەكێ هشك و لێڤ مچاندى گازى دايكێن خوە دكرن: "دايكێ .. "

هەژارا و زەنگينا هەردووان گەلەك رێزل مرى يێن خوە دگرتن, دەمێ جەنازەك دبوريت, خەلك رادوەستيت, خەم و ترس ژچاڤێن وان دپەشيت, هندەك ژى خوە بارەبوو دكەن و سندريكا جەنازەى بو ماوەيەكێ نەيێ كورت دهەلگرن, دەمێ پاريێ ئێكى دهاڤێنە ددەڤێ خوەدا ب ترس دبێژن: "بناڤێ خودێ يێ مەزن و دلوڤان" ئو پشتى ژخوارێ ئەڤاڤ دبن, دبن لێڤلێڤكاڤە دبێژن: "سوپاس ژبو خودێ .. ئەوێ سەميانێ هەمى عالەمێ".

دەمێ ژنكەك دباژێريدا گونەهبارييەكێ دكەت .. دێ ب كێركەكا دەڤ تيژ سەرێ وێ ژناڤ ملا ڤەكەن. پالا هەشت سەعەتان كاردكر. ئەڤيندار ب دزيكيڤە ل هولێن سينەمايێ دگەهشتنە ئێك, ل وێرێ ب گەرمى دەست دچونە دناڤ ئێكدا. نوشدار ژى لسەر شيرەتێن خوە يێن پر هەيبەت دبەردەوام بوون: "خوارنێ باش بجوين ... زوى بنڤن .. خوە ژ جگارەكێشانێ و مەى ڤەخوارنێ دوير بێخن". پيرەمێر ژى ب خەمگينى سەرێن خوە دهژينن و دبن لێڤلێڤەكاڤە دبێژن: "بێ سنجاتى يا بەلاڤ بوى .. ژنك پانتورى دكەتە پێ خوە و كور رێزێ ل بابێ ناگريت .. ئەڤەنە نيشانێن دوماهيكا دونيايێنە".

دەمێ خەلكى هەڤالێن خوە ددیتن ل سپێدەهييا دگوتنێ: "سپێدە باش" ..

سەرەرای وێ چەندێ کو ئەڤ باژێرە یێ بچویك بوو. لێ هەر رۆژ ل دەمەکێ دیارکری رۆژ لێ دهەلات و ل دەمەکێ دیارکری ژی لێ ئاڤا دبوو. هەروەسا شەڤەکا مشتی ستێرێن بریقەدار هەبوو. هەردەمێ هەیڤا سپی گەش ببا ستێر دا کز بن.

کەسەك لڤی باژێری هەبوو. ناڤەك لێ بوو. دێمێ وی قەرقودەکێ سەری بوو. چەرمەکێ پێتی و هشك ب هەستیکێن ویڤە نویسیا بوو. گەلەك دلێ وی دچویێ کو گولەك بیت. یان چویچکەك بیت. یان ژی عەڤرەك بیت حەز ژ وەغەرێ دکەت. هەرچەندە دزانی کو نابیتە گول و نابیتە چویچك و نابیتە عەڤرەکێ حەز ژ وەغەرێ دکەت. دسەر ڤێ هەمیێ را ژی هەر خەموکی نەدشیایێ. لێ .. ژ ژیانا خوە یا ب تنێ دخانیەك ڤالاڤە بێزار بوو. ددەمەکیدا ژ دەمێن خوە یێن بەلەك بریار دا کو ژنکەکێ بکرێت.
ژنکەکێ کو سەبرا وی بینیت و وێ ژەنگا ب رۆژێن ویڤە نویسای ب دەنگێ خوە نە هێلیت. وی زەلامی قەست کرە سویکا کەنیزەکان .. ژنکەکا چاڤ مەزن ژێگرت کو خەمەکا تێکهەل ب سحربەندییەکا پر مژداری دچاڤاندا دنالی. بهایێ وێ دا و ددلێ خوەدا دگۆت: بەلکی بشێت وی ژیژیێ گریوکیێ دخوینا مندا بکوژیت. دەمێ ب رێڤە. وی زەلامی ب چ پەیڤان ژی دگەل ژنکێ نە ئاخڤت. لێ دەمێ گەهشتینە مال ژێ پرسیارکر: ناڤێ تە چییە؟

ژنکێ ب دەنگەکێ نزم ونەرم ولەرزوکیڤە گۆتێ : ناڤێ من نەدایە.

ل وی دەمی زەلام ب رەخ ژنکێڤە یێ رونشتی بوو. هەردوو دەستێن خوەیێن زڤرو لەرزوك دانابونە سەر چوکێن خوە. خوینەکا کویڤی درژیا ناڤ دەمارێن دەستێ وی. ل وی دەمی حەز دکر کو ئەو ژنك لسەر پەراڤەکێ رەملێ یا رویس با. ل هەمبەری دەریایەکا شین باو مەمکێن وێ ب ئاڤا گەرم و سویرا دەریایێ تەر ببان. ب دەنگەکێ مشت دوودلی گۆتێ: تو ژکیژ وەلاتی یی؟

- من چ وەلات نینن.

ب کویری سەح دکرێ و پاشی گۆتێ: تویا جوانی.

دەڤێ وێ ئاژەلەکێ بچویك و نەنیاسی بوو. رەنگێ دەڤێ وێ قورمزی بوو. وەسا دهاتە پێش چاڤێن وی زەلامی کو دەڤەکێ ئێکانەیە. تبلێن وی گرژ بوون و برویسیەکا دژوار کەفتە ناڤ تبلێن وی. گۆتێ: ناڤێ تە ژی یێ جوانە.

ژنکێ ب گرنژینڤە لێ ڤەگەراند: ناڤێ من یێ دروست شەهرەزادە.

زەلامی ب سەرسورماییڤە گۆتێ: تو شەهرەزادی.

ژنکێ گۆت: ئەز شەهرەزادم. مرنێ ئەز نەبرم .. شەهرەیار مر.

زەلامی گۆت: شەهرەیار نەمرییە .. هێژ یێ ساخە.

ژنکێ گۆت: ئو .. سەمیانێ من.

- شەهرەزاد .. میرگەها من هەرفت.

+ ئەم ژێکڤە قەتیان.

- ئەم لسەر ڤی عەردێ مەزن بەرزە بوین.

+ ئەزل هەمی جها لتە گەریام.

- برسێ وەل من کر کو بکەمە گری.

+ ئەز ل ژوورەکا دەرگرتی هاتمە زیندانکرن.

- ئەز بومە خارۆك.

+ ئەز ل رێکا دچوم و ب عەبایەکێ رەش یا پێچای بووم.

- من ب نینۆکان عەردێ کولای.

+ ئەز وەکو ژنکەکا بتنێ ل هندەك باژێران یا ژیایم کو بتنێ زەلام لێ بوون.

- خەلکی یێ تف کرییە من.

+ هندەك زەلامان ئەز یا کریم .. گەلەك د زەنگین بوون.

- ئەز کەسەکێ هەژارم .. ئەی خودێ .. تە بوچی ئەز هێلام؟

+ ئاخ .. مە چەند نەخۆشی خوارن.

- ئاخ .. مە چەند نەخۆشی خوارن.

ب توندی چونە هەمبێزا هەڤ , گەلەك گریان وگەلەك نالین .. زەلامی ب دەنگەکێ کزگریوکی یێ مینا پستە پستێ دگۆتێ: من تو دڤێی .. من تو دڤێی , ب هەردوو چاڤێن خوە یێن مشتی روندك هێڤ دکرێ , شەهوەتەکێ دهناڤێن ویدا دکرە گازی ومینا کێلبا گەهشتە گوشتێ وێ کو نەشیا ژێ قورتال ببیت , لەشێ ئەوا مێ ب شەوق هەمبێزکر, دەمێ هەردوو دەڤ پێکڤە نویسیاین گازیەك ژجاددێ گەهشتە گوهێن وی: هێرشا دوژمنانە .. بکوژن .. بکوژن .. بو شەری. دەنگێ دەهولەکا پر چریسەت وکەربڤەبوی بلند بوو, نە دشیا پویتە پێ نەکەت , لەشێ مێ ب لڤینەکا مجد ژخوە دویر ئێخست. ژنکێ ب هیڤی گازی دکرێ: من نەهێلە .. شەری نەکە .. ل دەف من بە.

زەلامی گۆتێ : هش بە , کولانێن باژێری .. دایکا من .. گازی من دکەن.

شیرێ خوه یێ ب دیواریڤه هەلگرت و هور بوو جادێ کو زەلامان ل هنگوریا ئێڤاری هەڤ دکوشتن.

ئەو زەلام چوو ناڤ دلێ شەری و هەر سینگەکێ ل بەرامبەری خوە دیتبا، شیرەك دادوەشاندێ، گەلەك کەیفا وی دهات دەمێ دەڤێ شیرێ تیژ و درێژ دگوشتێ نەرمدا ب هێزەکا پر هۆڤێتی دچوو خوار. دەمێ شەر تەڤاڤ بوی، ئەو زەلام راوەستا و لەشێ وی هەمی ژ خوینێ وخوهێ تەر ببوو، دەمێ دیتی کو ئەو زەلامێ بتنێ یە مایە ساخ ترسەکا مەزن کەفتە دلی، ئو زەلامێن دی، جەندەکێن وان ب چیمەنتویا جاددێڤە وەکو کومێن گوشتێ پەرتاندی بوون. خوە ب سەر عەردێ خوینەلۆ دادا و ل وی دەمێ ئاگری خانی و کوشتی یێن باژێری دخوارن .. وی زەلامی گری و نالینەکا دژوار دکر.

دەمێ ئاگر نێزیکی وی بوی، گریا خوە راوەستاند و رەڤی بو ژدەرڤەی باژێری، زەڤیێن پان وفرەه بوون، ژ وێرێ هێڤ دکرە وی باژێرێ بویە گومتلەکێ مەزن یێ ئاگرێ گەش و سور دناڤ دلێ شەڤا رەشدا. کەفتە سەر گیایێ عەردی و چوو دخەوەکا کویردا. هشیار نەبوو هەتا رۆژا رۆژەکا نوی هەلاتی. ل هەر چوار رویا بێدەنگی بوو، باژێر ژی گومتەلەکێ مەزن یێ رەش بوو.. کادی ژێ بلند دبوو، وی زەلامی گوه ل گریانەکا کز بوو، هەرلدورخوە دزڤری هەتا چاڤێن وی کەفتینە سەر کچکەکا گەنج و لسەر گیای رازاندی. خوە ژێ نێزیك کر و ژێ پرسیارکر: تو بوچی دگری؟

- باژێر هاتە سۆتن .. هەمی مرن.

+ ئانکو کەسەك نەما.

ئەوێ کچکێ بەرسڤ نەدا .. لێ یا بەردەوام بوو لسەر نالینا خوە، جارەکا دی ژێ پرسیارکر: تو بوچی دگری؟

دێمێ خوە دناڤ دەستێن خوە دا ڤەشارت و گۆتێ: ئەز یا برسیمە.

زەلامی ئەو کچك بجه هێلا و چوو ل خوارنەکێ بگەرێیت، کەیفا وی هات دەمێ دارسێڤەکا بەروار دیتی و تاکێن وێ ب سێڤێن گەهشتیڤە قریا بوون. هندەك ژێ کرن و بوکچکێ برن، دەمێ وێ ب کولافکیانی دخوارن، وی ب دلوڤانی هێڤ دکرێ .. جارەکا دی بیریا هندێ کر کو گولەك با، چویچکەك با، یان ژی عەڤرەك با حەز ژ وەغەرێ دکەت. ددلێ خوەدا دگۆت: ئەرێ ناڤێ ڤێ کچکێ شەهرەزادە؟

کچکێ ب هچکێ خوە، دێمێ خوە پاقژ کر و ب سوپاسیەکا کویرڤە سەح دکرە زەلامی. دێمێ وێ یێ کەهی بوو، بیرا وی و بچویکاتیا وی یا بوری هات. ب خەمگینیڤە گۆت: ئەڤجا ژبلی مە کەسەکێ دی یێ ساخ نە مایە؟

کچك هەر یا بێدەنگبوو. لێ پیچەکێ لێڤێن وێ ژسەرێك رابوون و زەلامی گولەکا سور دیت . ئەو گول .. زەلامی کرو ب دوودلی بو وێ کچکێ پێشکێشکر. کچکێ ژی ب گرنژینەکا شەرمینڤە ژێ وەرگرت . خۆشی هشیارکر و وەلێ کرکو ددەمارێن وی زەلامیدا جوانترین سترانا بێژیت.

زەلامی هاریکاریا کچکێ کرکو رابیتەڤە . پاشی هێدی هێدی بەرەف باژێرێ رەش و مریڤە چوون . ژنشکەکێڤە گوهـ ل ویچ ویچا چویچکەکێ بوون . راوەستان .. چاڤێن وان ب درێژی ل هەڤ دنێرین. زەلامی وەسا هزرکر کو یێ گوهـ ل دەنگێ قەرەبالغەکا هندەك بچویکان دبیت کو تێکهەلەیە دگەل نالینەکا دویر.

زەلام وکچك ب رێکا خوە دچوون و دەستێن وان ب ئەڤینی و خۆشتڤییاتی دناڤێك را بوون.

ل بەرامبەری وان ژی رۆژ یا گەش و بریقەدار بوو.

* * *

# شهینا هەسپێ سپی

ژوورا وی زەلامێ وەستیای یا بێ چرا بوو. بێدەنگ. رەش . کارتوونەکا بچووك بوو ژ بەرێن شهدار. پشتی دەمەکێ درێژ و کومەکا دەمژمێرێن چەوراندنێ لسەر جاددەیێن خەندقاندی دناڤ رۆناهیا بەلاڤبۆی ژ سەراڤا دکانێن لسەر هەردوو لایان رازاندی و ژ ریکلامێن کارەبایی یێن هەمەرەنگ. بێی تامەزرویی ڤەدگەریێمەڤە ژوورا خوە. هینگی شەڤ سترانەکا زڤر و گەرم و درێژ بوو. ب دلسۆزی دتاریستانا شکەفتێن وێدا خۆشیا بوهارێ و هۆڤاتییا پلنگەکێ برسی همبێز دکرن. ئەز چەکچەکویلەکێ پیرێ کوورە و شاپەر شکەستی بووم. من خۆشی و نان ژ خوەرا نە ددیت. من نە دزانی خۆشی نانێ من ل کیڤەیە. هەر جهەکێ من قەست دکرێ هەرایێ ئەز دهەلنگڤاندم. هەرایا جانەوەرێن خشخشۆك لدورماندۆری من و لسەر شۆستەیان . گەلەك دترساندم. من ژمن دوور دکەت . ژ خالەکا رەش یا دناڤ

ناخێ مندا , یا تەزی و خەمگین مینا ستێرەکا مری. ئەز چ نینم ژبلی جانەوەرەکێ بەرزەبووی دناڤ باژێرەکێ کەڤن و مەزندا. ئەز نە دۆن جوانم. نە من ترۆمبێل هەیە و نە خانییەکێ بلندێ ل جاددەیەکا هەژار لێ نەژین. ئەنیا من شەملکا چ مزگەفتان ماچ نەکرییە. ئەز نە پەهلەوانەکێ کۆلانێ یان زۆرانبازییێمە. خواندەڤانێن رۆژنامە و کۆڤاران رەسمێ من نانیاسن. هەر رۆژ هەشت دەمژمێران کار دکەم. دوەستیێم. ب لەزاتییەکا سەیر خوارنێ دادعویرم. ب گەرمی پشکداریێ دگێنگەشەیێن ستەوردا دکەم. ب پارە یێن کێم قوماریێ دکەم. ب ساویلکەیی دکەنم و ب دویف کچکا دکەڤم. خەبەرا دبێژمە خۆدێ. هەڤالینیا قەحبەیان دکەم و ب خەمگینی چیرۆکا خوە یا دوماهیا وێ خەمگین دبێژم. گوهداریا سیمفونیێن سیبیلۆس دکەم. کتێبەکێ دخوینم و لسەر رێکێن لەولەبی دچەورم. ب کولافی جۆرێن نەباشێن مەیێ فرِدکەم , شەڤ.. بێی ڤان کریاران خەموکییەکا کارەساتییە.

ئو من هەست ب خەریبییەکا دژوارکر کو بچمە دارستانا خاڤبوونێ و گێژبوونێ و راهژیانێ. پی یێن من , ئەز برمە مەیخانەکێ کو پێکێن ویسکییەکا نەباش ب بهایەکێ ئەرزان پێشکێش دکەن. خۆدانێ وێ من دنیاسیت. ئەز ئەو سەرخۆشێ بێدەنگو خەمسار ڤەدخۆم. هەمی تشت دنەزان و بێ بهانە. ب لڤینەکا بێزارا دەستی .. پێکێ ویسکیێ ب فرەکێ من کرە هناڤێن خوە. پاشی ب پشتا دەستی .. من دەڤێ خوە پاقژکر. من دەسپێکر ماوەرکرە دورماندۆری خوە و نێرینێن من لسەر کەسەکێ سیما بێزار راوەستان , لسەر مێزەکا نێزیکی من روونشت بوو. بێن بێنە فرِەکا بچووك ل پێکێ خوە ددا و بو ماوەیەکێ کورت رادوەستا و پاشی ژنشکەکێڤە , دا بەر دەتە کەنیێ , کەنییەکا خەمگین .. خەمگینتر ژ گریێ , دەمێ چاڤێن من ب چاڤێن وی یێن داکەفتی کەفتین , من هەست ب ترسەکا ڤەشارتیکر. بو من دگرنژی , ئەز دێ رابمەڤە و دێ دگەل ئاخڤم.

من گۆت: ئەز پالەکێ هەژارم .. نا گرنژم.

گۆت: ب رۆژێ ئەز کۆتالفرۆشم و ب شەڤێ دەریاڤانەکێ موغامەرەچیمە.

من گۆت: ئەز حەز ژ دەریایێ دکەم. یا مەزن و مشت نهێنییە.

گۆت: پاش نیڤا شەڤێ .. دەمێ ئەز سەرێ خوە تەسلیمی بالیفکێ دکەم , پاپۆرا من ددەتە رێ. ئاخ خ خ .. دڤێ جیهانێدا چ تشت ژ دەریایێ و سەفەرێ و لێگەریانێ جوانتر نینە. شیراعێن پاپۆرێ دهژیێن و تو یێ شت راوەستای , سەربلند , بایێ شهدار یاریا ب پرچا تە دکەت , دەنگێ پێلا و بێهنا خوێ دچیتە دناڤ کووراتییا تەدا. دێ ب دلخۆشییەکا کویڤی کەنی , هەمی خەم تە یێن لپشت خوە هێلاین.

ددەمەکێ نێزیکدا .. دێ پی یێن تە کەڤنە سەر بەندەرەکێ تە نەدیتی و دێ هندەك کەسێن بیانی بینی. دێ ل مەیخانەکێ روونی و هێدی هێدی دێ مەیا دلڤەکەر ڤەخۆی. دێ گوهداریا مەزیقەیەکا سەیرکەی و دێ ژ نوو بی. دێ زارۆکینیا تە یا ژ تە ستاندی لتە ڤەگەریت. دبیت ژی تو دگەل کچکەکا چاڤ مەزن

سەمایێ بکەی, کو دکویراتییا چاڤێن وێدا شەهوەتەکا دین دشهیت. ئاخ خ خ .. تشتێن نەدیتی و نوو چەند دخۆش و جوانن.

من گۆت: سەفەر.. من دترسینیت. ئەز ب دیناتی حەز ژ بازێرێ خوە دکەم. جارەکێ ژ جاران چ نەما بوو بکەمە گری, چونکوبێهنا گولاڤەکا بیانی ژ جاددەکێ دهات, باران ب مەردینی دکەفتە سەر ئاڤاهی و چیمەنتۆ و دارێن وی.

گۆت: ئەوێن ساویلکە بتنێ حەز ژ بێدەنگی و تەنابوونێ دکەن.

من گۆت: هندەك جاران ئەز خەونان ب ژنێ و زارۆکان و مالەکێڤە دبینم , هیڤیا من ئەوە تەڤ خەونە بجه بهێت.

گۆت: تویێ دینی. بەرە بەرە دێ بییە کرمەکێ بێزار و نەشێی ژ قەفەسکا ئاسنێن ب رەڤی. بتنێ دەریا کەیفا من دئینیت , ئەڤ شەڤە دێ دگەل من هێی؟ جارەکا دی من پێك داسەر دەڤێ خۆ, گەوریا من ئەو ئاڤا دلڤەکەر وەرگرت و من ترانە ب ئاشۆپا خوە کرن, ئەزکەنیم, ئەو زەلامێ سیما بێزار هێشتا لپشت مێزا خوەیێ روونشتی بوو ڤەدخوار و رادوەستا و دکرە کەنی, ئەو کەنیا خەمۆکییا خەمگینتر ژ گرییێ, ئەز ژی هێشتا ب کورسیکا خوەڤە یێ نویسیای بووم, بێنەکا بتنێ ژی ژێ دوور نەکەفتبوم.

مەیخانە دێ دەرگەهێن خوە گریت, فەرە ئەز ژی بارکەم. دەمژمێرا زەرپەتخی مینا کێرەکا نەرم نێزیك دبوو, هێدی هێدی دگوشتێ لەشێ من دچوو. نەخۆشترین دەمژمێرێن نەساخ نێزیك دبوون, ئو جاددێ ژی پێشوازیا زەلامێ خوە یێ راهەژۆك دکر. ئەی ئەوێ سەرخۆش .. گوهدە وێ فیتکا درێژ و خۆش, ئەوا ب نازکی دلەرزیت و ژ دەڤێ وی گەنجێ ل پێشیا تە ب پێنگاڤێن جێگر و بارکری ب خوینگەرمییەکا سەیر دمەشیت. دبیت مرۆڤەکێ دلخۆش بوو بیت. بەری چەند سالەکا تو ژی وەکو وی بوی. تە دەزگرەك هەبوو, بازێرەك و خۆشی و لەزەت یێن تە بوون. لێڤێن وێ یێن ئەرخەوانی, ژبو بیابانێن تەیێن برسی دەرگەهێ گەنجینە یێن هشیارکرنا ئاگرێ نڤستی دخوینا تەدا ڤەدگرن. یێن تە بوون مەمکێن وێ, ئەو بەفرا گەرمیا تیرۆژکێن هاڤینێ پێڤە, یێن تە بوون چاڤێن وێ ب هەمی رازێن نەپەنیڤە, یا تە بوو پرچا وێ یا رەش, ئەو عەڤرێ خەموکیێ ب دامابیەکا سپەهی دادلەقیا سەرملان. تە دەزگرەك هەبوو, بازێرەك و خۆشی و لەزەت. ژ تە هاتە ستاندن. نوکە ژی تو سەرخۆشێ جاددەیەکا ڤالایی, تەقنەکا لسەرێك کومبوی, عەڤرەکێ بێ بارانی, یێ بتنێ وەکو سەیەکێ بازارێن رویت.

هەروەسا وەکو سەیەکێ بازارێن رویت ژی دژی. سپێدێ ددەمەکێ دیارکریدا دێ هشیار بی, ب خاڤوخرچی دێ لێڤێن خو مچینی و دێ باوشك هێنە تە. دێ چاڤێن خوە شۆی و دێ پرچا خوە شەکەی و دێ جلکێن خو کەیە بەر خوە, دەمێ تو دسەر جاددەیەکا سەرخۆش ب تیرۆژکێن رۆژەکا نویدا دمەشی, دێ نۆلا پیرەمێرەکێ چویی تفکەی, پاشی کارگەهە دێ تە دناڤ هناڤێن خوە یێن دەلرەقدا

ڤەشێریت .. وەستیان وەستیان وەستیان. هەولددەم کو بێهنا لەش سۆتنا وی کارکەری ژبیرکەم ، ئەوێ ئاسنەکێ حەلیای ب ئاگری ژ دەستان ڤەرستی و کەفتیە سەر؟ ئەو بێهن جیهانە. ئەی سەرخۆش تو بوچی دژی؟ بوچی نامری؟ دا چ کەم، ئەگەر من باژێرێن زێڕی هەبانە؟ یان ئەگەر ژنکەکێ حەز ژمن کربا، دا چ کەم ؟ یا ژمنڤە دا سەحکەمە تەییسینا پێلاڤا خوەیا نوی و ب بێزاری دابێژم:

– ئووف ... هەمی تشت دنەزان و بێ بهانە.

دێ مرم. پێنگاڤەك بەرەف پێشڤە و دێ رەڤم .. ژ وەستیانا کارگەهێ و ڤێژیا و دێمێن هشك، ئەوێن خۆشیا کەهی و دچاڤێن مندا ڤەشارتی ددزن. دێ مرم. پێنگاڤێن من لسەر شۆستەیان دکەنە غار، دکەنە غار.. دکەنە غار، بوشایی یا ژووری دێ من داپوشیت. دێ مرم. من دەسپێکر حەبکێن هویر و حلی من داعویران و ئەز دگرنژیم ، گرنژینەکا تولڤەکرنێ، ئەو بتنێ دکاریت من ژبێچارەییێ رزگارکەت .. دێ من مرینیت ، بێی جلکا ژبەرخۆ بکەم ، من خۆلسەر تەختی درێژکر و جیهان ب ڤێژیێن خوە یێن کرێتڤە ژمن دویر دکەڤت، خالا رەشا دناڤ وژدانا مندا ڤەشارتی، دێمجامە یێن خۆ ددراندن. ب بەردەوامی گەشە دکر .. هەتا کو بویە تەڤنپیرکەك، نەشیام خوە لبەر ڕاگرم وکەفتمە دناڤ لەپێن وێ یێن نیسەکدا .. خوە دمن ئالاند و نەهێلا بلڤم.

دەمێ دەرگەهـ ڤەبوی پیچەکێ کەیفا من هات و ب دلخۆشی گرنژیم. هەسپێ من یێ سپی زڤری. خوە نێزیککر و ب رەخ منڤە راوەستا، ئەز دشیام بێهنا پیستێ وی هەلکێشم ، ئەو بێهنا بارکری ب بێهنا ئاخێ .. ئەو ئاخا دگەریانا خۆیا درێژدا لسەر دمەشی. دەمێ من شهینا وی دبهیست، ئەز درەجفیم، ئەو شهینا ئەز داخواز دکرمە نك خوە، ئو ئەز نە دشیام بجهـ بینم، دوی دەمیدا من هەست ب مژداریەکا سەیر دکر، هەروەکو ئەز جەندەکەکێ بسەر ئاڤا رووبارەکێ تەنا کەفتیم. ئاهـ ... چەند دلێ من دچویێ هەسپێ من یێ سپی و ڕەڤی بزڤرێتەڤە و لێ سوار ببم و هەفساری وی بەردەم ، داکو من ل بیابانێن بێ ئاسۆ بگێرینیت.

جارەکا دی ژی شهینا وی بلند بوو .. ئاخ دێ بتنێ وەغەرێ کەت ئەگەر ئەز دگەل نەچم. دێ بتنێ چیت. من گوهـ لێ بوو دەرگەهـ هاتە پێڤەدان و دەنگێ سمێن هەسپی ب تۆڕەبونڤە رویێ عەردی دقوتا و شهینەکا خەمگین بەرە بەرە کێمڤە دبوو، دویر دکەفت.

من گۆتە خوە: جارەکا دی ژی دێ خوە لێگرم. دێ زڤریت. دێ ژ تنێیاتی و ئاوارەبوونێ بێزار بیت.

دەنگێ ژنکەکێ هاتە گوهێن من: خەمگین نەبە. لەشێ من یێ گەرم دێ جیهانێ هەمیێ ژبیرا تە بەت.

ب ترسەکا ڤەشارتی و ب سەرسوماییڤە من گۆت: تو کی یێ؟

کەنی و گۆت: ئەز هەڤالا زارۆکینیا تە مە. بیرا تە دهێت ؟ دەمێ ب کەیف تە خوە ب منڤە دشداند و ب شەرمینی تە ئەز ماچی دکرم.

من گۆت: من دسەردا نەبە. تو ڤەحبەیەکا پیری.

بوماوەیەکی، ب مەندەهۆشی لمن دنێری، پاش بەرداگرییێ، گریەکا دلسۆز، ئەز تێکچووم و دلسوزیەکا دژوار ئەز گرتم.

من ب شەلەژانی گۆتیێ: لمن ببەخشە ... من تو دڤییێ.

گۆت: کابێژە ڤە.

من گۆت: من تو دڤێی ... من تو دڤێی.

گۆت : دەمی تو ڤێ ئاخفتنێ دبێژێ، ما تو هەست پێ ناکەی کو کەسەکێ جوان و هەژی یێ دتەدا دبیت ؟

من گۆت: چ دناڤ مندا نینە ژبلی تەڤنپیرك و گۆڕێن ڤالا.

ژکەربڤە گۆت: ئەز حەز ژگوڕان ناکەم. کەربێن من ژ تەڤە دبن. کەربێن من ژ هەمی جیهانێ دڤەبن.

من چاڤێن خوە دانانە سەرێك و من هەست ب وەستیانەکا سەیر دکر. دەدەمەکێ کورت و بلەزدا ئەڤ جیهانە بچووك دبوو.. هەتاکو بویە بەرەکێ مەزن و ژ فەزایەکێ ڤالا یێ بێ عەرد پەشی، ئەز بتنێ ل هەمبەری کەسەکێ کرێت مام و بنك منڤە دهات. شیرەك ددەستاندا بوو. دەڤێ وی د تەیسی. گۆت:

دێ تە کوژم. ئەڤ شیرە یێ کەڤنە و هەر شەڤ قوربانیەك هەیە.

من گۆت: وەکو باژێرێ منە.

گۆت: دێ تە کوژم. رۆژەکێ ژ رۆژان قوربانی نامینن، ژبلی من کەسەکێ دی نامینیت. ل وی دەمی ئەز دێ بمە قوربانیێ شیری، داکو ئەڤ شیرە هەر کوبار و هەژی بمینیت. دێ تە کوژم. دەمێ ئەڤ شیرێ رەق دناڤ گوشتێ تە یێ نەرمدا دچیتە خوارێ، دێ هەست ب تاما لەزەتەکا نووکەی. خوە نێزیکی من کر و گرنژینەك لسەر دەڤی بوو، هەر چەندە ئەڤینی و هەڤالینی، ژگرنژینا وی دباری، لێ ئەز ژێ دترسیام.

لەشێ من پاشڤە زڤری و دناڤ لێهمشتەکا لەرزین و ئێشانێن دەربوی ژ ترسەکا بێ پەردەپۆشدا درەجفی، ئەز زڤریمەڤە زاروکینیێ و من ل کولانێن تەنگوخواردا دکرە غار. زارۆك ب دلخۆشی دکەنیت و هەمی تشتان ب تامەزروی یا دایکێ همبێز دکەت. ئاخ .. خوەزی ئەز مەزن نە ببام. ئەزشکەستم بەری بوونێ. شیرێ جەللادەکی بو من ما .. کولکێن دوهی یا خوە من سۆتن. سوبەهیا خوە من فرۆت. ئاهە .. دایکا من، بەخچەیێ ئاسمینان ددلێ مندا دمرن. دێ پیر بم. ئاهە .. ئەی ستێرا من یا ڤەمریای لسەر روخاما رەهنێن ژنکەکێ. ئاهە .. دێ کەنگی مرن پیر بیت! رووبارێن قورمزی ب بێدەنگی لسەر زەڤییێن من یێن رویس دنالن. بلوورا شەڤێن زڤستانێ ب نازکیەکا سەیر دبستریت. سەماکەرەکا سپی دناڤ مژەکا شیندا دگەڤزی. بلبلەکێ بریندار لسەر تایێ دارلیمۆیەکێ دبستری، بێهنا وێ تورەکا کەسك ماچی دکر. هەسپێن وەستیای لسەر چیمەنتویەکا تەییسۆك نڤستینە. ئەلند وەکو سێدارێیە. ژنك سێڤا

دخۆن و ب روویسی لسەر نڤینێن ئارمیشی دڕازێن. زەلامێن ژقورمکێن جگارا. هاڤین تبلێن خوه یێن رەق دخوینا من یا رەجفیدا دچینیت و ل هنداڤ باژێرێن وێرانکری دکەته غار. لێڤێن ته ... ئوی دلبەرا من یا هەژار. مەیخانەکا دامایی یە زەلامێن ژ بەندەرێن دوور ڤەگەریای لێ ڤەدحەویێن. فیتیا ترێنەکێ دجاددەیەکا ب قەرەبالغدا یا سێ ئێڤەلی تێدا ژهەڤ پرسیار دکەن: ئەڤ شەڤە دێ چەوا شیڤێ خوین؟ من تفکرە سەر وێ برسا عەڤرێن قەرەنفلا ب کەن ل سێداریێ دای. ئەزێ دوو مەمکێن تەزی خۆم. نینوکێن من یێن زەر دێ ژ سینگێ کچکەکا مری کێشنە دەر. خودێ یێ باژێرێ من نانە. دلبەرا من جوانە وەکو نانی. مەلوولە وەکو گریا زەلامی. گەش ببە ئەی دێمێ وێ یێ دامای. ئەی سپێدەیا وەستیای. فیتیا ترێنی. بخاترا وە .. بخاترا وە. رەنگێ هشك دبیتە رتمەکا گەرم و ب شاپەر. دونیا دەرگەهێن خوە بو بوهارێ ڤەدکەت. ئاسمان کەسکە .. ئاخ یا کەسکە. چیا دکەسکن. عەڤر دکەسکن. دەریا کەسکن. خەم کەسکە. ئەز یێ کەسکم .. بەلەکم.. رەشم .. هەمی تشت رەشە .. ب تامەزرویی برین سارێژا خوەیا زەر ددرینیت ژ بوو پێشوازیکرنا کومەکا ماچێن مرییان. زەنگلا دەمژمێرێ لێددەت. ددەته خویاکرن کو کویڤاتییا نیڤا شەڤێیە. مالا زارۆکان خولییە. ئەی پاییز من ببە ناڤ دارستانێن بێهێزی و روندکان. لێڤێن زەبەللاحی. پی یێن رویسن ب مێشان قەیدکرینە. ئو دناڤ چاڤێن دلبەرا خوەدا. ئەو چاڤێن دناڤ رەملا بیابانێدا. من ترومبێلێن بارکری ب مرییان دیتن .. بێ قەرەبالغ دبورین. شەمالکێن پەنجەران ڤەمرینە. ئەی دایکا من ل هیڤیا زڤرینا من نەبە. ئەز نەشێم برەڤم. دەرگەه گرتییە. ئەی چەکچەکویلەیێ باژێری. باژێرێ من. لەشێ من بو سوهتنا خەنجەرا تەیە. دبیت ئەز شیا بم هزرێ درەڤینێدا بکەم.

دوی دەمیدا .. من گوه ل شهینا هەسپێ خوە یێ سپی بوو. بلەز زڤریڤە. من من باوەر نە دکر. دێ هەڤالێ وی یێ هەتا هەتایێ بم. زەلامەکێ پیر. رویێ وی یێ چرمسی بوو.. مینا تویفکلێن دارەکا پیر. گازی دکر: "خەلك دباشن .. خەلك دباشن".

من پر حەز دکر وەکو دینەکی بکەنم. لێ بیابانێن کەسك. ئەوێن بێ ئاسۆ. ب تامەزرویی گازی من دکر. گازی وی زەلامێ وەستیایی و هەسپێ وی دکر.

ل جهەکی ژڤێ دونیایێ هەیڤ دەرکەفت و رۆناهیا وێ شینەکێ سار بوو. مەزیڤەکا رێتما وێ زڤر بلند بوو. کومەکا مەزن ژ بوڤێن فافونی ڤێژی یێن کویڤی و نەرێکوپێك بەردان. هەولدان بگەهنە بلندترین کوپی. لێ بێدەنگیێ شکاند و ژبلی کەمانەکا بچویك و نەرم چ دی نەما. بتنێ و ب لەرزوکی دنالی. هینگی. ئەو زەلامێ وەستیای ب درێکیڤە ژ باژێری دویر دکەفت و لسەر پشتا هەسپێ خوە یێ سپی یێ سوار بوو.

# ئەوێن ژ شکەفتێ دەرکەفتین

- **یێ ئێکێ**

مە هەوارکرە خودێ و مە روندك باراندن .. مە هیڤی ژێ کرن کو ئەوێن نە زڤرن بومە ب زڤرینیت, دەرگەهێ مالا مە نە یێ ڤەکری بوو, ئو مە نە دزانی ئەو پیرەکالێ بیانی چەوا هات بوو ژوور.

مە لدور کەلەخێ دایکا خوە یا لسەر تەختی مری دکرە گری, درێکا روندکێن خوەرا مە ب ترس و نەرازیبون و سەرسورماییڤە هێڤ دکرە وی زەلامێ پیرە مێر. ژمە پرسیارکرکا مە چییە؟ مە گۆتێ: دایکا مە یا مری و ئەم سێوی هێلاین, مە دیت کو وی گومان دئاخفتنا مەدا هەیە, مە سویندخوارکو مرییە, نوشداران بریارا مرنا وێ دایە, ب پێترانکیڤە ب ئاخفتنێن مە دگرنژی, دەستێ خوە ل ملێ دایکا مەدا , چاڤێن خوە ڤەکرن, باوشك هاتنێ و ژسەر تەختی رابوڤە, ژمە گەنجترلێهات, گەلەك کەیفا مە هات, مینا کەیفا وی کەسێ ژمرنێ دزڤریت, لێ پشتی دەمەکێ کورت مە ژێ پرسیارکرکا دێ چ بومە لێنیت, ب مە کەنی و گۆت: چ تشتێ خوارنێ ل مال نینە. مە ب شەرمینی هێڤکرە وی پیرەمێری, دەستێ خوە دانا سەرزکێ خوە وگۆت کو هەرژدەمێ هەبوونا وی چ نە خوارییە, دلێ مە پێ سۆت و دلێ مە ب مەژی دسۆت, مە هەست پێکرکو ئەم سێوینە .. هەرچەندە, دایکا مە هێژیا ساخ بوو. ئەوا مە هەست پێکری نە وەهم بوو.

- **رۆژا نوو**

بیستان یێ کەسك ومشتی دارو ئاڤ بوو, ژنشکەکێڤە دەنگێ زەلامەکی ژجهەکی دهات, ب لێڤ موچکانی دکرە گازی: "محەمەد .." من نە بەرسڤ دا و نە پویتە پێکر, چونکو ناڤێ من ئەحمەدە, ئەز مامە روونشتی لسەرگیایێ کەسك و من پالا خوە دابوو قورمێ دارەکێ. ژنشکەکێڤە زەلامەکێ کەلەخ

مەزن لبەرامبەری من راوەستا, یێ بوغومی و جلك پیس, ب تنگژینڤە ژمن پرسیارکر: ما تو یێ کەڕی؟

من چ کێماسی دگوهێن خوەدا نەبوون, من گۆتیێ: سوپاس بو خودێ گوهێن من دساخ و سەلیمن.

گۆت: مادەم تە گوهـ لێ دبیت, تو بوچی بەرسڤا من نادەی؟ دەنگێ من کەفت هندی ئەز یێ گازی دکەمە تە.

من گۆتیێ: ناڤێ من ئەحمەدە, نە محەمەدە.

گۆت: ما چ فەرقە, محەمەد و ئەحمەد و عەبدلا هەمی ناڤن.

من گۆتیێ: تە بوچی دڤێت ئەز د هەوارا تە بهێم و ئەز تە نانیاسم.

گۆت: تو من نانیاسی؟!... نهو وەل تە هات کو من نەنیاسی.

من گۆتیێ: سوپاس بو خودێ, بیردانکا من یا بهێزە و ئەگەر ئەز کەسەکێ ببینم, ب هەمی ژیانا خوە ژبیرناکەم, بیرا من ناهێت کو رۆژەکێ من تو دیت بی.

پشتی کەربا وی زێدەتر لێهاتی گۆتەڤە: ئو تو دبێژی کو چ جاران تە ئەز نە دیتیمە, من قەد باوەر نە دکر دەمێ دگۆتن, هندەك جاران خوین دبیتە ئاڤ و برا خوە ل برای ناکەتە خودان.

من گۆتیێ: ما تو برایێ منی؟

گۆت: دبیت تو دین ببی, هەلبەت ئەز برایێ تەمە, بەری بێهنەکێ مە پێکڤە دار دکێشان, تە شول هێلا, دا پیچەکێ بێهنا خوە ڤەدەی, چونکو پەرسیڤێ لتە.

من گۆتیێ: هێڤکە من .. نە ئەز برایێ تەمە و نەچ پەرسیڤ ل منە.

زەلامی ئیشارەتکرە مالەکا ئاخێ یا نە گەلەك دویر و گۆتە من: بێژمە دایکا مە کو بهێت شەهدەییێ بدەت؟

من گۆتیێ: دبیت برایێ تە وەکو من بیت, ناڤێ من ئەحمەدە و ئەز ماموستایێ خواندنگەهێمە, ئەز یێ هاتیمە ناڤ ڤی بیستانی سەیرانێ, دایکا من یا مری و من چ برا نینن, ئەز بتنێ دژوورەکا ب کرێڤە دژیم, بەری چوار هەیڤ و سێ رۆژان من یا کرێ کری. ب دوو چاڤێن مشتی کەربوکێن ماوەر دکرە من و ژمن پرسیارکر: تە ئەڤ جلکە ژکیڤە ئینانە؟ تە ژکیژ هەژاری دزینە؟ وەکو هەر جار تو گوهداریا شیرەتان ناکەی و تە ئەڤ رەفتارا دزیێ نەهێلا.

من گۆتێ: ئەڤە جلکێن منن ، من ژ معاشێ خوەیێ کرین ، من دهەمی ژیانا خوەدا دزی نەکرینە.

ئەو زەلام ب پێترانکیڤە کەنی و گۆتە من: تە دڤێت من بخوە بدەیە نیاسین؟ ئەز تە دنیاسم ، هەروەکو ئەز پانیا دەستێ خوە دنیاسم. پاشی ب ئەنی گرێییڤە گۆت: هلو هلو کار بکە ، من ئەو وەخت نینە ب ترانا و بهیستنا گۆتنێن دیناڤە پویچکەم.

وی زەلامی ئەز ژ ملیڤە راکێشام و ئەز بلند کرم ، نەچار بووم رابمە سەر پیا و دگەل بچم. ئو هوسا بو من برایەك و دایکەك و مالەك و کارەکێ نوی چێبون ، ئێدی ئەز نە دچومە خواندنگەهێ ژبو فێرکرنا قوتابی یێن خوە ، ئەز ژ وان و کتیێین خوە یێن لسەرێك کومبوی دژوورا منڤە. یێ خەریب بویم ، لێ روژەکێ من رۆژنامەکا هاڤێتی دیت ، بو من خویا بو کو ئەز خواندنێ ژی نزانم.

- **پیشە**

ئەوێ پولیس ب رویساتی ، لسەر تەختی ببەر ژنا خوەڤە یێ درێژکری بوو. هێڤ دکرە ژنا خوە ، هەروەکو چ جاران نە دیتی ، گەلەك جوان و ژێهاتی بوو ، دەمێ ب رویساتی دکەنی ، دەمێ دلەرزی و رەنگێ پیستێ وێ یێ سپی دهاتە گوهارتن وخوە دزەلامی وەردکرو تێر دبوو.. جوانیا وێ زێدەتر لێ دهات و هێشتا جوانتر لێ دهات.

ب تبلێن لەرزوك دەست کرە گوشتێ وێ یێ تەڕ و گۆتێ: ئەڤرۆ تە چ ژ هەڤدەران بهیستییە ؟

دەستێ وی راکرو دانا سەرمەمکێ خوە و گۆتێ: هەڤدەرێن مە سەلما و مەیادە لێك کەفتبون.

دەمێ دەڤێ وی نێزیکی مەمکێ وێ دبوو ، گۆتێ: بو من بەحسێ وان بکە ئەوێن دهاڤنە حکمەتێ . یان ژی ئەوێن چوینە دپارتەکا دیدا.

وێ گۆت: راوەستە تو من دئێشینی.

وی گۆت: بابەتی نە گوهورە.

وێ ب بهێن کورتکیڤە گۆت: من بهیست ......

وی گۆت: تە چ بهیستییە ؟

وێ گۆت: مێرێ هەڤدرامە ...

وی گۆت: کیژ مێری وکیژ هەڤدەرێ ؟

وێ گۆت: هەڤدرا مە .. دایکا محەمدی ...

وی گۆت: ئو مێریٚ ویٚ بابیٚ محەمەدی ، ئەز دنیاسم ، چ لیٚ هاتییە ؟

ویٚ گۆت: دەسپێکرییە ، نڤێژا دکەت.

وی گۆت: سوباهی هەرە سەرا دایکا محەمەدی بدە.

ویٚ گۆت: دیٚ سەرا دەم.

وی گۆت: ب شارەزایی ژیٚ بزانە، کا بوچی مێریٚ ویٚ نڤێژا دکەت، ژبو موسلمانەتیێیە یان ژی چویە دناڤ رێزێن پارتەکێدا ، ل وی دەمیٚ درەجفی و دەستێن ویٚ ب تلکێن ویڤە شدیاین و نە هێلای بلڤیت ، دگۆتیٚ: ئەمریٚ تەیە .. ئەمریٚ تەیە.

دەنگیٚ ویٚ کز بوو، ئێدی چ تشت نە بهیست.

- **گلێش**

ئاڤاهییەکیٚ چوار تەبەق بسەر خەلکیٚ تێڤەڤە هەرفت، هەمی تێچون، هژمارا وان دگەهشتە سیهـ کەسان، کەسەك ژیٚ قورتال نەبوو، ژبلی زارۆکەکی .. ژییٚ وی سالەك و بیست رۆژ بوون، چ لیٚ نەهات بوو، ژبلی هندەك سەلخێن و هەرشینێن نەیێن دژوار، ئەویٚ زارۆك دژوورا خوە یا خەستەخانێڤە کونگرەکیٚ رۆژنامەڤانییٚ گرێدا و تێدا گۆت: خەلکیٚ ڤی ئاڤاهییٚ هەرفتی گەهشتنە سزاییٚ خوە ییٚ عادل، چونکو هەمی سیخور و بەرهنگار بوون.

رۆژنامەڤانەکیٚ گەنج ژیٚ پرسی: ئو دایکا تە، بابیٚ تە و برایێ تە ؟...

زارۆکی گۆت: بابیٚ من سیخوریٚ باشوریٚ ئەفریکاییٚ بوو، دایکا منژی خوە فرۆتیبا حکمەتا سومالیا بوو، برایێ من ییٚ مەزن لەوچەو کریت و ئێڤەلی بوو، هەردەم دژی حکمەتیٚ دئاخڤت، خالەتا منژی گەلەك یا پیس بوو، ژبنڤە پلانێن نهێنی دگێران ژبو بجهـ ئینانا مەرەمەکا نە رەوا یا من چ ژیٚ نە دزانی، ئەڤا لیٚ قەومی پشکەکا بچووك بوو ژ وی سزاییٚ هەژی وان، هەمیا پێکڤە ل دەڤ من بەحسیٚ مەرەمێن خوە یێن پیس و نەرەوا دکرن، یا ژوانڤە ئەز هێشتا بچووکم و چ نزانم.

رۆژنامەڤانەکیٚ دی گۆتە زارۆکی: مە یا زانی کو قونتەرچییٚ ئەو ئاڤاهی ئاڤاکری بەرپرسە ژهەرفتنیٚ، چونکو ل دەمیٚ ئاڤادکر ئاسن و چیمەنتویا وی نەیا تەڤاڤ بوو، نهو ژی ییٚ گرتییە و ییٚ تویژاندنیٚ دگەل دکەن هەتاکوب دروستی بەرپرسیار دبیت و حوکم دکەن، دا ببیتە عیبرەت بو هەمی داڤدۆزێن وەکو خوە.

ئەویٚ زارۆك گۆت: دڤێت نهو بهێته بەردان. ئەوا لیٚ قەومی تشتەکیٚ سەیریٚ دونیاییٚ یە. ل شوینا سوپاسییا وی بکەن و بهێته خەلاتکرن. زیندان دکەن و ل هیڤیا سزادانا وینه.

پشتی ڤی کونگریٚ رۆژنامەڤانییٚ. پرانیا رۆژناماں دەسپێکرن. باشی و پەسنداریا ڤونتەرچییٚ زیندانکری دکرن و ئەڤەژی بو ئەگەریٚ بەردانا وی و داخوازا لێبورینیٚ ژیٚ هاته خواستن و ژلاییٚ نوشدارییێڤه لسەر حسێبا دەولەتیٚ هاته چارەسەرکرن و پاشی کرنه وەزیریٚ ئاڤەدانکرنیٚ و فەرمانێن رەهایی کرنه ددەستاندا.

ئێکەمین بریارا وی ئەو بوو. ئێدی ئاسنی و چیمەنتویٚ بکار نه ئینن. چونکو ل وەلاتی ناهێته چێکرن وب پاریٚ بیانی ژدەرڤه دهێته کرینیٚ. داخوازکر کو خەلك بزڤرنەڤه دارا و تەڤنیٚ. خانی یێن خوه پیٚ ئاڤاکەن. ڤیٚ بریاریٚ گەلەك پشتەڤانی و پەسنداری بو هاته کرن و هاته گۆتن کو مرۆڤ ژ ئاخیٚ چێبویه و دیٚ ڤەگەریتەڤه ئاخیٚ.. یان بو کورکەکیٚ دبێژنیٚ گور.. یان ژی لبن گلێشیٚ ئاڤاهییەکیٚ هەرفتی.
دووەمین بریارا وی ئەو بوو. ئەو زارۆك کره شیرەتکاریٚ خوه. لیٚ زارۆکی ئەڤ بریاره ب رژدی رەتکر و گۆت کو هێشتا ییٚ بچووکه و دڤێت هەمی شیانێن خوه تەرخانکەت ژبو فێربونا زانست و زانینیٚ دخواندنگەهێن میریڤه. لیٚ راگەهاند کو ل دەمیٚ مەزن دبیت حەز دکەت ببیته وەزیریٚ ئابوریٚ داکو جلکا نەهێلیت. ئەو جلکێن گەلەك مالی بیٚ ئەگەر خەرج دکەن و پرسیارکر: ما ئادەمیٚ باپیریٚ مه جلکەك ژڤان جلکێن ئەم دکەینه بەرخوه دکرنه بەرخوه؟ ما ئەم ژوی چێترین؟ ما نه خوەرویسکرن جوانترین شێوازیٚ بجهـ ئینانا وەکهەڤیێیه.

دەنگێن پشتەڤانییٚ ل دورماندۆرێن وی بلند بوون. لیٚ گەلەك ژ هەژاران ترانه ب ئاخفتنا وی کرن. چونکو ئەو تشتیٚ ئەو پێشنیاز دکەت و حەز دکەت بجهـ بینیت. پێدڤی ناکەت. ئەو خەلکێن درویس.. دزۆرن و هەر رۆژ هژمارا وان زێدەتر لیٚ دهێت.

- **ییٚ سییٚ**

ب شەڤ ل جاددەیەکا ڤالا گەهشتنه ئێك ...

زەلام ییٚ درێژ و دێم هشك بوو. هەروەکو چ جاران نه کرییه کەنی. ژنك یا کەیفخۆش و لەش تژی بوو. هێشتا هندەك جوانی و سەرنجراکێشی یا لنك مای. ژنکیٚ رێکا زەلامی گرت و ب بستەیی گۆتیٚ (هەروەکو ئەڤه چەندین ساله وی دنیا سیت): ئەگەر تو دگەل من بهێی یان ئەز دگەل تە بهێم. دیٚ دەمەکیٚ خۆش دگەل من بورینی کو هەمی عەمریٚ خوه ژبیرنەکەی.

ئو ژنکیٚ گۆتیٚ: ئەڤ شەڤه بهایێن من نه وەکو هەر جارن. فرستەکه و دووباره نابیت. ئەرزانه.

دیسا ژنكێ گۆتێ: بجەربینە و پێشەمان نابی ، دهەمی ژیانا خوەدا من حیلە ل كەسەكێ نە كرییە.

تبابەكێ بازار لسەر بهای كرن و پاشی ب بێدەنگی پێكڤە چوون هەتا گەهشتینە ئاڤاهییەكێ مەزن ، ژنكێ تبلا خوە درێژكرێ و ب دەنگەكێ پێترانكیڤە گۆتێ: ئەز دڤێرەڤە دژیم .. دژوورەكێڤە.

ئوكەنی و گۆت: ژوورەكا مەزنە تێرا تەختەكی دكەت ، لێ ژبو بەریكانێیا هەسپان ب كێر ناهێت .. یا ژمنڤە تە نەڤێت پشكداریێ دبەریكانێیا هەسپاندا بكەی ، بەلكو تە دڤێت ل تشتەكی سوار بی نە هەسپ بیت.

دەمێ چوینە دژوورڤە ، ژنكێ گۆتە زەلامی: ناڤێ تە چییە؟

زەلامی ب سەرسورماییڤە لێ ڤەگەراند: ما من پرسیارا ناڤێ تە كرییە ، هەتاكو تو پرسیارا ناڤێ من بكەی؟

ئو دەمێ خوە لسەر تەختی درێژكرین ، ژنكێ گۆتە زەلامی: من هەمبێزكە ، من سارە.

زەلامی گۆت: ئەگەر من تو هەمبێزكری ، دێ هەستیكێن تە شكێنم.

ژنكێ لێ ڤەگەراند: ئەز حەز ژ زەلامێن ب هێزدكەم.

زەلامی گۆتێ: دەستكە من ، ئەز نە وەكو تەمە ، ئەز ئاسنم.

ژنكێ لێ ڤەگەراند: ئەڤ تشتە كەیفا من دئینیت و ئەز پێ عێجز نابم ، هەژییە ب تلیلیڤە پێشوازیا ڤێ گۆتنێ بكەم ، لێ من تلیلی نە ڤەدان داكو هەڤدەر هشیار نەبن ، نەكو خوە نە رازیكەن وگەفێن گازیكرنا پولیسان لە بكەن.

ژنكێ گۆتە زەلامی: گوهدە من .. ب راستی من هەمییێن جەرباندین ، بچووك و مەزن .. یێن بهێز و یێن بێهێز .. یێن زەعیف و یێن قەلەو ، لێ چ جاران من ئاسن نە جەرباندییە.

زەلامی گۆت: چ تشتێ لتە بهێت تو ژێ بەرپرسی ، چونكو من تو یا ئاگەهداركری.

ژنكێ گۆت: دێ لەزكە وەختێ مە ب ئاخفتنێ و تراناڤە پویچ نەكە.

ژنكێ ئاخینكەك راهێلا و پاشی ئاخینك لدویف ئاخینكێ راهێلان ، ڤێژییەك ژێ دەركەفت .. ڤێژیا گوشتەكی بوو صنگەكێ پیلایی ب چەكوچەكێ گران تێ دهاتە قوتان ، لێ چ هەول نەددان زەلامی ژخوە دویر بێخیت ، دەستێن وێ پێڤە مانە شدیای. ئو ل سپێدێ دەمێ ژنك ژخەو هشیار بوی ، زەلام ب رەخ خوەڤە نەدیت و پشتی هینگێ ژی نەدیت. پشتی نەه هەیڤان ، ژنكێ كورەك بوو ، گەلەك وەكی بابێ خوە بوو ، نە دڤیا ژ سینگێ دایكا خوە یا مشت شیر شیری ڤەخوت ، هەروەسا چ خوارنا بو

پێشکێش دکر نە دخوار. دایکێ ژی نە دڤیا زارۆکی نیشا چ نوشداران بدەت. داکو چ هەراپێن نە پێدڤی بو پەیدا نەبن. دەمێ ددیت کو زارۆکێ وێ دسەر نەخوارنێ را .. یێ ساخە و ب بەردەوامی وەرارێ دکەت. سەرسورماییێ دگرت.

رۆژەکێ .. وێ ژنکێ ژکچکەکا هەڤدەرا خوە خواست کو چاڤێ وێ ل زارۆکی بیت هەتا کو دزڤریت، دەمێ ڤەگەریایەڤە ژوورا خوە. دیت کو دەست و دەڤێ زاروکی دخوینەلۆنە و ب بەرێخوەدانا تێهنی و برسییەکی هێڤ دکرێ. ئەو کچکا هەڤدەرا خوە ژی ل وێرێ نەدیت.

ژنکێ پالا خوە دا دیواری و تێکهەلەیەکێ ژترسێ و کەیفێ دگیانیدا دمەشی. ل وی دەمی زارۆکێ وێ یێ دەڤ ڤەکری ب نکڤە دچوو. هەول نەدا برەڤیت یان هەوارکەت. زاروکێ وێ هێشتا یێ برسییە.

- **دهاڤینەکا مژداردا**

هاڤین یاگەرم و شهدار و دارگران بوو. هەدارا کەسێ ژبەر نەدهات. ئەم ژباژێری رەڤین و چوینە گوندەکێ مشتی دار و کانیێن ئاڤێ. دپرانیا جاراندا خەلکێ نە دەولەمەند دهێتێ. ئەڤ گوندە دکەفتە ددانگا چیایەکیدا هەردەم بەفر ل کوپێن وی دگرنژیت. ل وێرێ ژوورەکا بەرفرەه کو تێرا چوار تەختا بکەت. مە کرێکر. ئەم چوار کەڤنە هەڤال بوین. خەلکێ گەرەکەکێ بوین و مە هەمیا هەمان کاردکر. ئەز عەبدولامە هەر سێ هەڤالێن من ژی ناجی و سەمیر و تەلال بوون.

ل رۆژا ئێکێ. ئەم ل هەمی کولانێن گوندی گەریاین. ل چایخانێن وێ روونشتین و ل خوارنگەهێن وێ مە خوار و مە گەلەك ژ زەلام و ژنك و زارۆکێن ڤی گوندی نیاسین. هەتا پشتی نیڤ شەڤ ئەم دماینە هشیار و مە هند کرە کەنی کو ل سالەکا تەمام ئەم هند نەکەنی بین. ئو دەمێ ئەم زڤرینەڤە ژوورا خوە .. ئەم پێکهاتین کو رۆژا مە. جوانترین رۆژ بوو. ل رۆژا دوویێ. بەرزەبونا تەلالێ هەڤالێ مە. ئەم سەتماندین. ل هەمی جها ئەم لێگەریاین و مە نە دیت. ژبەر وی ئەم گەلەك ئالوز و دلتەنگبوین. نەمازە پێرینەیا گشتییا ڤەگوهاستنێ ژگوندی بو باژێری بتنێ پاسەکە سپێدێ دەردکەڤیت و ل ئێڤاری ڤەدگەریتەڤە. دلخۆشیا مە بەرە بەرە کێمتر لێ دهات و بەرزەبونا سەیر یا تەلالی بابەتێ هەمی سوحبەتێن مە بوو. هەتاکو ئەم ب شەلەژانی دنڤستین.

ل رۆژا سیێ و ل دەمێ نیڤرو سەمیرێ هەڤالێ مە بەرزە بوو. ئەم لێگەریاین. مە کەسەك ل گوندی نەهێلا مە پرسیار ژێ نەکری. هەتاکو وەل مە هاتی پرسیارا مریشکێن گوندی ژی بکەین. لێ چ بەرسڤێن دلخۆشکەر مە نە بهیستن و مە چ ژێ نەزانی.

ل رۆژا چوارێ، ل دەمێ ئێڤاری عەبدلا ژی بەرزە بوو ناجی لێگەریا و بنگەهێ پولیسان پێ هەساند، وان گۆتێ کو چ پێزانین لسەر ڤی ناڤی، وان ڤێ نینن و هەروەسا لجەم وان نەیێ زیندانکرییە ژی.

هەمی هەولدانێن ناجی چ پێڤە نەهات، هەروەسا ئەز ژی ل عەبدلای گەریام هەروەکو ئەم ل یێ دی ژی دگەریاین و مە ژی چ ژێ نەزانی، ئەڤا لێ قەومی .. بو من یا سەیر بوو، مرۆڤەکێ کەهی و ئاشتیخوازە، نەچ مال هەیە کو دلێ دزیکەرا بچیتێ و نەچ دوژمن هەنە کو پلانێن رەڤاندنا وی، یان کوشتنا وی بدانن، بوو چەندین روژا ئەز خەموکی بووم و پاشی ئەوا قەومی لنك من بو تشتەکێ سروشتی.

## • مخازا عەرەبی

سەرحانێ عاسی، ل شوینا گورێن وی یێن دریای و پر شەرم و کون کون، دڤیا دەستەکێ گورێن نوی بکریت. ل ئێکەمین دکانا لسەر جاددەیا درێکا ویدا ب ژوور دکەڤیت، دکانەکا مەزن بوو، مخازە بوو، لێ سەرحانێ عاسی بەهتی بەهتی دەمێ دیتی کو ئەو تشتێن دمخازاڤە دڤێ مخازێڤە نینن، نە جلك، نە پێلاڤ، نە کەلو پەلێن مالێ، نە گولاڤ، نە تێلەفزیون، نە کەلو پەلێن لینانگەهێ، چ تشتێن ژ ڤان جورەیان تێڤە نینن، حەیری و ب ساویلکەیی هێڤ دکرە دورماندۆری خوە و شت یێ راوەستای بوو، فەرمانبەرەکێ مخازێ ئەڤ حەییرینا وی دیت، یێ بەژن کورت و قەلەو بوو، ب دێمەکێ سەرنجراکێشێ هەردەم ب گرنژین ژ سەرحانێ عاسی بلەز نێزیك بوو، هەروەکو هەڤالەکێ وی یێ کەڤن دگەل ئاخڤت: ئەڤە تشتەکێ سروشتییە، پێدڤی ناکەت ل چاڤێن خوە ب گومان بکەڤی، هەرکەسێ بوجارا ئێکێ ل مخازا مە ب ژوور دکەڤیت .. وەکی تە لێ دهێت، مخازا مە نە وەکو مخازێن دییە، یا تایبەتمەندە ب فرۆتنا وان تشتێن ل چ مخازێن دی نە هێنە فروتن، ئەڤە ساخلەتەکا مخازا مەیە، ئو بڤێ ساخلەتێ ناڤودەنگێ مخازا مە ب باشی یا بەلاڤ بوی و بکرِان باوەریا پێ ئینای، کەسەکێ چ رۆژان گازندە نەکرییە کو مە حیلە یا لێکری، مە هەمی تشتێن هەین، هەمی تشت ژی یێ دفروتنێنە، ئەگەر تە بهایێ داخوازکری هەبیت، بهایێن مەژی دبەر ئاقلن و نە دگرانن، هەروەسا تو دکاری دماوێ دوو سالاندا ب قست قستە بدەی.

سەرحانێ عاسی گۆتێ: ما هوین چ دفروشن؟

فەرمانبەری گۆت: مە هەمی تشت هەنە، پسمیر.. دوتمیر.. میر.. وەلات .. دەریا .. زەلام .. زارۆك .. رووبار.. ئو هەروەسا مە سەروکێن کومارا و وەزارەت و وەزیر و ئەندامێن پەرلەمانا ژی هەنە. مە دەستەکەکا نایاب یا ژنکا هەیە کو ب کێر هەمی گێولا دهێن .. یێن پرچ زەرو چاڤ شین، یێن ئەسمەر، یێن قەلەو، یێن زەعیف. ئومە هندەك ژنکێن تایبەت هەنە بو گەنجێن خوین گەرم .. ئەو ژنکن یێن

هندی بدەنێ هێشتا بڤێت. ئو مە ژنکێن دووگیانێن ل هەیڤا نەهێ هەنە. ئێك دچینیت و دوەستیێت و تو بێ زەحمەت دێ بەرهەمی خوی. هەلبەت هەر ژنکەکێ بهایێ خوەیێ جودا هەیە ل گورەی جوانیێ و سەربۆرِێ و رەوشەنبیریێ و باوەرناما وێ. ئەڤا نەزانا نەخویندەوار بهایێ وێ گەلەك کێمترە ژ بهایێ دەرچویەکا زانکویێ, ئوگوهداریا ژنکێ بو زەلامی رۆلەکێ گرنگیێ هەی ددەسنیشانکرنا بهایدا.

فەرمانبەری ئیشارەت کرە زەلامەکێ دێم هشك و گۆت: سەحکە ڤی زەلامی, ئەو دادوەرێ فروتنێیە .. هەر مللەتەکێ وی بڤێت هندی یێ نە گوهدار بیت دشێت دماوێ چەند هەیڤەکا دا بکەتە کومەکا بەرخك و کێڤروشکا.

سەحکە ڤی پسمیری, ئەگەر تە کرِی و بیاڤ بو دخۆش بوون, دشێت هەر نەه هەیڤا پسمیرەکێ نوی بدەتە تە. ما تو نابینی کو ئەڤە بازارەکێ نایابە؟ دێ پسمیرەکێ بتنێ کرِی و پشتی چەند سالەکا دێ تە کومەکا پسمیر و دوتمیرا هەبن, دێ فروشی و دێ هند قازانجکەی کو تو باوەرنەکەی.

سەحکێ سەحکێ .. ڤی مەلیکێ ب ترس, تە دڤێت بکرِی؟ چەندێ ب ترسە: هەیبەت ژێ دباریت, ئەگەر لسەر کورسیکا عەرشی ب روینیت و رێڤینگبهێن دێ سامانەکێ مەزن کوم کەی.

فەرمانبەری ئیشارەتکرە نەخشەیەکێ مەزن ب دیواریڤە و گۆتێ: ئەڤ وەلاتە ب عەردو مروڤ ڤە ژبو فروتنێیە, بهایێ وی یێ هەژی بدە و دێ ببیە خودانێ ڤی وەلاتی, کەسەك بێی تە هەناسە ژی نادەت.

فەرمانبەری ئیشارەتکرە وێنەیەکێ رەنگاو رەنگێ دەریایەکێ و گۆت: ئەڤ دەریایە ژی ژبو فروتنێیە, هەمی ماسیێن وێ بوتەنە, چ پاپور جرعەت ناکەن لسەر ببورن ئەگەر کرێیا تە نەدەن. یا خویایە کو کرِینا ڤێ دەریایێ کارەکێ باشە بو بازرگانان, چونکو مفاو قازانج یێ مسوگەرە.

فەرمانبەری ئیشارەتکرە زەلامەکێ قەلەو, گۆت: ئەڤە پسمیرەکە, ئەز تە شیرەت ناکەم کو ب کرِی, ژخوارنێ تێر نابیت و ئەگەر باشترین و گرانترین خوارن بو نە ئینی رازی نابیت .. بهایێ وی گەلەکە و داهاتێ وی چ نینە.

فەرمانبەر پێ هەسیا کو بکرەکی ئیشارەتکرێ و ژێ داخوازکر کو ب نکڤە بچیت, گۆتە سەرحانێ عاسی: ببورە, دەقیقەکێ .. ئەڤ بکرە مەعمیلەکێ مەیێ کەڤنە, ملیونێرە و یاریا ب پارا دکەت.

فەرمانبەر بلەز چو نك بکرِی, دگەل ئاخفت و پاشی ب دلخۆشی زڤریڤە نك سەرحانێ عاسی و گۆتێ: فرسەتەك بو تە هەلکەفت, هەمی جاران هەلناکەڤیت, هەر ژدیتنا ئێکێ ئاقلێ ڤی ملیونێری ژتە برِی و دڤێت تە بکریت, ئەگەر تو رازی ببی, ئەم لسەر بهایێ تە دێ پێك هێین.

سەرحانی گۆت: ئو دێ چەند سالان ئەز مولکێ وی بم؟

فەرمانبەری لێ ڤەگەراند: ئەڤ بابەتە دانوستاندن لسەر دهێتە کرن و دڤێت پێك بهێن. بەری بازارێ فرۆتنێ ب دوماهی دهێت. ئەز هزر دکەم کو وی دڤێت تە بو دەه سالان بکرێت. نهو ژییێ تە چەندە ؟ سیه سالن یان کێمترە. هزرکە کا دێ چ قەومیت.

پشتی دەه سالان .. دەمێ ژییێ تە دبیتە چل سال. دێ زڤریەڤە وەکو خوە زێدەباری سامانەکێ مەزن کو دێ پێ خانەنشین بی و دێ ب خۆشی و ئارامی پێ ژی. رێ بدە من ئەز مایێ خوە دکاروبارێن تە یێن تایبەتدا بکەم. تو چ کار دکەی؟

– فەرمانبەرم ل فەرمانگەهەکا فەرمییا حکمەتێ.

– ئانکو تو دهەیڤێدا سیه رۆژان کاردکەی و هەر رۆژ ب کێمی تو هەشت سەعەتان کار دکەی. بەرپرسێن تە ژی ژ تە نەدرازینە. گازندا ژ تە دکەن و سزایێن ئاگەهدارکرنێ و پاشڤەبرنێ و موچە برینێ ئاراستەی تە دکەن. ئو ژبلنداهیێ سەح دکەنە تە هەروەکو تو ژمێشەکێ کێم بهاتر. ل دوماهیا هەیڤێ ژی دێ موچەیەکێ کێم دەنە تە کو تێرا تێربونا تە ناکەت.

– ئەز دەرچوییێ زانکوییێ مە و ئەز دخواندنا خوە دا یێ سەرکەفتی بوم.

– تە ئەز سوتم. ئەز هندەك دەرچویێن زانکوییێ دنیاسم. ل هاڤینێ گوندورا دفرۆشن و ل زڤستانێ ژی شێلما دفروشن.

– بێژە من تە ژن ئینایە؟

– نەخێر. ئەز زگوردم.

– تو حەز ژکەسەکێ دکەی؟

– نەخێر.

– ئاقلێ خوە بکار بینە. تو نابینی کو ژیانا تە ببەر هندێ ناکەڤیت تو بپارێزی. لێ ئەگەر تو رازی ببی خوە بفرۆشی. دێ تەنابی و دێ ژ هەمی بەرپرسیارییا قورتالبی. خوارن و نڤستنا تە .. دێ یا ب هەروە بیت. چ لسەر تە نینە ژبلی بجه ئینانا وی کارێ ژتە دهێتە داخوازکرن.

– ما دێ چ ژمن داخوازکەت؟

– نە عەدەتێ مخازا مەیە. پرسیارا بکری بکەت کا دێ چ ل وی تشتێ کری کەت. لێ بکرێ تە .. ژ تە ناخوازیت کو ب پیا هلباسك بییە سەر هەیڤێ. بتنێ هندەك داخوازینە کو تو بشێی بجه بینی.

– ئو ئەگەر کریارا فرۆتنێ بجه هات. قازانجێ مخازا وە چییە؟

– مە رێژەیەکا سەدی هەیە ژ هەر تشتەکێ ئەم بفرۆشین.

ئەو زەلامێ زەنگین حەز ژکرپنا سەرحانێ عاسی کری، دەمێ ژمخازێ دەردکەفت، ئەو تشتێ وی کری و پارێ وێ ب ئێکجار دای، سەرشۆر و پشت چەمیای ب دویف ڤە بوو.. پێنگاڤێن وی دراهەژوك بوون بیێ کو پێدڤی یێن خوە ژگورێن نوی بکرپت.

- دوماهیك

ل چایخانێ هەڤالێن من ل هیڤیا منن ...

دلبەرا من ل بەرانبەری سینەمایەکێ ل هیڤیا منە ...

دار لسەر جاددەیان ل هیڤیا منن ...

ل مالا من، پشیکا من یا برسی و کتێبێن من یێن هێژ من نە خواندین ل هیڤییا منن.. لێ ئەو فەرمانەکێ لمن دکەت کو نابیت بجه نەئینم، ئەز گوهێ خوە ددەمێ و ب دویف دکەڤم، ب دلهینی دگرنژیت و دبێژتە من: ئها.. ئەڤە ل دوماهیێ تو بویە مولکێ من.

ئەز ب هەوارکی لدور خوە دزڤرم، ژنکەکا پرچ رەش دبینم، ب خوەشی دکەنیت و یاریا ب خەزالەکا بچووك دکەت، ئەز ب ئارامی ئاخینکا رادهێلم، لێ.. ژنشکەکێڤە هندەك زەلامێن جلك رەش دەردکەڤن و ژنکێ دووریێچ دکەن. ئوکەنیا وێ دخەندقینن و ژ پرچا وێ یا رەش وەریسەکێ درێژ چێدکەن و خەزالێ پێ سێدارە ددەن، چاڤێن خوە دنقینم، سەرێ من ب وی بەری دکەڤیت ئەوێ دەرێ کورکا من گرتی، دێمێ من ژ روندکێن من تەر دبیت، ب هیڤی و رجاڤە دبێژمێ:

- ب کێمی، بهێلە خاترا خوە ژ ئەوێن ل هیڤیا من بخوازم.

ب دەنگەکێ هشك دبێژتە من: درەوا نەکە، کەسەك ل هیڤیا تە نینە.. خو ئەگەر تو هزار سالان ژی بژی، کەسەك نامینیتە ل هیڤیا تە. ئەز هەولددەم کو خوە ژ ئاخفتنا وی نە رازیکەم، لێ ئەز ژشەرمادا بێدەنگدمینم، ئو دچیت و من بتنێ دهێلیتە دبنێ کورکێدا. ئەز رویێ خوە ب کفنێ سپیێ نەرمڤە دنم و دمینمە ل هیڤیا کرما، ئو رەزیلییا من یا دوماهیێ کو نەشێم سەبرێ لسەر بکێشم ئەوە، هەکو کرم حەز ژ خوارنا لەشێ من نەکەن.

*  *  *

# پلنگل رۆژا دەهێ

دارستان ژوی پلنگێ دقەفەسکێدا , دوورکەفتبوو , لێ پلنگنە دشیا ژیربکەت. پرژکەربڤە بەرێخوە دداوان زەلامێن لدورقەفەسکا وی دزڤرین و بێ ترس هێڤ دکرنێ. ئێکێ ژوان ب دەنگەکێ هێدی و فەرماندار دگۆتێ: ئەگەرهنگوب دروستی بڤێت کارێ من فێرببن -کارێ راهێنانێ - فەره هوین ژبیر نەکەن کو ئاشکێ من هەڤدژی وە , ئارمانجا ئێکێیە , دێ بینن ئەڤ کاره دهەمان دەمدا یێ ب زەحمەتە و یێ ب ساناهییە ژی , هێڤکەنە ڤی پلنگی , پلنگەکێ هۆڤ و دۆژمنکاره , گەلەك شانازیێ ب ئازادی و هێزو هۆڤاتییا خوە دکەت , لێ دێ هێتە گوهورین , مینا زارۆکەکێ بچووك دێ کەهی و دلحەبین و گوهدار بیت , دویڤچوونا هەڤبەندیا دناڤبەرا ئەوێ خوارن هەیی و ئەوێ بێ خوارن بکەن و فێرببن.

وان زەلامێن دگەلدا , خویاکرن کو دێ قوتابی یێن گوهدارو ب ئەختوباربن بوڤی کارێ راهێنانێ ,

راهێنەر ب دلخۆشی گرنژی و ب ترانەڤە گۆتە پلنگی: رەوشا مێڤانێ مەیێ هێژا چەوانە ؟

پلنگی گۆت: خوارنێ بومن بینە .. دەمێ خوارنا من یا هاتی.

راهێنەری ب سەرسورماییڤە لێ ڤەگەراند: ئەرێ ما تو دێ فەرمانا ل من کەی؟ تو گرتیێ منی , تو چەند پلنگەکێ ساویلکەیی! فەره تو بزانی کو لڤێره , من بتنێ مافێ فەرماندانێ یێ هەی ..

پلنگی گۆت: کەسەك نەشێت فەرمانان ل پلنگا بکەت.

راهێنەری لێ ڤەگەراند: لێ تو نە پلنگی , دەمێ تو ل دارستانێ تو پلنگبوی , نهو پشتی تو چویە دقەفەسکێدا تو یێ بویە کۆلە و بتنێ دێ گوهداریا فەرمانان کەی , هەرتشتێ من بڤێت دێ کەی.

پلنگی ب تنگژینڤە گۆت: ئەزنابمە کۆلەیێ چ کەسان.

راهێنەری لێ ڤەگەراند: تو نەچاری گوهداریا من بکەی , چونکو ئەزم یێ من خوارن ڤێ.

پلنگی گۆت: من خوارنا تە ژی نەڤێت.

راهێنەری لێ ڤەگەراند: کەواتە .. برسی ببە وەکی تە بڤێت , ئەز تە نەچارناکەم , کارەکێ تە نەڤێت , ئەنجامدەی.

پاشی ل قوتابیان زڤری و گۆتیێ: دێ بینن دێ چەوا هێتە گوهورین, سەرێ بلند ئاشکێ خودانی تێر ناکەت.

پلنگبرسی بوو, ب خەمگینی بیرییا روژانێن بوری دکر, دەمێ دگەل بای دبەزی و پر ب ئازادی و بێ زنجیر ل قوریانی یێن خوە دگەریا.

ل روژا دووێ, راهێنەر و قوتابی یێن خوە لدور قەفەسکا پلنگی زڤرین و راهێنەری گۆتیێ: تو نەیێ برسی؟ بێگومانە کو تو یێ برسی, برسەکا دژوار و پر ئێش, بێژە ئەز برسیمە, دێ هندەك گوشتی دەمە تە .. پلنگێ دەنگما, لێ راهێنەری گۆتیێ: خوە خشیم نەکە و هەر تشتێ بێژمە تە بکە, دانپێدانێ ب برسا خوە بدە و نهو دێ تێر بی.

پلنگی گوت: برسیمە.

راهێنەرکەنی وگۆتە قوتابی یێن خوە: ئها نهو کەفتە دخەفکەکێدا ژێ قورتال نابیت.

فەرماندا هندەك گوشتی بدەنە پلنگی.

ل رۆژا سیێ, راهێنەری گۆتە پلنگی: ئەگەر ئەڤرو تە خوارن بڤێت , هەر تشتێ بێژمە تە , دڤیا بکەی.

پلنگی گوتێ: گوهداریا تە ناکەم.

راهێنەری لێ ڤەگەراند: بلەز بریارێ نەدە, داخوازا من گەلەك یا ب ساناهییە, نهو تو یێ دقەفەسکا خوە دا رازایی, دەمێ بێژمە تە, هلوڤە, ئێکسەر دێ رابییەڤە.

پلنگی ددلێ خوە دا گۆت: ب راستی داخوازەکا بێ بهایە و ببەر هندێ ناکەڤیت, خوە مدەرك بکەم و خوە بهێلمە برسی. ئەڤجا راهێنەری ب دەنگەکێ بلند و تیژ و فەرمانداری گۆتیێ: هلوڤە .. دەملدەست پلنگرابوڤە و راهێنەری ب کەیفخۆشی گۆتیێ: دەست خوەش. دلێ پلنگی ژی خوەش بوو, ل وی دەمێ راهێنەری دگۆتە قوتابی یێن خوە پشتی چەند روژەکا دێ بیتە پلنگەکێ کاغەزی, پلنگی خوارن ب کولافی دخوار.

ل رۆژا چوارێ, پلنگی گۆتە راهێنەری: ئەز برسیمە, بێژە من هلوڤە دا رابم. راهێنەر ل قوتابی یێن خوە زڤری و گۆتیێ: ئها نوکە یێ دەست پێ دکەت حەز ژ فەرمانێن من بکەت. پاشی ل پلنگی زڤری و گۆتیێ: تو ئیروکە چ ناخوی ئەگەر چاڤلێکرنا نەونەوا پشیکێ نەکەی.

پلنگی کەربا خوە ددلێ خوەدا ڤەشارت و ددلدا گۆت: ئەز بخوە دێ خوەشیێ ژڤێ داخوازێ بینم, ما بو ناکەم, دەسپێکر مینا پشیکا نەوی, لێ ئەنیا راهێنەری بو گرێ و ب هشکی گۆتیێ: ئووو .. چافلێکرنا تە نەیا سەرکەفتییە, ما تو هزر دکەی نررێن .. نەونەوە؟ پلنگی هەولداڤە, لێ هەر ب دلێ راهێنەری نەبوو ب عێجزی گۆتیێ: هش بە .. هش بە .. تو نەیێ سەرکەفتی, دێ ئیرو تە هێلم, راهێنانێ بکە و سوباهی دێ تە جەربینم, ئەگەر تو ب سەرکەفتی دێ خوی, ئەگەر نە .. ناخوی.

راهێنەر هێدی هێدی ژقەفەسکێ دویرکەفت وقوتابی یێن وی ب پستە پست و کەنیڤە بدویفڤە بوون .
پلنگی ب دلکولی گازی دارستانێ کر. لێ دارستان گەلەك یا دویر بوو.
ل روژا پێنجێ راهێنەری گۆتێ: ئەگەر تو ب دروستی مینا پشیکان نەوی , دێ پارچەکا مەزن ژگوشتێ جان دەمە تە.
پلنگی دەست ب نەونەوێ کر.. راهێنەری دەست بو قوتان , ب دلخۆشی گۆتێ: قەنجە .. نەوینا تە , مینا پشیکانە ل شواتێ. پارچەکا مەزن یاگوشتی هاڤێتە بەر.
ل رۆژا شەشێ, دەمێ راهێنەر نێزیکی قەفەسکا پلنگی بوی , ئێکسەر پلنگمینا پشیکا دنەوی . لێ هەر ئەنیا راهێنەری لێ ڤەنە بوو. پلنگی گۆتێ: ئەزێ مینا پشیکا دنەوم.
راهێنەری گۆتێ: مینا کەری ب زرە؟!
پلنگی ب خەمگینی و پر بێزاری گۆتێ: ئەز ئەو پلنگم یێ هەمی ئاژەلێن دارستانێ ژێ دترسن .. چاڤلێکرنا زرینا کەری بکەم ؟! من مرن پێ خوەشترە ژ زرینێ, راهێنەر بێی ئاخفتن ژێ دویرکەفت.
رۆژا حەفتێ راهێنەر هاتە جەم پلنگی و گۆتێ: تە نەڤێت بخوی؟ پلنگی گۆت: من دڤێت.
راهێنەری لێ ڤەگەراند: ئەو گوشتێ تو دخوی بهایێ خوەیێ هەی .. وەکو کەری بزرە و دێ خوارنێ دەمە تە.
پلنگی گەلەك هەولدان بیرییا دارستانێ بکەت لێ نەشیا , ب چاڤ نقاندی دەست ب زرینێ کر.
راهێنەری گۆتێ: هەرچەندە زرینا تە نە یا سەرکەفتییە , لێ چونکو دلێ من یێ بتەڤە, دێ هندەك گوشتی دەمە تە.
ل رۆژا هەشتێ, راهێنەری گۆتێ: ئەز دێ دەسپێکا گوتارەکێ خوینم, هەر دەمێ تەڤاڤ دبم دەستا بقوتە.
پلنگی گۆتێ: دێ دەستان قوتم.
راهێنەری دەست ب خواندنا گوتارا خوە کر و تێدا گۆت: جەماوەرێ هێژا ... هەروەکو دگەلەك بیرەوەری یێن دی یێن بوریدا , مە هەلویستێ خوە ل هەمبەر چارەنڤیسێ دۆزێ ئاشکراکری , ئەڤ هەلویستێ مەیێ دیار و نەگور, هندی هێزێن دوژمنکار پلانان دژی مە بگێرن , ناهێتە گوهورین .. ب بیرو باوەران دێ بسەرکەڤین.
پلنگی گۆتێ: ئەز چ تێنەگەهشتم.
راهێنەری لێ ڤەگەراند: لسەر تە ئەوە هەر تشتێ ئەز بێژم, تو قەبیلکەی و دەستا بو بقوتی.
پلنگی گۆت: لمن ببورە, ئەز نە خویندەوارم, ئاخفتنا تە گەلەك جوان و هەژییە چەوا تە بڤێت دێ وەسا بوتە دەستا قوتم. ئو پلنگی بێ راوەستان تبابەکا خوەش دەست قوتان.

راهێنەری گۆتیێ: ئەز حەز ژ سالیسك و منافقان ناكەم. ئەڤروكە دێ تە سزادەم و چ خوارنێ نادەمە تە ..

ل رۆژا نەهێ. راهێنەری هندەك گیا بو پلنگی ئینا و گۆتیێ : بخو!

پلنگی ب سەرسورماییڤە گۆتیێ: ئەڤە چییە؟ ئەز گوشتی دخوم.

راهێنەری گۆت: ژنهو پاشڤە ژبلی گیای، تو چ تشتێ دی ناخوی.

دەمێ برسا پلنگی دژوار بوی. هەولدا گیای بخوت. لێ تاما نەخوشا گیای پلنگڤەجنقاند و ژێ دویركەفت. پشتی ماوەیەكی جارەكا دی لێ زڤریڤە و هندەك ژێ خوار. بەرە بەرە پلنگشیا دگەل تاما نەخۆش یا گیای رابهێت.

ل رۆژا دەهێ راهێنەر و قوتابی یێن وی و وپلنگو قەفەس هەمی نەمان و بەرزە بوون. چونكو پلنگببوو جەماوەر و قەفەس ببوو باژێر.

*  *  *

## هاڤین

لەشێ وێ یێ گەرم و جوان بوو. دەمێ ب رەخڤە روونشتییە سەر كورسیكێ. هەولدا دەستێن وی ژ خوە دویر بێخیت. لێ زەندێن وی بلەز بوون. ب هێزلدور كەمەرا وێ ئالاند و گرت. لەشێ وێ یێ تژی بوو. نەرمیا گوشتێ وێ رەجفینەكا ب لەزەت بەردا ناڤ دەمارێن وی. چاڤێن كچكێ دلگیر بوون. نەشیا خوە راگریت. هەوارەكا بەرزە بوی دچاڤاندا بوو. مژیلانكێن خوە دانانە سەرێك. ئو گۆت: بەلا خو ژمن ڤەكە. ماجد ... هیڤیا ژ تە دكەم.

دێمێ وی یێ نێزیكی دێمێ وێ بوو. لێڤێن خوە نێزیككرن و ب نازكی دانانە سەر لێڤێن وێ. ئەڤا هە بەس بوو كو هەست ب نەرمی و نازكیا لێڤێ بكەت. دوی دەمیدا هەستەكا سەیر ئەو پالددا. كو بكەفتە سەر چوكا و سەرێ خوە یێ بێهن هەلمایی بكەتە دناڤ همبێزا وێدا.

- بەلا خۆ ژمن ڤەكە. ماجد ... هیڤیا ژ تە دكەم. من دڤێت بچم.

ما دێ چەوا هێلیت بچیت؟ گەلەك هیڤی ژێ كربوون هەتا سەرەدانا وی كری, نهو ژی ئەو هەردوو بتنێ یێ دژوورەكا دەرگرتیڤە, ما دێ چەوا هێلیت بچیت؟ ب دەنگەكێ لەرزوكی و هێدیڤە گۆتێ: من تو دڤێی ... عەتاف

ب نازوكی گۆتێ: تو درەوا دكەی .. تە ئەز نەڤێم.

ئەو نەشێت ب دروستی هەستا خۆل بەرامبەری وێ دیاركەت, ئەرێ حەز ژێ دكەت یان بتنێ دلێ وی دچیتە لەشێ وێ؟ ب چاڤبرسیاتی لێڤێن وێ ماچیكرن و ب پرسیاركەری گۆتێ: مادێ بوچی هوسا تە ماچیكەم, ئەگەر حەز ژ تە نەكەم؟

نەدشیا بەرسڤا پرسیارا وی بدەت, هەرچەندە بەرسڤ درانی ژی, ژ چاڤێن وی یا دیار بوو.

ژبەرێخودانا وی یا سەیر و شەبەقی كو ترسەكا مەزن دئێخستە ددلیدا. تشتەكێ ڤەشارتی دلەشێ وێدا هشیار دبوو, ترسەكا مەزن ژ ناخێ وێ دڤەژاند. گەلەك حەز دكر چاڤێن خوە دانتە سەرێك و پاشی ڤەكەت, خوە لسەر جاددەیەكا پر مرۆڤ ببینیت یان دژووا خۆڤە بیت, دەم بو دەمی دایكا وێ گازیكەتێ .. ئاخینكەك ژێ دەركەفت, نەدشیا نەدەرئێخیت, ل وی دەمی دەستێ زڤرێ ماجدی لسەر لەشێ وێ بوو, ئەو ژی ب لەزەتێ و نەرمیێ یا سەرخۆش بوو. عەتافێ گۆت: ماجد .. بەلا خو ژمن ڤەكە. دبیت ئێك مە ببینیت.

- ئەم بتنێ دڤێ ژوورێ ڤەینە.

- پەنجەرە یا ڤەكرییە.

ژنكەك ل بالكۆنا ئاڤاهیێ بەرامبەر یا راوەستای بوو, كەنی و گۆتە ژنكەكا دی یا نێزیك: تە دیت چ چێبوو؟ ماجدێ كورێ جیرانێ مە, كچكەك كرە دژوورڤە. كەسوكارێن وی نە ل مالن. سەرەرای ڤێ گەرما دژوار, ئەڤە وی پەنجەر ژی گرت. دبن بالكۆنێڤە دەنگێ فیركا پولیسی هات, دەنگێ سیرێنا فەرمەلا ترومبێلەكێ هات, ژنشكەكێڤە راوستا, ژبەر پەنجەرەكێ دێمێ ژنكەكا پرسیاركەر ل هەمبەری پولیسی دەركەفت. پولیسی ماوەركرە دێمێ گەش و جوان, بێدەنگییەك بوری, بەری بێژتێ: تو یا بلەزی دمەشا خوەدا. ژنكێ ب دەنگەكێ نازك و نەرم, كو دلسوزییەكا ڤەشارتی ل دەف وی ئازراند, گۆتێ: ئەز دانپێددەم كو من گونەها كری.گرنژینەكا سەیر دچاڤێن وێدا برسقی, ئەوێ پولیس ئیشارەت بو بەرەڤ پێشڤە دا, ترومبێلێ خوە ژێ دویركر, ب بەرێخودانا خوە ب دویڤڤە بوو هەتاكو بەرزەبوی. دێمێ جوان و دەنگو گرنژین .. ئەڤە هەمی دوهی ب شەڤێ گۆت بوون. دگەل ژنا خوە ب شەڕ چوو بوو. دەمێ رازایە سەرنڤینان. خوە پێڤە نووساند و ئەو نەلڤی. چ مەلعینە! ئەو درانیت دێ چەوا تۆلا خوە ژێڤەكەت .. دێ لەشەكێ سار و نەلڤ دەتێ, ئەگەر ب پارا رازی نەكەت. رۆژ گەرمیا خوە لێ دبارینیت و جاددە یا ڤالایە. خەریبییەكا ب هێز گرت, كو نهو ل مال بیت و ل ژوورا خۆ یا

شهدار و ب رەخ ژنا خۆڤە یێ درێژکری بیت. رۆژ یا دژوارە، خوە ب نویسەکی ب هەمی لەشێ ویدا دهێتە خواریێ. چاڤێن وی مانە ب کچکەکێڤە ژدەڤێ ئاڤاهییەکی دەرکەفت. بەرەف وی دکانداریێ نێزیکڤە چوو. ئەویێ دکاندار سەرێ خۆ ژسەر دەفتەرەکا حیساباتان راکر. ب دەستی خوها ئەنیا خوە ڤەمالی، بەرێ خوەدا ویێ خداما ب ژوورکەفتی و ل بەرامبەری وی راوەستای. هند یا نێزیك بوو، ئەگەر خوە چەماندبا دا دێمێ ویێ ب مەمکێن ویێ کەڤیت. هند یا پێگەهشتییە هەتاکو وەلێ دکەت کو ژێ بترسیت. گەلەك جاران بڤێ هەستا خوە دکرە کەنی، گەلەك جاران ژێ هەولددا بەرسڤا لڤین و نیرینێن ویێ یێن بەردەوام بدەت، لێ ئەو هەستە هند یا ب هێز بوو، ژلڤینێ دئیخست. وی نەدزانی کا بوچی ناڤێ ویێ دهاتە بیرێ دەمێ ددانێن خۆ لسەر سێڤەکا پێگەهشتی دشداندن.

خدامێ لێ کرە گازی: تە چییە وەکو مرییان یێ هشك؟ تو یێ نەساخی؟ هلو ئەوا من دڤێت بدە من.

بو دەمەکی لێ دنێری و پاشی دەستەکێ لەرزۆك و بێن برسی درێژکرە مەمکێن تژی، خدام نەلڤی. لێ ب گرنژینەکا فرەه بو گرنژی، گۆتێ: ما تو یا بلەزی؟

- یێ ل هیڤیا من

- تو دێ ل ئێڤاریێ هێی؟

کەنییەکا نەرم بوکر و سەرێ خۆ بو هژاند، تبلێن خوە درێژکرن و قورنجیکەکا ب هێز ل لێڤا وی یا خواریێ دا. رۆژ ئاگرەکێ دینە، بابێ شهدار مرییە، جاددە یا نیڤ ڤالایە. عەتافێ سەرێ خوە دانا سەر سینگێ ماجدی و گۆت:

- ئەگەر بابێ من پێ بزانیت، دێ من کوژیت.

- ما تو یا پەشێمانێ.

- ئەز نە یا پەشێمانم .. ماجد دێ کەنگی من مارەکەی ؟

- خوشتڤیا من .. ل ڤان نێزیکان دێ تە مارەکەم.

ماجد بێدەنگما، عەتاف رابوڤە و گۆت: دێ چم .. ئەز گیرو بووم. ماجدی گەهاندە بەردەرگەهی، ژ نەدل همبێزکر. ماچیکر. یا کەیفخۆش و دێم گەش بوو. ژ دل ماچیکرێ بەری دەرگەهی ل دویف خوە بگریت. بلەز زڤریڤە ژوورا خوە، خوە هاڤێتە سەر کورسیکەکێ و هەست پێکر کو هەمی دەزی یێن وی ب ژیانێڤە گرێددەن، ژنشکەکێڤە یێن دهێنە قەتاندن و بتنێ یێ مای بیانی ژهەمی تشتێن دەوروبەران.

پرسیارا عەتافێ دناخێ ویدا ڤەژی: دێ کەنگی من مارەکەی؟ کەریێن من ژڤێ پرسیاریێ ڤەدبن، ویێ خوە تەسلیمی من کر و نهو ژی داخوازا بهایێ ڤێ تەسلیمبوونێ دکەت: مارەکرن.

هەر تشتەکێ دباژێریێ مندا بهایەکێ دیارکری هەیە. کەسەك چ تشتان بێ بەرامبەر نادەت. هەمی .. ژ جورەکێ دی یێ هەژی بازرگانن. ل هەمی جهان دبەلاڤن، خوە ل پشت پەردە یێن جودا جودا

ڤەدشێرن. من چەند ئەڤ جۆرێ مرۆڤان نەڤێت, ب دیناتی حەز ژێ ناکەم و کەربێن من ژێڤە دبن,
نهوژی بو من خویا بوو کو عەتاف ژێ ئێکە ژوانا. ژمن پرسیارکر: دێ کەنگی من مارەکەی؟
من بلەز و ب ساویلکەیی گۆتیێ: لڤان نێزیکان.
چارە چییە! مەژیێ من نەڤێت هزرێ بکەت. یێ بویە بەرەکێ رەق. ماجدی هەست ب دلتەنگییێ کر.
ژسەر کورسیکا خوە رابوڤە, قاپویتێ خوە کرە بەرخوە و ژ مال دەرکەفت و چوو سەر جاددێ.
جاددە ... ئارامگەها وییا مەزن بوو. هێدی هێدی دمەشیا و چ پویتە ب رۆژا گەرم و دین نە دکر.
عەتافێ گۆت: دێ کەنگی من مارەکەی؟
من بلەز و ب ساویلکەیی گۆتیێ: لڤان نێزیکان.
بەری نهو من خەون ب عەتافێڤە ددیتن کو ببیتە ژنا من, لێ .. نهو هەمی تشت هاتنە گوهورین.
خوەزی وێ ژ ئەڤینی خوە تەسلیمی من کربا, لێ پرسیارا کرێت, ئەوا ب دژواری داخوازا بهای دکەت:
"مارەکرن" هەمی تشت هەلوەشاندن.
ماجد راوەستیا, پالا خوە دا دیوارێ باخچەیێ ئاڤاهییەکی. چارە چییە؟ ئەرێ مارەکەم؟ بهایی وێ بدەمێ؟
ژبلی قەرفبوونێ چ ددی دناخێ مندا نینە. ئەزوێ مارە ناکەم. بلا سوباهی ب ئابرووچوون و ئارێشەیانڤە بهێت. ماجدی تف ددەڤێ خۆدا کومکر و هاڤێتە سەرعەردی, ب گرانی بەردەوامی ب مەشا خوە دا, ل هەمبەری وی ژی چیەنتۆ ب دێمێ خوەیێ ئەسمەر و وەستیایی .. لبن تیرۆژکێن رۆژا گەرم دنالی.

*        *        *

# سێدارەکرنا مرنێ

هارونێ رەشید دوو کور هەبوون, ئێکێ دگۆتنێ ئەمین, یێ دی دگۆتنێ مەئموون, کا چەوا حەز ژکورێ خوە یێ چوار سالی .. مەئموونی دکر, هەروەسا حەز ژخەلکی خوە ژی دکر.
دەمێ مەئموونی دگۆتیێ: باب ...
دلوڤانییەکێ هارونێ رەشید دگرت .. وەلێ دکر کو نە دشیا پەیڤەکێ ژی باخڤیت.

رۆژەکێ ژ رۆژان هارونێ رەشید ل باخچێ تەلارا خوە یێ روونشتی بوو. ب دلخۆشی سەح دکرە مەئموونی هەکو یاری دکرن. ژجهەکی بو ئێکێ دی دکرە غار. خوە د هەلاڤێت. کەنی یێن دلخۆش بەرددان. لێ .. ژنشکەکێڤە دیت کورێ وی روونشتە سەر عەردی. ب لڤینەکا بلەز و ژنشکاڤە پاشڤە چوو. هەروەکو دەستەکێ نە هێتە دیتن ئەو ب هێز یێ پالدای و یێ نەچارکری کو بێ لڤین بکەفتە سەر پشتا خوە.

هارونێ رەشید ب کەیف چاڤدێرییا کورێ خوە دکر.. ئەوێ کەفتییە سەر عەردی و نەلڤ بوی. دەمێ نەلڤینا وی درێژ بوی. گازیکرێ. چ بەرسڤ نەبهیستن. ب گرنژینڤە رابوڤە. دڤیا دگەل کورێ خوە وێ یاریا نوی بکەت. ژێ نێزیك بوو. داچەمیا هنداڤ. دیت یێ چاڤ نقاندی و پێتییە. پیچەکێ شەپرزە بوو. لێ بلەز ل خوە زڤری و هزرکر کو عەدەتێ مەئموونییە هەردەم حەز دکەت یارێ یێن نوی ب ئافرینیت. دەستێ خوە درێژکرێ و هژاند. دیت مەئموون وەکو کراسەکێ بێ لەشە. گەلەك ب ترس کرە هەوار. دختور داخوازکرن .. دختور هاتن. بوماوەیەکێ کورت مەئموون فەحسکرن. پاشی ب ئەنی گرێیی ژێ دویردکەفتن. دبونومی و سەرچەمیای. کەسەکێ جرعەت نەکر سەحکەتە هارونێ رەشید.

هارونێ رەشید گەلەك ما و دجەندەکێ مەئموونی دفوکری و هێڤ دکرێ. مەئموون لسەر عەردی یێ رازایی بوو. پاشی ب پێنگاڤێن هێدی هێدی چوو دتەلارا خوەڤە. لسەر کورسیکا خوە روونشت. ئەوێ پێگۆتی پێگۆت. یێ گریای کرە گری وگەلەك ژخەلکی سەرەخوشیا وی کرن. لێ هارونێ رەشید ما ڤە دێم هشك. ئەنی گرێ. نە پەیڤەك گۆت. نە روندکەك باراند. هەتاکو لەشێ بچووك بن ئاخکری. هینگی ئاخفت وگۆتە وەزیرێ خوە جەعفەرێ بەرمەکی:

- کا سەرکردێ لەشکەرێ من؟

سەرکردەیێ لەشکەری گۆت: ئەڤەمە ئەز سەمیانێ من. بو ماوەیەکێ درێژ ماوەرکرێ. هەروەکو بو جارا ئێکێیە دبینیت. پاشی ژێ پرسیار کر:

- توکی یی و کارێ تە چییە؟

- ئەز سەرکردێ لەشکەرێ سەمیانێ خوە مە و شیرێ وی یێ برەڕم.

- ئەرکێ تە چییە؟

- وەلاتی ژ دوژمنان دپارێزم.

- وەلاتی دپارێزی یان ژی ئەو مرۆڤێن دوەلاتیدا دژین؟

سەرکردێ لەشکەری پر ب باوەری گۆت: وەلاتی و مرۆڤان هەردووا.

بێ هیچ هەلچوونەك هارونێ رەشید بگریت. پرسیارکر و گۆتێ:

- بوچی تە مەئمووونێ کورێ من نە دپاراست ؟

ترسەکا نەپەن خوە ب سەر سەرکردێ لەشکەری دادا و بێدەنگییەك بوری هەروەکو چەندین سالن .

پاشی هارونێ رەشید ب دەنگەکێ تنگژینڤە گۆتێ:

- دبیت تو خائین بی و حەزێن دوژمنان ب جھ بینی.

سەرکردێ لەشکەری دڤیا باخڤیت لێ نەشیا . بتنێ هندەك پستە پستا کەس تێ نەگەهیت ژ دەڤی دەرکەفت . هارونێ رەشید گۆتێ:

- ما نە دبەرژەوەندا دوژمنانداپە کو کورێ من بمریت . ئەو کورێ دابیتە شوونگرتیێ من ل پاشەرۆژێ؟!

جەعفەرێ بەرمەکی گۆتێ: خێر دکورێ تە یێ ئەمین دایە . خودێ ژیێ وی درێژکەت. هارونێ رەشید ژکەربڤە لێخورێ:

- ئەز بەحسێ ئەمین ناکەم . ئەز یێ بەحسێ مەئموونێ مری دکەم.

ب هندەك بەرێخودانێن تنگژی هێڤ دکرە سەرکردێ لەشکەرێ خوە و گۆتێ:

- ئەز تە ل سێدارێ نادەم و هەتا هەتاییێ ژی تە زیندان ناکەم . لێ دێ سزایەکێ مەزنتر دەمە بەر تە . چونکو ئەز تبعەتێ تە دزانم .. ژنهو پاشڤە تو ژجهێ پلەدارییا خوە کەفتی.

هارونێ رەشید چاڤێ خوە لدورماندۆری خوە گێرا و هێڤ دکرە وەزیر و زێرەڤان و لەشکەر و یاوەر و هوزانڤان و دویڤەلانکێن خوە . زەلامەکێ راوەستای دیت . های ژعەمرێ دونیاییێ نە بوو گازیکرێ:

- ئەبو نەواس . کا نێزیکی من ببە.

ئەبو نەواسێ راهەژوك ژ هارونێ رەشید نێزیك بوو. هارونێ رەشید ژێ پرسیارکر: ئەرێ وەکو هەرجار دیسا تو یێ سەرخۆشی؟

ئەبو نەواسی گۆتێ: نە .. نە . پەرسیڤەکێ دژوار یێ لمن . ژبەر ئەگەرێ سەرمایەکا زەبیرییە . ئەڤ پەرسیڤەیە وەل من دکەت کو نەشێم ب رێڤە بچم.

جەعفەرێ بەرمەکی ب سەرسورماییڤە گۆتێ: سەرمایەکا زەبیری ل چلێ هاڤینێ؟!

هارونێ رەشید گۆتە ئەبو نەواسی: ئەرێ بەری نهو ژبلی ڤەهاندنا هۆزانان تە کارەکێ دی کرییە؟

ئەبو نەواسی لێ ڤەگەراند: یا فەر بوو کتێبێن مێژوویێ دیر بن ژشەهنازیکرنێ ب وان شەرێن لەشکەر تێدا بسەرکەفتین دەولەت سەرێ سەرکردایەتییا من .. لێ دیرۆکڤانا ژڤەستی ناڤێ من نەئینایە . چونکو من یا هاڤێتیێ.

هارونێ رەشید گۆت: ئەرێ جلکێن سەرکردایەتییا لەشکەری دێ ژتە هێن یان ژی دێ تە بڤان جلکان هەیبەتەك هەبیت کو هێژایی سەرکردێ لەشکەرێ من بیت. هارونێ رەشید ئیشارەتکرە سەرکردێ لەشکەرێ خوە و گۆتێ: جلکێن خوە بێخە ...

سەرکردێ لەشکەری یێ پاشپێشکی بوو. لێ هارونێ رەشید ب کەرب لێخوری. ئێکسەر سەرکردێ لەشکەری جلکێن خوە بلەز ئێخستن. بتنێ بنجلك هێلانە لبەر خوە. هارونێ رەشید گۆتە ئەبو نەواسی: ڤان جلکا بکە بەر خوە.

ب دەنگەکێ پر گازندەڤە لێ ڤەگەراند: پێدڤییە ئەز ژدەرڤە و ژناڤدا ببمە سەرکردێ لەشکەری.

هارونێ رەشید گۆتێ: مەخسەدا تە چییە؟!

ئەبو نەواسی ئیشارەتکرە بنجلکێن سەرکردێ لەشکەری یێ بەرێ و گۆت:

- ما یا بەرهۆزە کو ئەز جلکێن سەرکردەکێ لەشکەری لسەر بنجلکێن هوزانڤانەکی بکەمە بەرخوە. من شولەژێ نینە ئەگەر سیمایێ من نەیێ هەژی بیت.

هارونێ رەشید فەرماندا سەرکردێ لەشکەری یێ بەرێ کو بنجلکێن خوەژی بێخیت. دەنگێ وی یێ هشك و مجد بەس بوو کو سەرکردێ لەشکەری دەملدەست فەرمانا وی بجهـ بینیت و پاشی چبلاق و سەرشۆر راوەستیێت.

هارونێ رەشید گۆتێ: دێ هەرە مالا خوە و ژێ دەرنەکەڤی هەتا تە لسەر داربەستێ دەردئێخن.

ئەبو نەواسی جلکێن سەرکردێ لەشکەری کرنە بەرخوە وب بەژنا خوەیا زراڤ بەرامبەری هارونێ رەشید راوەستاو ب شەهنازی ژێ پرسی: رەئیا سەمیانێ من چییە؟

هارونێ رەشید ب کویری و ب هویری لێ نێری. زەلامەکێ نوی یێ پر هەیبەت دیت.. سەرێ خوە هەژاندو گۆتێ:

- من توکرییە سەرکردێ لەشکەرێ خوە.

جەعفەرێ بەرمەکیێ وەزیر گۆتێ: سەمیانێ من .. سیما و شێواز بتنێ بەس نینە ژبو سەرکەفتنێ دشەرٍ و پێکدادانادا.

هارونێ رەشید گۆتێ: ئەڤا تو دبێژی راستە. لەوا .. هێڤکرە ئەبو نەواسی و گۆتێ:

- ئەبو نەواس .. ئەز دێ هەفت رۆژان مولەتێ دەمە تە. دا تو پیلانەکێ دانی .. لەشکەرێ من بکەیە ب هێزترین لەشکەر دجیهانێدا کو چ جاران نەشکێت.

ئەبو نەواسی لێ ڤەگەراند: من چ مولەت نەڤێن. ئەو پیلانا تو ژێ دبێژی یا حازرە کو پێشکێشی سەمیانێ خوە بکەم و رەزامەندییا وی وەرگرم.

جەعفەرێ بەرمەکی ب پێترانکیڤە گرنژی. لێ هارونێ رەشید گۆتە ئەبو نەواسی: پلانا تە چییە؟

ئەبو نەواسی لێ ڤەگەراند: ئەز دزانم. دبیت ئەڤ پێشنیارە بو جارا ئێکێ یا سەیر بیت. لێ ئەگەر ئەم ب هویری لێ ڤەکۆلین دێ مفایێن وێ ئاشکرا بن.

جەعفەرێ بەرمەکی ب پێترانکیڤە گۆتێ: بێگومانە کو مفایێن وێ ژی هند گەلەکن ناهێتە هژمارتن.

ئەبو نەواسی گۆت: یا خویایە کو هەبوونا کچکێن سەماکەر دناڤ لەشکەریدا دێ دلخۆشییێ پەیداکەت و دێ ووڕەیا سەربازان بلندتر لێکەت, ئەگەر ووڕەیا سەربازان یا بلند بیت دێ ب مێرانی شەڕیکەن, هەروەسا دهەر شەڕەکیدا تیمێ کچکێن سەماکەر دێ جهێ ڤەجنقاندنا دوژمنی بیت. سەمیانێ من هزرکە دشەڕەکی ژشەڕاندا .. لەشکەرێ دوژمنی یێ خوە ئامادە دکەت کو بهێتە شەڕێ مە, بۆق بهێنە لێدان و دەهولا شەڕی بهێتە قوتان, ئەگەر ل دەسپێکێ و لبەراهییا هەمیا تیمێ کچکێن سەماکەر ب سەماڤە پێش بکەڤن .. دوی دەمیدا دێ چ روی دەت؟ چ پێ نەڤێت کو لەشکەرێ دوژمنی دێ ڤەجنقیت و دێ شەپرزە بیت و دێ بەهتیت, چاڤێن وان دێ ب کچکێن سەماکەرڤە بن و باوەر ژچاڤێن خوە ناکەن, نزانن کا دێ چ کەن, لەشکەرێ مەژی دێ ڤێ شەپلینێ ب دەرفەت بینیت و دێ هێرشەکا ئێکگرتی و بلەز بەردەتە سەر لەشکەرێ تەنگەزار و ژێکڤە قەتیاییێ دوژمنی, ئو دێ سەرکەفتنەکا ب ساناهی و سەد دەرسەد ب دەسڤە ئینن.

هارونێ رەشید گۆتێ: ب راستی پێشنیازا تە یا سەیرە.

ئەبو نەواسی ب گەرمی لێ ڤەگەراند: هەروەسا من گەلەك پێشنیازێن دی ژی هەنە.

هارونێ رەشید گۆتێ: دێ بومە بەحس ژێ بکە.

ئەبو نەواسی گۆت: دێ تیمەکێ مریشکان چێکەین.

جەعفەرێ بەرمەکی گۆتێ: ئو تە ژمریشکان ژی دڤێت شەری دناڤ رێزێن لەشکەریدا بکەن.

ئەبو نەواسی لێ ڤەگەراند: نە .. نە, کارێ مریشکان دێ بجە ئینانا ئەرکێ خوە یێ بەرێ بیت, ئەو ئەرکێ دگەل راهاتین, ئەو ژی هێك کرنە.

هارونێ رەشید گۆتێ: ئو لەشکەر دێ چ مفای ژهێکان بینیت؟ .. دبیت مەرەما تە پێ ئەو بیت کو دێ دگەل خوارنێ بکار هینن داکو لەشێ سەربازان ب هێز بکەڤیت؟

ئەبو نەواسی گۆت: نەخێر, دێ وەکو چەکێ شەڕی بکار هینن, ئەزبەنی هزر بکە سەربازەك ژ لەشکەرێ دوژمنی هێکەکا ب رویێ وی کەفتی, دێ چ کەت؟ بێگومانە کو دێ ب غار چیت دا رویێ خوە بشۆت, بڤێ چەندێ دێ سەربازەك ژلەشکەرێ دوژمنی کێم بیت, ئەڤجا ئەگەر هژمارەکا زۆر یا هێکا ب هاڤێینە سەربازێن دوژمنی, ئەنجام ئاشکرایە, ئەڤ چەکە دێ دوژمنی ڤەجنقینیت و دێ ئێکگرتنا رێزێن وی تێکچیت, نەمازە ئەگەر خوە بو بەرهنگارییا ڤی چەکی بەرهەڤ نە کر بیت.

هارونێ رەشید گۆتێ: تە هندەك پێشنیازێن دی ژی مایینە؟

ئەبو نەواسی لێ ڤەگەراند: گرنکترین پێشنیازا من ئەوە کو مرییا دناڤ لەشکەریدا بکار بینم, ل شوینا هندێ بێکار دگورێن خوەدا بن و چ مفای نەگەهیننە وەلاتی, ئەگەر دناڤ لەشکەریدا بن دێ تیمەکێ شەرکەرێ کەس نەبینیت پێك هینن, رۆلێ وان دشەڕاندا گەلەك گرنگە .. چونکو دۆژمن دێ شەڕێ

هەڤركەكی كەت نە دبینیت و نە دمریێ. چونكو ئەو بخوە مرینە. ڤێ تیمێ پێدڤی ب گەلەك پارا ژی نینە كو ژگەنجینێن سەمیانێ من دەركەڤن چونكو نە دخون و نە جلكا دكەنە بەرخوە. لێ هندەك جاران دێ هندەك خەلاتێن بچویك دەنێ. ئەز بخوە دێ ب كارێ بەلاڤكرنا ڤان خەلاتان رابم.

هارونێ رەشید گۆتێ: لسەر تە فەرە ژنهوڤە پێشنیازێن خوە بجھ بینی. ئەوا من دڤێت ئەوە كو لەشكەرێ من بكاریت جیهانێ هەمیێ داگیركەت.

ئەبو نەواسی لێ ڤەگەراند: ئو سەمیانێ من دێ بیتە میرێ هەمی جیهانێ.

هارونێ رەشید بێهنەكێ ب خەم هزرێن خوە كرن و پاشی گۆتێ: ئو ئەو مرنا كورێ من بری؟ ما دێ بێ سزا مینیت. كی دێ كورێ من زڤرینتەڤە ژیانێ؟

ئەبو نەواسی گۆتێ: هەر ئێكی ئەركێ خوە هەیە .. ئەركێ من وەك سەركردێ لەشكەرێ سەمیانێ خوە. ئەوە كو ل هەمی جهان دویفچونا مرنێ بكەم. هەتا دگرم و دگەهتە سزایێ خوە.

هارونێ رەشید گۆتێ: ئەز دێ شەش رۆژان مولەتێ دەمە تە. داكو مرنێ ل هەمبەری من ئامادەكەی و ئەز سزایەكێ ژهەژی وێ ب دەمێ.

ئەبو نەواسی ب دەنگەكێ خەموكیڤە گۆتێ: سەمیانێ من بلا ئەمری بدەتە سەربرِێ خوە كو سەرێ من ژێڤەكەت.

- بوچی؟

چونكو ئەز نەشێم داخوازیا تە بجھ بینم ئەگەر ب شەش رۆژ و دوو دەمژمێران نەبیت.

- ئەز مولەتێ درێژ دكەم و بوتە دكەمە شەش رۆژ و سێ دەمژمێر.

ئەبو نەواسی پر ب خوەشی گازیكر: من چ جاران خەون ژی بڤێ مەردینیێڤە نە ددیێ. تە دەمژمێرەك زێدەی پێدڤیا من زێدەكر. بڤێ چەندێ .. تە دا خویاكرن كو ب راستی تو بهایێ ئەركێن مەزن و ب رەحمەت درانی.

هارونێ رەشید گۆتێ: ئوكی دێ كورێ من زڤرینیتەڤە ژیانێ.

ئەبو نەواسی تبلا خوە درێژكرە جەعفەرێ بەرمەكی و گۆت: ئەڤ ئەركە ئەركێ وییە. هەردەم ترانە بمن دكرن و ئەز گونەهبار دكرم كو ئەز ژ وەختێ هەوە دكوژم و بەرزە دكەم. نهو ئەو دەم هات كو ئەختوباریا خوە بو سەمیانێ مە ب كار و كریار خویاكەت نە بەس ب ئاخفتنێ.

هارونێ رەشید گۆتە جەعفەرێ بەرمەكی: ما تە ئاخفتنا وی نە بهیست. تو بوچی بەرسڤێ نادەی؟

جەعفەرێ بەرمەكی گۆت: ئەزبەنی ئەوا تە بهیستی. بتنێ ئاخفتنا هوزانڤانەكێ فاسق و لێبوك و سەرداچوییە.

هارونێ رەشید ب دلتەنگی ئاخفتنا وی بڕی و گۆتێ: ما تە ژبیرکر، من ئەو یێ کرییە سەرکردێ لەشکەرێن خوە، یان ژی تە فەرمانا من نەبهیستییە؟ ئەوا هاتییە گۆتن نە ئاخفتنا لێبوکییە، لێ ئاخفتنا سەرکردێ لەشکەرێن منە.

جەعفەرێ بەرمەکی لێ ڤەگەراند: ئو چ ژمن دڤێت؟

هارونێ رەشید گۆتێ: تو یێ هەولددەی ئەوا ژتە داخوازکری پشت گوهـ پاڤێی، لێ ئەڤ پویتە پێ نەکرنە، تە ژئەرکێ تە عەفو ناکەت، ئەو ژی زڤراندنا کورێ منە بو ژیانێ.

جەعفەرێ بەرمەکی ب ترس و هیڤیکرنڤە گۆتێ: ئەزبەنی ما تە بهیستییە کەسەك مری و پاشی زڤریەڤە ژیانێ.

هارونێ رەشید ب دلتەنگی گۆتێ: وەسا دیارە تە دڤێت ئەزمونەکێ بمن بکەی دا بزانی کا من چ بهیستییە و چ نە بهیستییە، ما تە ژبیرکر ئەز کیمە؟

ئەز نە خویندکارێ خواندنگەهێمە، من دڤێت کورێ من بزڤریتەڤە ژیانێ.

- ئەڤە کارەکە چ کەس نەشێن پێ رابن.

ئەبو نەواسی گۆت: سەمیانێ من دێ رۆخسەتێ دەتە من کو باخڤم؟

- باخڤە ئەگەر ئاخفتنا تە .. کورێ من ساخکەتەڤە و ب ڤەگەرینتەڤە ژیانێ.

ئەبو نەواسی گۆت: مادەم جەعفەرێ بەرمەکی دان پێ ددەت کو یێ لاوازە دڤێ ئەرکیدا، ئەڤە تشتەکێ سروشتییە، چونکو یێ ساخە، لێ ئەگەر مر، هینگی دێ شێت کورێ تە بینیت و هەروەسا دێ شێت بزانیت کا دێ ب چ رێك وی ساخکەت و زڤرینیتەڤە ژیانێ.

هارونێ رەشید گۆتێ: ئەوا تو دبێژی راستە، لێ ژبو دەمانکرنا سەرکەفتنا ڤی ئەرکی، فەرە باشترین زەلامێن خوە بو ب هەلبژێرین.

بێهنەکێ هزرێن خوەکرن، پاشی گۆتە وەزیرێن خوە، بێگومانە کو هوین باشترین زەلامێن منن، دێ شاندەکی پێك هینن و دێ چنە دیدارا کورێ من .. داکو بزانن کا دێ چەوا ساخکەن و ب چ رێك دێ شێن زڤریننەڤە ژیانێ. لێ، جەعفەرێ بەرمەکی دگەل وە ناهێت، چونکو وی دیارکر کو نە یێ دلسوزە بو من، دبیت تشتەکی بکەت کارێ هەوە تێك بدەت، ئەو وەکو هەوە نامریت، لێ دێ مینیت داکو چاڤدێرییا هەسپێن من بکەت. وەزیران ب سەرسورمایی و پڕ ترسڤە هێڤ دکرنە هەڤ، لێ ڤێ هەڤ بەرێخودانێ دوم نەکر دەمێ هارونێ رەشید فەرمان دایە سەربڕێ خوە، سەرێن وان فرینە سەرعەردی و پاشی ل جەعفەرێ بەرمەکی زڤری و گۆتێ: هەرە و کارێ خوە یێ نوی وەرگرە، هەسپێن من فێرکە کو کوری یێن خوە نە هەژینن داکو ژهەسپێن دی دجودا بن.

جەعفەرێ بەرمەکی سەرێ خوە چەماند، گوهداری و پێگیرییا خوە دەربڕی و ب غار چوو ژ دەرڤە.

وێ شەڤێ هارونێ رەشید چو دخەوەکا کویردا .. دخەودا ددیت کورێ وی یێ بچووك یێ دناڤ دەشتەکا خەملاندی ب گیایێ کەسکدا یێ دکەتە کەنی و ب یاریڤە دکەتە غار. دیت وەزیرێن وی بێ سەر نێزیك دبن. کورێ وی دهەلگرن و هێدی هێدی دبەن. ب دەنگەکێ فەرماندەیی لێ کرە هەوار: زوی بن .. ئەز گەلەك یێ ژکورێ خوە خەریب بویم. یێ ژکەنیا وی و دەنگێ وی خەریب بویم. ئەز خەریبێ دەستێن وی یێن بچووکم . دەمێ دکرنە رویێ من و یاری ب ریهێن من دکرن. لێ وەزیران چ پویتە ب هەوارێن وی یێن فەرماندەیی نەکرن. لسەر رێڤەچوونا خوە یا هێدی دبەردەوام بوون. هارونێ رەشید گەلەك تنگژی و ئێکسەر ژخەو هشیار بوو. خوە دیت یێ لسەر تەختێ خوە .. هنارتە د دویڤ ئەبو نەواسی را . خەونا خوە هەمی بو ڤەگێرا.

ئەبو نەواسی گۆت: ئەوێن بێ قیمەت خیانەت ل سەمیانێ خوەکرن. ئەزبەنی باشترە تو خوە ل هیڤیا زڤرینا وان نەگری.

هارونێ رەشید ب دوودلیڤە گۆتێ: پا چ بکەم ؟

ئەبو نەواسی لێ ڤەگەراند: دەمێ مرن ل هەمبەری سەمیانێ من ئامادە دبیت و دکوژیت. پێ نەڤێت دێ هەست ب بێهن فرەهییەکێ کەت .. چونکو دێ تولا خوە ژ بکوژێ کورێ خوە ڤەکەت.

- ئەز گەلەك یێ ل هیڤیا وی وەختی.

- بلا سەمیانێ من یێ ئێمن بیت کو هاتنا وی وەختی نە یا دویرە. دویفچونێن من لسەر مرنێ سەرکەفتنێ لدویڤ سەرکەفتنێ ب دەستڤە دئینن. دڤان چەند رۆژێن بهێندا دێ جهێ وێ ڤێ کەڤم و دێ وولکری و سەرشۆر ئینمە خزمەتا هەوە.

هارونێ رەشید ب گەفڤە گۆتێ: ئەو مولەتا من دایە تە ژبیر نەکەی. ئەگەر مولەت تەڤاڤ بوو دێ پەشێمان بی. چارەنڤیسێ تە ژی یێ دیارە.

گرنژینەکا پر ب باوەری لسەر لێڤێن ئەبو نەواسی هاتە نەخشاندن و دەرکەفت. رۆژا پاشتر ب دلخۆشی زڤری و سەربازێن وی زەلامەکێ جلك دریای و پێخواس لدویڤ خوە دراکێشا .. خوینێ ژ سەروچاڤێن وی دهەلاڤێت.

- ئەزبەنی .. ئەڤە یە هەڤرکێ تە.

- ئەڤە کییە؟

- ئەڤە ئەو مرنە ئەوا کورێ تە کوشتی.

هارونێ رەشید گۆتە وی زەلامی: تویی مرن؟

زەلامی ب دەنگەکێ کزگریوکیڤە گۆتێ: ئەز کەسەکێ هەژارم.

ئەبو نەواسی ب گەف ئاخفتنا وی برِی و گۆتیێ: راستییێ بوسەمیانیێ مە بێژە. ئەگەر دێ تە زڤریننەڤە ژوورا تویێژاندنیێ.

زەلامی ب ترس لێ ڤەگەراند: نە .. نە.

- بێژە کو تو مرنی.

هارونێ رەشید ژی گۆتیێ : ئهێ .. تو درەوا بکەی.

زەلامی ب دەنگەکێ نزم گۆتیێ: ئەزم .. مرن.

- تە بوچی کورێ من کوشت؟ ئو بوچی تە دلوڤانی  ب زارۆکینییا وی نە دبر؟

زەلام شەپلی و چ بەرسڤ نەدان. ئەبو نەواسی گۆتیێ: کا تە ل دەمێ تویژاندنیێ چ دگۆتە مە. ئەوێ بیژە سەمیانیێ مە ژی.

- مامن چ گوتییە؟

- تە دگۆت کو تو هەڤالبەندێ دوژمنێن سەمیانیێ منی و تە مەئموون کوشت ژبو بجە ئینانا حەز و پیلانا وان.

زەلامی گۆت: هەما ب دروستی من ئەڤە یا کری.

ئەبو نەواسی ب بەرێخودانەکا سەرکەفتییانەڤە  هێڤکرە هارونێ رەشید و گۆتیێ:

- ئەزبەنی تە ب گوهێن خوە دانپێدانا وی بهیست؟

هارونێ رەشید ب هندەك بەرێخودانێن هویر و کویر هێڤ دکرە زەلامی. لێ ئەبو نەواسی گۆتیێ:

- سەمیانێ من خوە ل چ دگریت؟

- ئەز یێ هزرێن خوە دکەم کا کیژ مرن دێ وی پتر ئێشینیت.

- ب ساخی بسوژە.

هارونێ رەشید فەرماندا کو وی زەلامی ب ساخی ب سوژن. ئەڤ بریارە ئێکسەر بجە هات و ئەو مرن بو خوەلی.

پشتی هەیامەکێ . هارونێ رەشید ب خەمڤە گۆتە ئەبو نەواسی: هێشتا ئەز یێ مجدم کو کورێ من بزڤریتەڤە ژیانێ.

ئەبو نەواسی گوتیێ: من کچەك هەیە. لسەر روییێ عەردی کەسەك ژ وێ ئاقلتر نینە. لێ یا خوە دینکری. ئەگەر تو ژێ پرسیار کەی دبیت مەرەما تە بجە بینیت.

هارونێ رەشید فەرماندا کو بلەزوێ کچکێ بو بینن. کچا ئەبو نەواسی ئینا دیوانا هارونێ رەشید و هاریکاری ژێ  داخوازکر.

بێهنەکێ هزرا خوە کر. پاشی گۆتێ: کورێ تە وەکو بەرێ نا زڤریتەڤە ژیانێ لێ دبیت ب شێوازەکێ دێ یێ جودا بێتن. گەلەك جورێن تۆڤا لسەر تربا وی بچینە. دەمێ شین دبن ئەو کورێ تەیە زڤرییەڤە ژیانێ.

هارونێ رەشید گوهێ خوە دا شیرەتا وێ. لسەر گورێ داڕپرتەقالەکا بەلگەکەسك شین بوو. خەما هارونێ رەشید کێمتر لێهات. پرانیا دەمێن خوە ل نێزیکی وێ دارێ دبوراندن. دەمێ با دهات و بەلگێن دارێ دهژاندن وی بتنێ گوهـ ل دەنگەکی دبوو دگۆت: باب .. باب ..

رۆژەکێ هارونێ رەشید بهیست کو مرن هەر رۆژ خەلکەکی ژهەڤوەلاتی یێن وی دکوژیت. حەییری. لێ ئەبو نەواسی گۆتێ: مە مرنا باپیر بتنێ یا کوشتی .. مە نەڤی و کورێن وێ نەکوشتینە. ئەو ژی گەلەکن.

– ئەز فەرمانێ ددەمە تە کو توکتەکێ ژوان نە هێلی.

– ل هەرچوار قولاچێن عەردی دبەلاڤن. لێ پێزانینێن من لسەروان دهویر و دروستن. وان ئاشکرا دکەن و ئەو جهێن خوە لێ ڤەدشێرن دەسنیشان دکەن.

– تە خوە ل هیڤیا چ گرتییە؟

– ل کیڤە بن. کتەکێ ژوان ناهێلم.

لەشکەرێن وی ب رێ کەفتن و کچکێن سەماکەر ل پێشیێ بوون. هندەك تیمێن لەشکەری ب هێکا دچەکدار بوون. ئو هندەك تیمێن مرییان ژی دگەلدا بوون. هەمی گویا زەمین داگیرکر لدویڤ مرنێ و نەڤی یێن مرنێ دگەریان. ئو ل گورەی فەرمانێن ئەبو نەواسی هێرشێن قوتبرێ دبرنە سەر. لێ ئەڤ فەرمانا قوتبرێ راوەستا چونکو ژنشکەکێڤە ئەبو نەواس مر. هارونێ رەشید ژی ما بێ شیرەتکار. جارەکا دی دخەما وەر بوو. لێ پیچەکێ کەیفا وی هات دەمێ زانی کو جەعفەرێ بەرمەکی یێ شیای هەسپێن وی وەسا فێرکەت کو کوری یێن خوە نە هەژینن.

پشتی چەند سالەکا هارونێ رەشید مر. دارا پرتەقالێ تا و بەلگێن خوە وەراندن و مەئموون ژێ دەرکەفت و چوو د تەلارێڤە و لسەر کورسیکا حوکمی رویننشت. کەیفا خەلکی هات. کەیفا هەسپان ژی هات و زڤرینەڤە سەرعەدەتێ خوە یێ بەرێ و ب بەردەوامی کوری یێن خوە دهەژاندن.

*　　*　　*

# ژ ئەلیفێ بو یائێ

## 1. شەڤا سولتانی و هەڤالێ وی

سولتانی فەرماندا کو شەڤ بهێتە نك, شەڤا ب رەشاتیێ خەملاندی و مشتی ستێرێن ترسیای هات, باوشکا سولتانی هات, باوشکا هەمی مللەتێ وی ژی هات و نڤستن.

سولتانی گۆتە سەرەك زێرەڤانێن خوە: ئەگەر ئەز نڤستم, من هشیار نەکەی خو ئەگەر هەمی مەلیکێن جیهانێ لسەر تێلەفونێ بن.

سەرەك زێرەڤانان بو خویاکر کو دێ ل دویف فەرمانان کارکەت و ناهێلیت چ بویەر یان چ کەس سولتانی هشیارکەن, لێ سولتانی ب تورەییڤە لێ کرە هەوار: لێ ئەگەر شەرەکێ جیهانی چێبوو, دڤێت من هشیارکەی داکو بلەز راوەستینم و ئەوێن بوینە ئەگەرێ شەری سزادەم.

وێ شەڤێ چ شەرێن جیهانی چێ نەبوون و هەتا سپێدێ سولتان ما نڤستی .. سپێدێ سولتانی بانگکرە سەرەك وەزیرێن خوە و گۆتێ: تو دزانی کو شڤێدی بەری نڤستنێ, من هزر درەوشا مللەتێ خوەدا دکر؟

ب سەرسورماییڤە سەرەك وەزیران گۆتێ: وەی لەعنەت لسەر دیرۆکڤان و ئەدیبان بن.

سولتانی ب حێبەتیڤە پرسیارکر: تو بوچی لەعنەتا لێ دبارینی؟

سەرەك وەزیران گۆت: چونکو کەمتەرخەمیێ دتومارکرنا باشی یێن سولتانێ سەمیاندا دکەن, سەمیانێ مە هەتا ددەمێ بهێنڤەدانا خوەدا ژی هزرا رەوشا مللەتێ خوە دکەت .. چ حاکم ژحاکمێن لسەر گویا زەمینێ ڤی کاری ناکەن.

سولتانی گۆت: من گەلەك هزرا خوە کر و من وەسا دیت کو کابینا تەیا وەزارەتێ یاکەڤن بوی و یا پێدڤی ب نویکرنێ بوی

سەرەك وەزیران گۆت: ب راستی پێدڤی نویکرنێیە, هەر مالەکا نەهێتە نویکرن و نوژەنکرن دێ هەرفیت و بیتە کاڤل.

سولتانی گۆت: ئەزێ دبینم پرانیا وەزیرێن تە کالە پیرن.

سەرەك وەزیران گۆت: ئەڤە راستە, هەمی وەختێ وان یێ تەرخانکرییە ژبو کرینا گورێن هەژی و فرەه, ئو هەروەسا دمژویلن ب کرینا کفنا و نڤیسینا وەسیەتێن خوەڤە .. ژێرن و راستڤەکرنا وەسیەتان و مانا وان ل هیڤیا وێ رۆژا پێزانا چ کەس نەشێت ژێ برەڤیت, هەمی وەختێ وان دبەتن.

سولتانی گۆت: ژبەر ڤێ ئەگەرێ من بریاردا کو کابینا تەیا وەزاری بهێتە گوهورین و هندەك وەزیرێن گەنج جهێ وان بگرن داکو راسپاردنا ڤی ئەرکێ مێژوویی بکەمە ددەستێ تە دا.. لسەر بەرسڤدانا ڤێ پرسیارێ د راوەستێت, ئەگەر رۆژەکێ تو چویە مال و تە ژنا خوە دیت یا ب رەخ کەسەکێ بیانیڤە و لسەر نڤینکێن تە یێ رازاییە, دێ چ کەی؟

سەرەك وەزيران گۆت: دێ نرم و كەمە هەوار، كا ...موعتەصم !! لێ ئەز چ كرياران ناكەم بەری رەئيا سەميانێ خوەيێ سولتان وەردگرم.

سولتان كەنی و گۆتە سەرەك وەزيرێن خوە: هەتا نهو تو هەر يێ مای ئەو زەلامێ ژيرمەندو بليمەت و جوانمێر كو هەر بمينی سەرەك وەزيرێن من، دەست پێ بكە، وەزيرێن خوە يێن نوی ب هەلبژێرە، لێ يافەرە تو گرنگيێ بدەيە وەزارەتێن شەری و رەوشەنبيری و ئابوريێ، چونكو ئەڤ وەزارەتە دگرنگو هەستدار و ترسناكن، هەڤبەنديەكا سەرەكی ياب پاشەرۆژا وەلاتی و هەنوكەيی يا هاوولاتيانڤە هەی.

سەرەك وەزيران ب دەنگەكێ رەزيل و مشتی كەيف پەيمان دايێ كو ئێكسەر فەرمانا وی ب هەمی هويراتيێن خوەڤە دێ بجە هێت.

## 2. هەلبژارتنا وەزيرێن نوی ژلايێ سەرەك وەزيرانڤە

سەرەك وەزيران ل نڤيسينگەها خوە پێشوازييا هندەك گەنجێن پيشە جودا و ژ تەخێن جڤاكی يێن ئاست جوداكر، يێ رژد بوو كو كت كتە بتنێ ببينيت، يێ بەراهيێ هاتييە پێشوازيكرن، گەنجەكێ دختور بوو..

سەرەك وەزيران: ئەرێ بەری نهو تە پشكداری دشەراندا كرييە.

دختور: شەرێن من ناهێنە هژمارتن، رۆژانە دژوورێن عەمەلياتێن خەستەخانێڤە كومەكا شەران دكەم، ئەز ب ناڤودەنگترم ژهەر كەسێ كێربڕ هەلگرتی، ئەگەر ئەز دەست ژكارێ خوە بەردەم دێ گوڕكولەر ژ برسادا مرن.

سەرەك وەزيران: ئو رەوشەنبيرييا تەيا لەشكەری چييە؟

دختور: من پتر ژسەد خونيشاندانێن لەشكەری ديتينە و هەروەسا من سێ جاران فلمێ شەری (ئارمانجا مە بۆرمايە) يێ ديتی.

سەرەك وەزيران: ئو تەچ شارەزايی دبياڤێ لەشكەريدا هەيە؟

دختور : جارەكێ لبەر دەرگەهێ تياترويەكێ، ئەز دگەل سێ كەسان ب شەر هاتم و ئەز ب تەنا خوە، شيام بشكێنم و من نەچاركرن كو پێلاڤێن خوە بێخن و ژ وەلاتی ب رەڤن و بچنە ژدەرڤە.

سەرەك وەزيران: ئەگەر تو وەزيرێ بەرگريێ بی و وەلات ژلايێ لەشكەرەكێ بيانيڤە لبن گەفا داگيركرنێدا بيت، دێ تو چ كەی؟

دختور: دێ بەیانەکا حەماسی دەرئێخم و دێ ب دژواری هاڤێمە دوژمنی و دێ داخوازێ ژ خەلکیکەم کو چەکی هەلگرن. پاشی دێ چمە خوارنگەهێ و دێ ژ دل خوارنێ خوم. داکو بدەمە خویاکرن کو وورە یا بلندە.

سەرەك وەزیران: ئەرێ ب هزرا تە ئەرکێ لەشکەری چییە؟

دختور: ئەرکێ لەشکەری ئەوە شەرێ دوژمنێن سەمیانێ مەیێ سولتان بکەت و ئەرکێ خەلکی ژی ئەوە بەرگرییێ ژ وەلاتی بکەن.

سەرەك وەزیران: تویێ ژدایکا خوە بوی کو ببییە وەزیرێ بەرگرییێ .. نە دختورێ خەلکی دەرمان دکەت.

پاشی سەرەك وەزیران پێشوازییا رەوشەنبیرەکی کر کو تازە یێ ژخواندنگەهێن نەهێلانا نەزانینێ دەرچوی و پر شانازیێ بخوە دبەت کو یێ پێگیرە.

سەرەك وەزیران: خواندنا تە چییە؟

رەوشەنبیر: من ل چ خواندنگەهان نەخواندییە. ئەز مینا مەکسیم گورگیمە. لێ پیچەکێ ژوی جودا مە. ئەو دەرچوییێ خواندنگەها ژیانێیە و ئەز دەرچوییێ زانکوا ژیانێمە. مەکسیم گورگی رۆمانەك لبن ناڤێ "دایك" یا نڤێسای و ئەز ژی دێ رۆمانەکێ لبن ناڤێ "باب" نڤێسم.

سەرەك وەزیران: ئەڤێ هەڤوکێ شی بکە: کورکی پشیك قوتا.

رەوشەنبیر: "کورك" تەڤاڤکەرە و "پشیك" ئاژەلەکێ کەهییە و "قوتا" ئامرازێ هەڤبەندیێیە.

سەرەك وەزیران: تە چ پێزانین دەربارەی شەکسپیری هەنە؟

رەوشەنبیر: شەکسپیر خودانێ پەیمانا رەش یا بەلفورییە.

سەرەك وەزیران: ئەڤ وەلاتە چەند ل وەزیرەکێ رەوشەنبیریێ بگەریێت کەسێ ژ تە باشتر نابینیت.

پاشی سەرەك وەزیران پێشوازییا بازرگانەکی کر.

سەرەك وەزیران: کی بەرپرسە؟ ئەگەر هاوولاتییان گازندە کرن و کرنە هەوار کو دبرسینە.

بازرگان: یێ بەرپرس دەزگەهێن راگەهاندنێنە. ئەوێن نەشیاین هاوولاتی قایلکەن کو هزرکەت یێ تێرە.

سەرەك وەزیران: رەئیا تە ب برسێ چییە؟

بازرگان: برسیبوون درێکا وەلاتیدا ئارمانجەکا بلندە کەس ناگەهتێ. ئەو وەلاتێ برسی تێدا د زۆر بن. مروڤێن بلیمەت دێ ژێ دەرکەڤن.

سەرەك وەزیران: ئەگەر فێقی ل بازاری نەما. دێ چ کەی؟

بازرگان ئێکسەر دێ وێنەیێن رەنگاو رەنگێین فێقی چاپکەم و دێ ب هەروە لسەر خەلکی بەلاڤ کەم. داکو ئاشۆپ و شیانێن وان یێن داهێنانی چالاکتر لێ بهێن.

سەرەك وەزیران: ب هزرا من پێدڤی ناكەت زێدەتر پرسیاران ژتە بكەم. یا خویایە كو كەسەك ژتە باشتر نینە. ببیتە وەزیرێ بازرگانیێ.

پاشی سەرەك وەزیران پێشوازییا زەلامەكێ هەژار و ساویلكە كر. كو گەلەك جاران ب گێلاتیێ یێ هاتییە گونەهباركرن.

سەرەك وەزیران: ناڤێ تە چییە؟

هەژار: نە ل بیرا منە.

سەرەك وەزیران: تو چ كار دكەی؟

هەژار: ئەز چ كاران ناكەم.

سەرەك وەزیران: رەئیا تە ب هەڤسەنگییا ستراتیژی چییە؟

هەژار: من چ رەئی نینن.

سەرەك وەزیران: ئەگەر تو ب رێكا خوە بچی و تو خو نیشاندانەكێ ببینی. دێ چ كەی؟

هەژار: ئەز نزانم.

سەرەكێ وەزیران. ب دلتەنگی هێڤ دكرێ و فەرمانا گرتنا وی دا. چونكو وەسا هزر دكر ئەگەر سولتان پێ بزانیت. دێ ل شوینا وی كەتە سەرەكێ وەزیران. ژبەركو ئەوێ داخواز لسەر ئەوە یێ نەزانیت و تێ نەگەهیت و هزر نەكەت.

سەرەكێ وەزیران پێشوازییا گەلەكێن دی كر. یێ هەلبژارتی هەلبژارت و یێ نەڤیای دەرێخست و كابینا وەزارەتا نوی ژهندەك گەنجێن ب هێز دامەزراند. ئەڤ كابینە جهێ رەزامەندییا سولتانی بوو. غاردانا وەلاتی. دەولەتسەرێ ڤێ كابینێ پاشڤە زڤری. چونكو شیانا گەنجان بو غاردانێ یا جودایە ژشیانا پیرەمێران.

*    *    *

# ژنکەکا بتنێ

عەزیزا کچکەکا جوانە، ژکتکێن رەش دترسیت، دەمێ ل بەرامبەر شێخ سەعیدی روونشتی گەلەك یا ئالوز بوو، هەردوو چاڤێن وی دوو پرتێن رەشاتییەکا کویڤی بوون، عەزیزا دوورپێچکر بوو.. هەولددا

خوە ژ وێ ترسا بەرەبەرە زێدە دبیت رزگارکەت ، لێ بێهنا بخوورێ ، ئەوا ژ ترارەکێ فافونی بلند دبوو ، دفنا وێ دسوت و هێدی لەشێ وێ بێهوش دکر.

شێخ سەعید دبێژیت: ڤێجا .. تە دڤێت مێرێ تە لتە ب زڤریت؟

عەزیزایێ ب دوودلی گوت: من دڤێت بو من بزڤریتە ڤە. ل وی دەمێ شێخ سەعید دگرنژی عەزیزایێ ب خەمۆکیڤە دگوت: مروڤێن وی دڤێن ژنەکا دی بو بینن.

شێخ سەعیدی هندەك بخوور دهاڤتە دترارێدا و دگوت: مێرێ تە .. دێ بوتە زڤریت و چ ژنێن دی نائینیت.

دەنگێ وی یێ هێدی و پر هەیبەت بوو. عەزیزا پێ ئارام و ئێمن دبوو. ئاخینکەکا درێژ و مشت ژ ئارامیێ راهێلا ، دێمێ شێخی گەش بوو. گۆتێ : لێ کارێ من پێدڤی ب پارەکێ زۆر هەیە.

عەزیزا بوغومی و هێڤ دکرە بازنکەکێ زێری دزەندا خوەدا و گوت: هندی تە بڤێت ئەز دێ دەمە تە.

شێخ ب کەنییەکا کورت و دژوار کەنی و پاشی گوت: دێ پیچەکێ خسارەت بی ، لێ دێ زڤرینا مێرێ خوە ڤازانجکەی .. تو حەز ژێ دکەی؟ عەزیزایێ ب دلتەنگی غولغولەك کر: ئەز حەز ژێ ناکەم.

- هوین ب شەڕ چوینە؟

- ئەز دگەل مرۆڤێن وی یا ب شەڕ چویم.

- تو هەست ب دلتەنگیێ دکەی؟

- هندەك جاران ، ئەز وەسا هەست پێ دکەم کو بەرەکێ گران یێ لسەر سینگێ من.

- ل دەمێ نڤستنێ تو خەونێن نەخۆش دبینی؟

- هەردەم ب شەڤ ئەز ژ ترسادا هشیار دبم.

بو چەندین جاران شێخ سەعیدی سەرێ خوە هژاندو گۆتێ: هەبیت نەبیت مرۆڤێن مێرێ تە .. سحرەکا لتە کری.

عەزیزا ترسیاو هەوارکر: چارە چییە؟

- بەتالکرنا سحرا وان پێدڤی ب هندەك بخوورێ هەیە ، بهایێ وێ دەه لیرەنە ، عەزیزا پیچەکێ تێکچوو .. پاشی دەستێ خوە گەهاندە بەرسینگێن خوەو دەه لیرە ژێ ئینانە دەر و دانە شێخ سەعیدی و گۆتێ: ئەڤە هەمی هەییێ منە.

شێخ سەعید رابوڤە ، پەردێن تاری بسەر پەنجەرێن لهنداڤ کولانکا تەنگکێشان و پاشی هاتەڤە و ل بەرامبەری وی ترارێ فافونی ، ئەوێ هندەك پەلێن لسەر خولیەکا نەرم و سپی گەش دکرن ، روونشت ،

دەست پێکر بخوور دهاڤێته دناڤدا ودگۆت: برایێن من یێن ئەجنە حەز ژ رۆناهیێ ناکەن، حەز ژ تاریێ دکەن، چونکو مالێن وان لبن عەردینە.

رۆژ ژی ژدەرڤەی ژووریێ ژنکەکا گوشت سپی بوو، ئو تیروژکێن رۆژێ رۆناهیا خوە یا زەر ل کولانکا دبرسڤاند و دگەل هەرایا خەلکی تێکهەل دبوو، بتنێ ژوورا شێخ سەعیدی یا تاری و بێدەنگبوو.

- برایێن من یێن ئەجنە، دێ بەختێ تە یێ باش بیت ئەگەر حەز ژ تە بکەن، ئەو حەز ژ ژنکێن جوان دکەن. عەبایێ خوە بێخە. عەزیزایێ عەبایێ خوە یێ رەش ئێخست، لەشێ وێ یێ تەر ل پێش چاڤێن شێخ سەعیدی دکراسەکێ تەنگدا بوو، شێخی دەست پێکر کتێبەکا پەر زەر ب دەنگەکێ هێدی و نە ئاشکرایی دخواند، پاشی گۆتێ: خونێزیك کە .. خوە لڤێرە درێژکە .. عەزیزایێ خوە لبەر تراریێ بخووریێ درێژکر، شێخ سەعیدی دەستێ خوە دانا سەر ئەنیا وێ و هەر ئەو پەیڤێن سەیر دخواندن، ژنشکەکێڤە گۆتە عەزیزایێ: چاڤێن خوە ب نقینە، دێ برایێن من یێن ئەجنە هێن.

عەزیزایێ چاڤێن خوە دانانە سەرێك، دەنگێ شێخی ب هشکی وفەرماندەیی بلند بوو: هەمی تشتا ژبیر بکە.

دەستێ شێخی بسەر دێمێ وێ یێ نەرمدا دهێتە خوار.. بیرا وێ و بابێ وێ هات. دەستێ شێخی زڤرە و بێهنەکا سەیر ژێ دهێت، دەستەکێ مەزنە، دڤێت یێ پر چرمسین بیت، دەنگێ وی یێ سەیرە و بەرە بەرە دویێ ژوورا بێدەنگا دیوارێن ئاخێڤە بلند دبیت. دەستێ شێخی دگەهتە حەفکا عەزیزایێ، بیرا عەزیزایێ و دەستێ مێریێ وێ هات. دەستێ وی یێ تەر و نەرمە مینا دەستێ ژنکێ. وەکو نڤیسەر ل دکانا بابێ خوە کار دکەت. چ جاران هەول نە دایە ب نەرمی یاریا ب حەفکا وێ بکەت، هەردەم ب هندەك تبلێن برسی گوشتێ رەهنێ وێ دگڤاشت.

شێخی هەردوو دەستێن خوە دانانە سەر لەشی، دەستێن وی ب دلوڤانی مەمکێن وی یێن پێگەهشتی دپەرخینن و ژووردا ل هەمی لەشێ وێ دگێرینن و پاشی دزڤرنەڤە مەمکا و بێ دلوڤانی و ب هێز دشدینن، عەزیزایێ ئاخینك راهێلان، گەلەك ب زەحمەت چاڤێن خوە ڤەکرن .. دیت کادیەکا سڤك ل هەمی بوشایی یا ژووریێ یا بەلاڤبوی.

شێخ سەعیدی دەستێن خوە ژ عەزیزایێ دویرکرن، بەردەوام بوو لسەر خواندنێ و بخوور دهاڤێتە سەر پەلێن گەش .. ئەوێن دوی تراریێ ڤافونیدا، پاشی گۆتێ: دێ برایێن من یێن ئەجنە هێن .. دێ هێن. تەزینکەکا دژوار بسەر لەشێ عەزیزایێ دا چوو خوار، چاڤێن خوە نڤاندن .. گوهـ ل دەنگێ شێخ سەعیدی بوو، هەروەکی ژ دوماهیا دونیایێ دهێت، دگۆت: برایێن من یێن ئەجنە حەز ژ ژنکێن جوان دکەن، تو یا جوانی و دێ حەز ژتەکەن. دەمێ دگەهن .. فەرە تە رویس ببینن، داکو هەمی سحرا ژتە دویربێخن.

عەزیزایێ ب ترس پستە پستەك دكر: نە .. نە.

ئێكسەر دەنگێ شێخی وەكو دەنگڤەدانێ ب مجدی هاتێ: ئەگەر حەز ژ تە نەكەن, دێ تە ئێشینن.

بیرا عەزیزایێ ل زەلامەكی هات, جارەكێ ل جاددێ دیت بوو, وەكو ئاژەلەكێ بریندار هەواردكر و پاشی كەفتە سەر عەردی و كەفا سپی ب سەر دەڤی كەت, دەست و پێن خوە دلڤاندن وەكو ئێكێ لبەر خەندقینێ.

– نە .. نە .. نە.

– دێ هێن ..

بێهنا بخووریێ تیرتر و زێدەتر لێهات, عەزیزایێ ب دەنگەكێ بلند هەناسە دكر, ژنشكەكێڤە شێخ سەعیدی كرە قێژی: وەرن .. وەرن ئەی ئەوێن پیرۆز.. وەرن.

عەزیزایێ گوهـ ل دەنگێ كەنیەكا هێدی و ژكەیف بوو, ئو هندەك پەیڤێن كەس تێ نەگەهیت هاتنە گوها, هەست پێكر كو ژوور یا مشت بوی ژ هژمارەكا زۆر ژگیانداریێن كورتە بالا, هەرچەندە بوگەلەك جاران هەولددا , لێ نەشیا چاڤێن خوە ڤەكەت, هەناسەكا گەرم ددێمێ وێ وەربوو, دەڤەكی لێڤا وێ یا خواریێ گەزت و ب برسیاتی دگڤاشت.

رائێخا لبن پشتا وێ یا رویس یا زڤر بوو, بخووریێ كوم دبوو, ئو دهاتە گوهارتن بو مرۆڤەكی دناڤ دەستێن خوەدا هەمبێز دكر و ب ماچێن خوە بەنج دكر, ئاگرەكێ برسی دخوینا وێ دا هەلبوو, ل وی دەمێ دەڤی لێڤا وێ هێلای و بو پرتێن دی یێن لەشێ وێ هاتییە ڤەگوهاستن. عەزیزا یا بهێن كورت بوو, نە دلڤی , ترسا وێ بەرە بەرە كێم دبوو, لەزەتەكا ژتامەكا نوی تام دكر.. ئاهـ هـ هـ ... دكەنیت.

هندەك ستێرێن سپی دیتن و ئاسمانەكێ شینێ تاری و دەشتێن زەر و رۆژەكا ژئاگرەكێ سور دیتن. ئو عەزیزایێ گوهـ ل وشێنا رووبارەكێ دویر دبیت .. رووبار, یێ دویرە. هەر یێ دویر نابیت. ب خوەشی دكەنیت. خەم زارۆكەكە غار ددەت و ژێ دویر دكەڤیت , نهو زارۆكەكا مەزنە , كوریێ هەڤدەریێ وان ماچیكر و هەمبێزكر. نە .. نە .. ئەڤە شەرمە. ئو دەمێ دەمێ لبەر دەرگەهی یا راوەستای و ئەجیریێ نانكەر كولورەكا نانی دداڤێ, دەستێ خوە درێژ دكر و قورنجیكەك لسەرێ مەمكێ وێ یێ بچویك ددا , ئێشا, عێجز بوو, گونەهەك كر, كا دەستێ وی؟ ئها ئەڤە دەستێ وییە جارەكا دی دبیتە خودانێ لەشێ وێ. ئو ل شەڤا بویكینیێ ژی قێژییەك راهێلا بوو, لێ نهو نا كەتە قێژی.

دایكا خوە ددیت كەفیكەكا ب خوین یا ڤێ و مرۆڤێن وێ ب گرنگی یێ سەح دكەنە كەفیكێ, دایكا وێ ب دێمەكێ مشتی كەیف گازی دكەت: كچا من ژ هەمی كچكا پاقژترە , بلا دوژمن ژكەربادا بمرن.

ئو عەزیزا درڤریتەڤە زەڤی یێن زەر.. زەڤی یێن بێ ئاڤ عەڤرل بلنداهیا .. روژ ئاگرەكە ژ عەزیزایێ نێزیك دبیت. عەزیزا یا وەستیایە و یا دئێشێت .. گەرمیەكا دژوار ب خوەشی وێ دسوژیت. رۆژ ئاگرەكە نێزیك

دبيت و دچيته دناڤ خوينێدا . عەزيزا هەول نادەت ب رەڤيت . لێ لەزەتا وێ زێدەتر لێ دهێت هەتا دگەهتە كوپيتكێ . ل وى دەمى باران بارى . لەشێ وێ هەمى لەرزى.

پشتى بێهنەكێ شێخ سەعيدى خوە ژ لەشێ رويسێ عەزيزايێ دوير ئێخست . چوو نك هەردوو پەنجەراو پەردە ڤەدان . ئێكسەر تيرۆژكێن رۆژێ هاتنە دژوورڤە . گوشتێ سپيێ عەزيزايێ ب رەونەقا تيرۆژكان گەش بوو.

عەزيزايێ خوە ڤەكێشا . هێدى و ب هشيارى چاڤێن خوە ڤەكرن . ژخافلەتيڤە هەمبەرى رۆناهيا رۆژێ بوو. ب ترس رابوڤە . شێخ سەعيد گۆتێ: نە ترسە برايێن من يێن ئەجنە يا باركرى.

ب زەحمەت عەزيزايێ خوە چەماند . يا وەستياى بوو. ياشەرمكرى بوو. پارچا ئێكێ ژجلكێن خوە هەلگرت و حەز دكر كو بو ماوەيەكێ درێژ لسەر پشتا خوە ب نەلڤى يا درێژكرى و چاڤ نقاندى با.

شێخ سەعيدى دەڤێ خوە ب پشتا دەستێ خوە پاقژكر. جارەكا دى گۆتێ: نە ترسە .. يێن چوين.

روندك ژچاڤا بارێن . لێ .. دوى دەميدا دەنگێ فروشيارەكێ گەروك ل كولانێ بلند دبوو. دهاتە گوها هەروەكو گريا زەلامەكێ بێزار و نەمريت. پشتى چەند دەقيقەكا عەزيزا ب تنێ دوێ كولانا تەنگو درێژ و ب چەپ و چويردا دچوو. دەمێ سەرێ خوە بلند كرى و ب گرنگى سەحكرييە سەلال چ فرندەيێن رێبوار نەديتن . بتنێ ئاسمانەكێ شين و ڤالا بوو.

* * *

# ئەوێن رێگر

## ئەز رێگر بووم

ئەوێ رێگر. زەلامەكێ بەژن بلند . ئەنى گرێ و دێم هشك بوو. دەمێ دگرنژيت .. بەرێخودانەكا مجد . مينا دەڤێ شيرەكى كو ژنشكاڤە لبەر تيرۆژكێن رۆژێ دبرسقيت . ژ چاڤێن وى خويا دبيت .. دەمێ هورەباى پاپۆرا وى پرتكاندى . نە مر .. پێلا بەرەف پەراڤەكى هەلگرت . رۆژێ هەلات و داڤێن پرچا

خوەیا گەرم بەردانە سەر.. یێ نەلڤ و درێژکری بوو. لێ رەملا گەرم و تەر دێمێ وی هەمبێز کربوو..
زانی کو هەتا مرنێ وەکو قەلەرەشکەکا پیر یا بێ پاپۆر.. بێ یاوەر و بێ دلبەر دێ مینیت. ئەوێ رێگر عاشقێ ژنکەکێ بوو. ناڤێ وێ رەند بوو. یا لەش سپی بوو.. ب خوەشی دگرنژی .. پرچا وێ یا رەش ژی وەلێ دکر کو ب لەرزیت و چاڤەرێی بهیستنا گازییا شەرڤانەکێ رویس بیت. کو ل چایخانەکێ چ جھ ب دەست نەکەڤن و رمەك و لەشەکێ تاری هەبیت. رەند ب شەڤێ مر.. ئەوێ رێگر خوە چەماند و ب خوەشی دەڤێ وێ یێ سار ماچیکر. ل وی دەمی گوھ ل دەنگێ هورەبایێ کەربڤەبوی بوو. ئەوی ب دروستی باوەر دکر کو نهو رەند یا دبنێ دەریایێدا . یان ژی دبیت نهو جەندەکەکێ بسەر ئاڤێ کەفتی بیت. لێ یا دلوڤان بوو. دەست ژێ بەرنەدا و ب شێوەیەکێ نەدیار دگەل هاتە پەراڤێ ئاڤێ.
درۆژانێن بوریدا .. ئەوێ رێگر دەریا شەقاند بوون. پاپۆر شەلاند بوون. ل بەرامبەری ئاگران دکەنی. ژنك بێ هەتك دکرن. شیرێ وی یێ خوینەلۆ بوو. پر ب تەماحی و بێی پویتەپێکرن پێ ل زێری دنا و باژێرێن سەیر ددیتن. بێی دلخۆشی دکەنی. ب درێژاهییا شەڤێ سەرخۆش دبوو. هندەك شەڤان دەمێ بتنێ لسەر روییێ پاپۆرا خوە دراوەستا و گوهدارییا ئاژاوەیا یاوەرێن خوەیێن سەرخۆش دکر. وەکو خودێیەکێ بچویك بوو... ماوەردکرە ئاسمانێ مشتی ستێر و ل ستێرەکا هێژ گەش نەبوی دگەریا.
رەند ل نێزیکی وی بوو. دەستێ وێ ب پرچا ویڤە بوو. گۆتێ: نە گری.
ئەوێ رێگر رابوڤە و ژ دەرییایێ و ژ پەراڤی دویر کەفت. خوە هلدا ناڤ جاددەیێن باژێری. دوی دەمیدا جاددە ژ مرۆڤان دمشت بوون. کەسەك بو نەگرنژی. چ ژنکا ژی نە سەحکرێ. رۆژ ژی چویچکەکا سپی بوو. رەند ژی یا مت بوو. گۆتێ: خودێ هەشت دەمژمێران کار دکەن.
رەند یا بێدەنگبوو. ل وی دەمێ بای یاری ب داڤێن پرچا وێ یا رەش دکرن. رەندێ ب دلتەنگی هێڤ دکرە خودیکەکا مەزن. رێگری هەست پێکر کو مرۆڤەکێ نەساخ یێ خوە لپشت پیستێ وی ڤەشارتی و یێ دنالیت. ژنشکەکێڤە رەندێ گۆت: ترێن بوری..
مەزیڤەیا خەمێ ب دژواری لێدا . داکو لێهمشتەکا خولیێ بسەر جیهانێدا بێت و هەمی رۆناهییان ب ڤەمرینیت .. ئاخ .. ئەی خۆشیێن عەردێ بوری. ئو خەنجەرا شەڤێ دەسپێکر ددلێ رۆژێدا دچوو خوار. تاری مینا بەفرەکا رەش کەفت و گلوپێن زەر لسەر جاددەیان رۆهنبوون. ئەوێ رێگر دەستکرە قورمچینا دێمێ خوە و پرچا خوەیا پیری لێ بویە مێهڤان .. ئو گۆتە رەندێ: ترێنەکا دی ژی دێ بوریت.
ئو ستێر ب ساری ل ئاسمانان گەش دبوون. هۆتێلەك ل بەندەری هەبوو. ئەوێ رێگر پارێن خوە هژمارتن و قەستا هۆتێلێ کر.. یێ پێدڤی بوو کو دەمەکێ درێژ بنڤیت. تەختەك دژوورەکا تەنگڤە داڤێ. دیوارێن وێ ب رەنگێ زەرەکێ پێتی دبویاغکری بوون.

ئەوێ رێگر نڤست. رەند ب خۆشی دکەنی. دلبەرا من لەشێ تە رووبارەکێ سپی یێ مەیێیە و ددەڤێ تەدا هاڤینەك یا نڤستی و چاڤێن من .. دێمێ من .. تبلێن من .. دەریاڤانن و پاپۆرێن وان یێن پرتکێن و خەونان ب دەربەدەریا دناڤ دەشتێن تاریدا دبینن. چەند حەز دکەم پرچا تە یا رەشا درێژ و گژاڤژ ببینم. زارۆکەکە دخوینا مندا دکەنیت. ئەڤێن هە ژی .. یاوەرێن منن. یێ ژ بنێ دەریاییێ بسەر دکەڤن و جەندەکێ شکەستییێ مرنێ یێ ڤێ. ئەڤا هە ژی پاپۆرا منە یا جەرگێ دەریاییێ دبڕیت و رەندا دلبەرا من یا دکەنیت.. ئو عەڤر یێ ژ ئاسمانا دویر دکەڤن .. ئەی روییێ شینێ ئاسمانی. ئەی هوگرێ من یێ سوحبەت خۆش .. وەرە وەرە.

ل سپێدێ ئەوێ رێگر هشیار بوو. ل هۆلا هۆتێلێ روونشت و هندەك کەس لدورماندۆری وی بوون. هەمی دبیانی بوون. ژ گوند و باژێرکێن دویر هات بوون. ددلێ خوەدا دگۆت: بوچی هاتینە ڤێرە؟ ئەوێ پیر دێ مریت و ئەوا گەنج ژی دێ شوی کەت. دێ زارۆك بن. گەلەك جاران دێ دگەل مالخوێ خوە لێك کەڤیت.. زارۆك دێ مەزن بیت و دێ پەیڤا خودێ و باژێران نیاسیت. خەم و خۆشی دێ وێ همبێزکەن. بتنێ دێ ل خۆشیێ گەریێت و نا بینیت. ئەو ژنکا جحێلینیا وێ دچیتن. دێ ل ئێڤارییان خوە ڤەدەرکەت و دێ بیرهاتنێن خوە ڤەگێریت. کەسەك نابێژتێ: هو.. دلبەرا من. ل شەڤێن زڤستانان دێ لەرزیت و کەسەك سەبرا وێ نائینیت. ژبلی کتکەکا برسی. ئەو گەنجێ پویتەی ددەتە جلك و پرچ و پێلاڤا خوە. ئەوێ هەیە .. وەکو گازییەکا حێنجە. لێ بەرە بەرە دێ هەلوەشیێت.

هۆتێل: جهەکێ گەلەك تەنگە. ددلێ ڤێ جیهانا مەزندا یا چاندییە. گێژەڤانکا سەروچاڤێن سەیر هەڤدوو تێڤە دبینن. دهێن کو تێڤە بنڤن و ل سپێدێ قەهوێ ڤەخۆن و بچن.

رەندێ گۆت: ئاسمان یێ ڤالایە ..

ئەوێ رێگر دپەنجەرێرا هێڤ دکرە ئاسمانی. چ چویچك یان چ عەڤر نەدیتن. فنجانەکا قەهوێ ڤەخوار. هێدی هێدی جگارەك کێشا و پەرداغەکێ ئاڤا سار ڤەخوار و پاشی ژ هۆتێلێ دەرکەفت. هێدی ب رێڤە دچوو. چاڤێن وی دنیڤ نقاندی بوون. رەند ژنکەکا جوانە و حەز ژ مەزیقێ دکەت. مەزیقەیا عەردی یا دویرە. دەنگێ رەندێ یێ ب تنێیە .. بێ پەیڤە. دەنگێ وێ مەزیقەیەکە دناڤ دەماراندا دچیتە خوار و خوینێ دکەتە گولاڤەکا رەش. ئەوێ رێگر کچکەکا بچویك دیت. ژیێ وێ ژ نەهـ سالیێ نابوریت. ل نێزیکی بەردەرگەهێ مالەکێ یا راوەستای بوو. پالا خوە دابو دیوارەکێ سپی. کراسەکێ شین یێ کورت لبەر بوو. ژبن کراسێ وێ دوو پیڤێن ژ رەنگێ عەڤرێن هاڤینێ دیار دکرن. رێگری ب دلپیسی هێڤ دکرێ. ئەوێ کچکا بچویك دەهمەنا کراسێ خوە پیچەکێ ژ سەر رانێ خوە بلند کر و بەرێخودانا دەهمەن پیسەکا پیر ژ چاڤێن وێ دپەشی. ترسەکا کویڤی دگەهێن رێگریدا پەیداکر.

زارۆکێ .. شەرم بکە. حەز ژ گیای و گولا و دارا و عەڤرا و کوترێن سپی بکە. دەمێ باران دباریت .. بلا

گەلەك كەيفا تە بهێت. بكە كەنی .. هەمی جیهان مولكێ تەیە.. لسەر جاددەیێن ب قەرەبالغ راوەستە و چاڤێن خوە بگرە و گوهێ خوە بدە وان سترانێن ژ گەوریا باژێری دەردكەڤن: دەنگێ زەلاما و ژنكا و زارۆكا و ترومبێلا و پایسكلا .. ترس مر. چیرۆكێن داپیرا تە پەیڤێن شەڤەكا بێزارن .. ببە ستێرەك یان چبكەكا ئاڤێ یان ژی ببە یاریوكەكا ساویلكە. یا زارۆك ب سەرنجراكێشی هێڤ دكەنێ. دەمێ چاڤێن خوە لێ دنقینی .. وەلێ بكە كو هەوارێن حەیرانی و سەرسورماییێ ب راهێلن .. ئول هاڤینێ لسەر بانەكێ بلند ب رازێ. ستێر دێ هێنە خوار و لێڤێن وان دێ ب دێمێ تەڤە نویسیێن و پاشی دوو ستێر دێ دچاڤێن تەدا نڤن. چەند دجوانن .. ئەو چاڤێن ستێر دكویراتیا واندا دنڤن.

ئەوێ رێگر پێن خوە سڤككرن. گەلەك یێ برسی بوو. چ پارە ژی ڤێ نەبوون. نان لپشت شویشا یێ سپی بوو. ئویشی یێن تری دسور بوون .. دناڤ سندوقێن داریدا لسەرێك بوون. سێڤ ژی دسور و زەر بوون دسەلكادا. ئو هندەك هژیرێن كەسك ژی ل وێرێ بوون. ئەوێ رێگر ب زەحمەت تفا خوە دداعویرا. نە دشیا دەستێ خوە درێژكەتێ و ئەو خوارنا وی دڤیا بو خوە هەلگریت. وی نە چ پارە هەنە و نەچ شیر ڤێنە. پولیس ژی مشتی رێك و بازاران بوون. ب چاڤێن هشك و هشیار چاڤدێریا خەلكی دكر. وەروەرێن مەزن ژ ڤاییشێن ددور كەمەرا وان ئالاندی دداڵەڤاندی بوون.

ئەوێ رێگر بو ماوەیەكێ درێژ.. بەرامبەری خودیكەكا ل كوژیێ دكانەكێ راوەستا و دخودیكێرا زەلامەكێ دێم بەهتی دیت. دچاڤێن ویدا تەڤ هەژارێن جیهانێ دنالین. رێگری وەسا هزر كر كو ئەڤە بو جارا ئێكێیە ڤی زەلامی دبینیت. پاشی بو ماوەیەكێ كورت وەسا هزر كر كو بەری نهو ژی یێ دیتی. ب دارەكێ رەقڤە یێ گرێدای بوو. بسمارێن گرنج گرنج ددەست و پی یێن وی دچاندی بوون. ئەوێ رێگر ب سەرەكێ چەماندی و ب رەزیلی ددا رێ. پاشی ژنشكەكێڤە زەلامەكێ جلك پاقژ و رێكوپێك ب توندی ڤێكەفت و ب دلرەقی گۆتێ: هێی ی .. ما تو یێ كورەیی؟...

ئەوێ رێگر بەرسڤا وی نەدا. ل وی دەمی. پاپۆرا وی .. گەمیڤانێن وی و رەند دبنێ دەریایێدا بوون. وی زەلامێ ب رێكوپێك دەستێ خوە بلند كر و زللەهەكا ب هێز لێدا و ژكەرب پاشڤەبر. هەر دەملدەست خوینێ ژ دفنا رێگری هەلاڤێت. ب تامەزرویی هەواركر: رەندێ .. رەندێ.

ل وی دەمی. رەند ژنكەكا بەهتی بوو. گوهێ خوە ددا مەزیڤەیەكا دویر. جارەكا دی رێگری ب ترس هەواركر:

رەندێ .. رەندێ.

رەند لسەر مێزەكا سپی و دژوورەكا سپیڤە یا درێژكری بوو. ئەوێ رێگر دلێ وی گەلەك دچوویێ جگارەكێ ب كێشیت. چ جگارە دبەریكێن خوەدا نەدیتن. خوە چەماند و ب تبلێن لەرزوكیڤە قورمكەكێ جگارێ ژ سەر عەردی راكر و گەلەك ب تامەزرویی كرە دناڤ لێڤێن خوەدا. قەمبەلێن كادیێ

بەردان و ب خوەشی ئاخینکەك راهێلا. لێ پشتی دەمەكێ كورت و ژنشكەكێڤە هەست ب بێهێزیێ كر. هەڤسەنگییا خوە ژ دەستدا و ئێدی نەشیا خوە لسەر پی یێن خوە بگریت. كەفتە سەر عەردی و خەلك لدور خرڤەبوون. پرسیار دكرن: ئەرێ یێ سەرخۆشە ؟؟! مرییە ؟!
ترومبێلا سپییا دهەوارهاتنێ. بلەز جاددە دبرین و هۆرێنا وێ هەوارێن دژوار ژێ دەردكەفتن. ئەڤ هۆرێنە وەكو دەنگێ ترێنەكا لسەر باركرنێ دهاتە گوهێ رێگری.

## لێبوك

ئەی ژنكا رەش .. هش بە. سترانا تە یا بریندار گولەك هەرشاند. ئەو گولا بریسقەدارا شویشەی ددلێ میریدا دژیا. لەشكەران و خولامان و كەنیزەكان و یاوەران پستە پستەك دكر: سەمیانێ مە .. میر یێ خەمگینە.

ئەوێ لێبوك لسەر كورسیكەكا داری دناڤ باغێ تەلارێدا یێ روینشتی بوو. سەح دكرە وێ خولیا ژ ئاسمانی دباری. ئو دەمێ ل هەمبەری میری ئامادە بوی. كەفتە سەر چوكێن خوە و سەرێ خوە چەماند. ب بێدەنگی چاڤەرێی ئاخفتنا میری ما. پشتی دەمەكی میر ئاخفت:

- كەنیا من بینە یان دێ سەرێ تە برم.

ل وی دەمی لێبوك یێ بوغومی بوو. هەمی پەیڤێن وی درابردوویەكێ دویردا بوون. گۆت:

- ل دەورێ بەرێ رێگرەك هەبوو. دگەل یاوەر و پاپۆر و دلبەرا خوە دژیا.

میر بوغومی .. لێ لێبوك هەر یێ بەردەوام بوو دگۆت:

- ئاخ .. سەمیانێ من. ئەوا بوری هەمی چوو. ئەوێ رێگر ژی ببوو لێبوك.

میری گۆت: ئەز ژ تە بێزار بووم .. سەرێ تە دێ هێتە برین.

لەشكەران و خولامان و كەنیزەكان پستە پستەك دكر: سەرێ لێبوكی دێ هێتە برین.

لێبوكی هزرا پاپۆرا خوە یا پەرسیی دكر. دەمێ دەریا شەق دكرن و یاوەرێن وی شیرێن خوە بلند دكرن و دكەنین. ئو رەندا دلبەرا وی لبەر تیرۆژكێن رۆژێ پرچا خوەیا رەش شە دكر. پاشی وەسا هزر كر كو شیرەك یێ دداوەشیتە سەر حەفكا وی و سەرێ وی پلیت دكەتە ناڤ ئەیوانا بریقەدار. ل وی دەمی .. لێبوكی مینا ژنكەكا پیر دكرە گری. رونذكێن وی سەروچاڤێن وی یێن چرمسی تەر دكرن. میر ما حەییری و سەرسورماییێ گرت. پاشی دەسپێكر كرە كەنی و گۆت: زۆر باشە تو ئەكتەرەكێ زیرەكی!

لەشكەران و خولامان و كەنیزەكان و یاوەران. پستە پستەك كر: سەرێ لێبوكی ناهێتە برین.

لێبوك زڤریڤە باغێ تەلارێ. ل وێرێ خویشکا میری دیت یا سەح دکەتە ستێرێن ئاسمانی. ژنکەکا جوان بوو. پرچا وێ یا رەش ب خەمساریڤە لسەر هەردوو ملێن وێ بەلاڤە ببوو. دوتمیرێ ژێ پرسیارکر و گۆتێ: برایێ من .. کرە کەنی؟

لێبوکی گۆت: میرێ سەمیانێ من کرە کەنی.

دوتمیرێ گۆت: روندکێن دچاڤاندا ژ دێمێ ب کەنی جوانترە.

لێبوکی گۆت: یا نەخۆش ئەوە دل ب دوو چاڤێن هشك بکەتە گری.

دوتمیرێ گۆت: ئەز ژ تەلارێ نە دەرکەفتیمە .. هێشتا ئەز جیهانێ نانیاسم.

هندەك پێلێن دژوار ژ هەستێن گەرم بسەر لەشێ لێبوکیدا هاتنە خوار. ئێکسەر هەمی جحێلینیا خوە یا رەڤی ڤەگەراند و ب گەرمی بەرسڤدا: ژ دەرڤەی تەلارێ خەلك برسی دبن. ئو هندەك جاران دلێن خوە ژناڤ سینگێ خوە دکێشنە دەرێ و دفرۆشن .. ئو ب وی پارەی نانی پێ دکرن.

دوتمیرێ گۆت: ئووو ... ئوووو

لێبوکی گۆت: ئو دەمێ باران نەباریت .. گریانەکا تەحل دکەن.

دوتمیرێ گۆت: ما خۆشیێ نزانن؟!

لێبوکی گۆت: بتنێ ل دەمێ دوولەشێن ئەڤیندار دگەهنە ئێك یان دەمێ چەند هەڤالەك خرڤە دبن و بەحسی نەخۆشیێ و مرنێ و کارێ رۆژانە دکەن. یان ژی دەمێ خەلك دنڤیت و خەونا دبینیت .. هینگی بتنێ خۆشی درژێت.

دوتمیرێ ب دلخۆشی گۆت: دا ب رەڤین و لدور جیهانێ ب زڤرین.

لێبوکی گۆت: جیهان یا مەزنە و ئەم دێ مرین بەری جیهانێ هەمیێ بنیاسین.

دوتمیرێ ب مجدی گۆت: دا ب رەڤین.

لێبوکی وەسا هزرکر کو یێ گوهـ ل هەرایا باژێرێن مشتی مرۆڤ دبیت و گۆتێ: ئەز بتنێ دێ رەڤم.

دوتمیرێ ب خەمگینیڤە گۆت: زێرەڤانێن تەلارێ دێ تە کوژن.

لێبوك شیا ژ تەلارێ قورتال ببیت بێی کو هیچ زێرەڤانەك ژی وی ببینیت. ئو ب دیتنا ستێرا و بێدەنگیا شەڤێ و رۆناهیێن باژێران سەرخۆش بوو. ب رێڤە وی هەست پێکر کو وی پاپۆر و یاوەر و دلبەرا خوە هەمی یێن ڤەگەراندین. لێ ڤێ هەستێ دوم نەکر.. پشتی ماوەیەکێ کورت کەیفا وی ڤەمریا و جارەکا دی زانی کو هەتا مرنێ دێ بتنێ .. مینا ڤەلەرەشکەکا پیر مینیت. ب خەمۆکیڤە راوەستیا و پالا خوە دا قورمێ دارەکێ. بیرا وی ل دەستەکێ بچووك هات دەهمەنا کراسەکێ شین ژسەر دوو رانێن سپی بلند دکر. ژنشکاڤە ترسەکا دژوار گرت. پێ حەسیا کو دبیت پشتی بێهنەکا دی ببیتە رەفەکا کولی یێن برسی و هەمی کەسکاتیا جیهانێ نەهێلیت.

## کەفتنا ئەویٚ خرابکار

پشتی چەند دەقیقەکا دیٚ چ قەومیت؟ ئەم ییٚ دجیهانەکا مژداردا دژین. دبیت دهەمان دەمەکیٚ کورتدا بکەینە کەنی و بکەینە گری و بمرین ژی. هەیڤ ل هنداڤ مە یا راوەستایە, نا رەڤیت, دێمیٚ ویٚ ییٚ بەهتییە و یا ل هیڤیێ ئەو خوینا درژیێت ببینیت, دیٚ چ قەومیت؟ باژێرکیٚ مە ییٚ کەهی و بچویکە, خەلکیٚ وی بیٚ پرسیار دژین, کەفت بوو ددەستیٚ زەلامەکیٚ خرابکاردا و ئەڤیٚ هەنێیە .. ب وەریسێن زڤر ییٚ گرێدایە. پشتی بو ماوەیەکیٚ درێژ لدویف بەزین, پێنج زەلامان ئەو دەستەسەرکر. ئەم چاڤەرێنە .. رۆناهیا هەیڤیٚ دلەرزیت و چاڤەرێیە, عەردیٚ جاددیٚ ژی چاڤەرێیە, دیٚ چ قەومیت؟ پێنج زەلامان, کەرب و کینیٚ گولێن خوە دناڤ دلێن واندا چاند و پیلاییٚ شمشێرێن کەڤن دچاڤێن واندا دبرسقیت, مە گوهـ ل دەنگیٚ کەریڤەبوونا وان دبیت.

"مالا من سۆت .. ژنا من نە کوشت .. ل پشت خوە هێلا .., داکو دیتنا لەشیٚ ویٚ ییٚ کرێتکری من ئەشکەنجە دەت"

" هەژارم .. ئەز هەژارم, بتنیٚ من سەیەکیٚ کەهی ییٚ هەی .. نە درەویت و نە چ لەقان ل کەسەکیٚ ددەت و حەز ژ خەلکی هەمییٚ دکەت .. بوچی ب بەرەکی سەریٚ وی شکاند؟ "

"بابیٚ من پیرەمێرە و حەز ژ دارزەیتوونان دکەت .. ئو ب تایەکیٚ دارزەیتوونێڤە هاتە سێدارەدان .. بابیٚ من حەز ژ دارزەیتوونان دکر"

"زارۆکیٚ من بچووکە و هێشتا فێری ئاخفتنیٚ نە بوویە .. ییٚ جوان بوو .. لیٚ چەند یا کرێت و دلتەزین بوو .. دەمیٚ من دیتی ییٚ سەرژێکرییە"

"کتێبێن من سۆتن .. ئها ئەڤە ئەز بیٚ کتێب مینا جەندەکەکیمە لسەر روییٚ ئاڤا رووبارەکیٚ نیڤ راوەستای"

دیٚ چ قەومیت؟ خودیٚ یوو .. خودیٚ یوو .. دیٚ چ قەومیت؟

پێنج زەلامان, ئێکی ژوان ئەو وەریسیٚ لدور زەلامیٚ خرابکار ئالاندی قەتکر. دیٚ چ قەومیت؟ ئەو زەلامیٚ خرابکار بیٚ چەك دناڤوان هەر پێنج زەلاماندا راوەستا, تبلێن وان ژ کەربڤە دەستکێن خەنجەرێن دەڤ درێژ دشدینن, بارکە .. ئەی رۆناهیا هەیڤیٚ, مە نەڤێت ببینین, لیٚ چاڤێن مە هێڤ دکەنیٚ, پی یێن مە ژی نەڤێت ب رەڤن .. خرابکاری تو .. ئەی هەیڤ تو یا خرابکاری ..

زەلامەکی گۆت: ل دلی نەدەن.

خەنجەران هێرشکر. پێکڤە ل وی زەلامیٚ خرابکار دا . پاشی پاشڤە زڤرین و بلەز ژ گوشتی هاتنە ڤەکێشان . زەلامیٚ خرابکار ژبەر ئێشانیٚ کرە قێژی و خوینیٚ ژ پێنج کونا هەلاڤێت. خەنجەران هەوا و گوشت دڕاند . زەلامیٚ خرابکار دراهژییێت و ناکەڤیت . ئەی ئەو گورگێن دکویرییا مەدا .. شەرم بکەن . ژ کەیفێن خوینێدا نەلویرن .. مرن دیٚ هێت.

## دوماهیا هەمی چیرۆکان

گلوپا جاددیٚ یا زەرە . ئو هەیڤ ژی یا ل هنداڤ جاددیٚ . پشتی بینەر ڤەرەڤین و کەس ژیٚ نەمای . لەشیٚ ئەویٚ خرابکار ییٚ دڕاندیە و بتنیٚ لسەر چیمەنتوییٚ ییٚ رازایە. رەند ژنکەکا گەلەك دلوڤان بوو. ب خەم و تامەزروویيڤە هات . خوە چەماند و لێڤێن خوە ب دەڤیٚ زەلامیٚ خوینەلۆڤە نویساندن .. هەست ب گەرمییا لەشیٚ ویٚ نەکر. هەولدا چاڤێن خوە ڤەکەت .. لیٚ بەفر کەتبوو سەر و سڕ و سەقەم دگەهێن ویدا چوو بوو خوار. ب زەحمەت شیا خوە ب بنکەفشێن رەندێڤە بگریت . پێکڤە چوون و دناڤ بوشاییەکا سپی و بێدەنگدا بەرزە بوون. ل وی دەمی چ زەنگلێن خەمگین نەهاتنە لێدان . ئەویٚ رێگر و لێبوك و بکوژ هەلوەشیا و ژبلی جەندەکەکیٚ سار چ ژیٚ نەما . سەیەك ژیٚ نێزیك بوو. بو چەندین جاران لدور زڤری و پاشی دەسپێکر خوینا سور دئالیست.

*            *            *

# بازارەك

ژیێ کوریەی دزکێ دایکێدا گەهشتە نەهـ هەیڤێ، دەمێ بوونێ و دەرکەفتنێیە ژ زکێ دایکێ بو ناڤ ڤێ جیهانێ کو ببیتە خودان ناڤ و گەرەك و باژێر و وەلات وخزم و هەڤال، لێ کوریەی چ هەولدانێن دەرکەفتنێ ژ زکێ دایکێ نەکرن، دایکێ ب زمانەکێ پێترانکی و تنگژنیڤە گۆتێ: مادێ هەتا کەنگی مینییە دزکێ مندا، خو نە تول هیڤێ یی دزکێ مندا ببییە زەلامەکێ خودان سمبێل؟ پێدڤییە دلێ تە بمنڤە هەبیت، ئەز هند یا گران بویم نەشێم برێڤە بچم، کوریەی گۆتێ: ئەز حەز ناکەم بکەڤمە د نەدیارییێدا ئەز ژ زکێ تە دەرناکەڤم ئەگەر نەزانم ئەو چ جیهانە لهیڤیا من، ئەوا کو دێ بمە ئێك ژ ئەندا مێن وێ.

دایکێ پیچەکێ هزرێن خوە کرن و پاشی گۆتە کوریەیێ خوە: تە درەوەك دڤێت تە دسەردا ببەت و دلێ تە خۆشکەت یان ژی تە دڤێت بوتە راستیێ بێژم و ژیانا تە نەخۆش کەت؟

کوریەی گۆتێ: من بتنێ راستی دڤێت، نەمازە راستی قولتالکەرەو درەو وێرانکەرە.

دایکێ گوتێ: گوهدە من.

کوریەی لێ ڤەگەراند: هەرتشتێ تە بڤێت بێژە، گوهێن من ژبوگوهدارییێ دڤەکرینە.

دایکێ گۆت: ئەو جیهانا دێ تێدا ژی، جیهانەکا گێل و رەق و دلشکێنە .. بێ دلوڤانە و دل ب کەسێڤە نینە.

کوریەی گۆتێ: هەر هێزدارەکی هێزەکا ژوی ب هێزتر یا دسەردا و چ بکوژ ژ بکوژەکێ دی قورتال نابن.

دایکێ گۆت: دێ گولان چینی، لێ ژبلی ستریا چ ناچنی.

کوریەی لێ ڤەگەراند: ئەز ژبلی ستریا چ ناچینم .. داکو گولا بچنم.

دیکێ گۆت: خەمباری یا ب ساناهییەو دلخۆشی یاب زەحمەتە.

کوریەی گۆتێ: ئەز نە خەمبار دبم، نەژی دلخۆش دبم.

دایکێ گۆتێ: دێ خەونان بینی و دێ تە هیڤی هەبن و دێ ئەڤینێ کەی، لێ ژبلی داکەفتنێ و مرنا خەون و هیڤیا چ دی نابینی.

کوریەی لێ ڤەگەراند: دێ دلێ خو کەمە پێخوارنا پشیکێن برسی .. یان ژی دێ کەمە کەڤرەکێ سار.

دایکێ گۆتێ: ئەگەر تو باخڤی دێ پەشێمان بی، ئەگەر نەئاخڤی ژی دێ هەر پەشێمان بی.

کوریەی لێ ڤەگەراند: ئەز درانم دێ کەنگی بێدەنگمینم، خەلکێ دی دێ پێشەمان بیت.

دایکێ گۆتێ: دارا بەردار ب نەمانێ یا مەحکومە، چونکو بەرێ وێ یێ خۆشە.

کوریەی لێ ڤەگەراند: ئەز نابمە دار. لێ .. دێ بمە بڤر.

دایکێ گۆتێ: ئاڤا رووباران یا شرین و خۆشە, هەتاکو دگەهتە دەریایێن سویر. ل وێرێ رووبار کێماتینە و دەریا پترینن.

کوریەی گۆتێ: دەریایەکا مەزن یا سویر باشترە ژ رووبارەکێ بچووك و یێ ئاڤ شرین.

دایکێ گۆتێ: زانین ل زارۆکینیێ, نەخشێ ل بەری دایە.

کوریەی لێ ڤەگەراند: زانینێ چ مفا نینە, نە ل زاروکینیێ و نە دمەزنییێدا.

دایکێ گۆتێ: ئەرکێ ژیرمەندان دەسنیشانکرن و چاککرنا کێماسی یێن خوەنە .. بەری یێن خەلکێ دی.

کوریەی لێ ڤەگەراند: کێماسی یێن من باشینەو دڤێت خەلك پەسن کەت, باشی یێن خەلکی ژی کێماسی یێن کرێتن.

دایکێ گۆتێ: دێ هندەك جاران پێدڤی ب کەربڤەبوونێ بی, کەربڤەبوون ژی ژ ساخلەتێن گێلێ و ئەحمەقانە.

کوریەی لێ ڤەگەراند: ئەگەر کەربێن من ڤەبن و ئەحمەق بم, باشترە کو خوارنا هەمی دەڤان بم.

دایکێ گۆتێ: ئەوێ دلێ خوە ژدەست بدەت, زەنگینی چ مفای نادەتێ.

کوریەی لێ ڤەگەراند: ڤێ ئاخفتنێ چ پویتە پێ ناهێتە کرن, ئەز گازندێ ژگۆتوو یێ ڤێ گۆتنێ دکەم کو بێگومانە مرۆڤەکێ هەژارو ژ برسا مری و دەست کورت بویە, ب چاڤێن زل یێ سەح کرییە برینێن کول.

دایکێ گۆتێ: دێ هندەك مرۆڤان بینی, باشیێ دڤەشێرن و خرابیێ دەردئێخن.

کوریەی گۆتێ: ئەگەر سەی خوار و تێر بوو, دێ رەوینا وی دژوارتر لێهێت.

دایکێ گۆتێ: دبیت تو هەڤالێن خوە ئێك لدویڤ یێ دی ژ دەست بدەی و چ خەم بسەر ژ دەستدانا هەڤالان ناکەڤیت.

کوریەی لێ ڤەگەراند: هەڤال ل رۆژێن بەرفرەهیێ هەڤالن و ل رۆژێن تەفگاڤیێ ژی دوژمنن.

دایکێ گۆتێ: مرۆڤێن بێ بەخت درۆرن و کەسێ بێ بەخت وەك مارییە, ژبلی ژەهرێ چ ڤێ نینە.

کوریەی لێ ڤەگەراند: ئەز نابمە ئەو دختورێ ژەهرێ ڤەدخوت, چونکو دەرمانێن هەین.

دایکێ گۆتێ: هشیاربە سەرکەفتنا نەباشیێ هەردەم داکەفتنە.

کوریەی لێ ڤەکەراند: هندی ئاڤ یاگەرم بیت, ئەگەر ب ئاگریدا کەن دێ ڤەمریێت.

دایکێ گۆتێ: چ مفا د وێ گەوهەرێدا نینە ئەوا ژبنێ دەریایا خوە نەدەرکەتی.

کوریەی لێ ڤەگەراند: ئەو کەسێ بڤێت گەوهەر هەبن, دڤێت بهای نەدەتە دەریایێ.

دایکێ گۆتێ: خۆشیا مرۆڤی ئەوە کو رزقێ وی دناڤ وەلاتێ ویدا بیت.

کوڕپەی گۆتیێ: خۆشیا مرۆڤی ئەوە کو رزقێ وی بێ وەستیان بیت.
دایکێ لێ کرە قێژی و ب کینڤە گۆتیێ: ئەگەرتە ئەڤ هزرە هەنە ، مانا تە بوچییە دزکێ مندا.
کوڕپەی لێ ڤەگەراند: ئەز یێ ل هیڤیێ تو بابێ من ، ئەوێ هەژار، بەردەی و شوی ب ئێکی زەنگین و پایەدار و پر هێز بکەی.
ژنکێ ب هەوارکی و پر ژ کەربڤە خوە گەهاندە نێزیکترین خەستەخانە.

*          *          *

# گونەهبار

پولیسەکێ ڤەلەو ل گورستانەکێ ب ژوورکەفت و چەند پێنگاڤەکا ب دوودلی دناڤ گورێن سپیدا مەشی ، پاشی بو ماوەیەکێ کێم ب حەیرانی راوەستا و ب دەنگەکێ لێڤ مچاندی گازیکر: عەمرێ خەییام.
کەسێ بەرسڤ نەدا ، کەفیکەکا سپی یا پیس ژبەریکا خوە دەرێخست ، بلغەمێ خوە کرێ ، پاشی پێچاو زڤراندەڤە دبەریکا خوەدا ، ب دەنگەکێ سەبرنەمای گازیکر: عەمرێ خەییام .. عەمرێ خەییام ، تویێ داخوزکری بو دادگەهکرنێ.
کەسێ بەرسڤ نەدا ، پولیسی گوڕستان هێلا و زڤریڤە مەخفەرا خوە ، ل وێرێ راپورتەك نڤێسی ، تێدا دوویاتکر کو عەمەرێ خەییام رەتکر ل دادگەهێ ئامادە ببیت ، ئەڤ راپورتە بو بەرپرسێن خوە بلندکر.
سەروچاڤێن هەمیا ب سەرسورمایی تێکچوون و فەرمانێن خوە دان ئێکسەر هژمارەکا پولیسان ب قەزمەو مەربێلڤە بەرەڤ گوڕستانێ چوون و گورێ عەمەرێ خەییام هەلکولا و خاڤ و خرچەکێ پێتی و گوشت حەلیای ژبن ئاخێ دەرێخست ، هەلگرت و برە دادگەهێ ، ل بەرامبەری قازی.
قازی ب دەنگەکێ پر هەیبەت و ئەڤینی ژێ پرسی: عەمەرێ خەییام تو یێ گونەهباری ب نڤیسینا وان هۆزانێن بەحسێ مەی دکەن و بانگەوازییا ڤەخوارنا مەیێ دگێری .. لێ چونکو وەلاتێ مە لبەرە سەربەخوییا ئابوری بجە بینیت ، یاسایێن وێ ناهێلن شتومەکێن بیانی بهێنە دناڤ وەلاتیدا و چونکو وەلاتێ مە چ کارگەهێن چێکرنا مەیێ نینن ، ژبەر هندێ هۆزانێن تە بانگەوازییە ژبو ئیستیرادکرنا شتومەکێن بیانی ، ئەڤە ژی کارەکە یاسا بێی دوودلی سزای ددەتێ ، ئەرێ تو دان ب گونەهبارییا خوە دکەی؟

بوچی بەرسڤێ نادەی؟ باخڤە. بێدەنگی نەباشە, دێ باشە .. بێدەنگییا تە ئانکو تو گونەهبارییا خوە رەت دکەیەڤە. نهو ئەم دێ هەولدەین بزانین کا تو گونەهباری یان بێگونەهی .. دادوەرێ ئارمانجا مەیە یائێکێیە .. ئەوێ هۆزانان دنڤیسیت فەرە خواندن و نڤێسینێ بزانیت, ئەرێ تو دزانی بخوینی و بنڤێسی؟ تو رەت دکەی؟! کەواتە گازی دیدەڤانان بکەن.

دیدەڤانێ ئێکێ (خودانێ پرتوکخانێیە): گونەهباری گەلەك کتێب ژ پەرتوکخانا من دکرین.

قازی: چ جۆرە کتێب دکرین.

دیدەڤانێ ئێکێ: کتێبێن هەمەجور دکرین, لێ وی کتێبێن بەحسێ ئەڤینیێ دکەن دچێتراندن.

قازی: ها ..ها .. کەواتە حەز ژکتێبێن گوهنێلیێ دکر؟! رەحمەت ل سنج و رەوشتێن باش بن .. بێژە من: چ جاران کتێبێن رامیاری نە دکرین؟

دیدەڤانێ ئێکێ: کتێبێن رامیاری؟ ئەز سویند دخوم کو چ جاران دەستێ من نەکەفتییە سەر کتێبێن رامیاری. دبیت ژپەرتوکخانەکا دی کری بن.

قازی: ئانکو کتێب دکرین.

دیدەڤانێ ئێکێ: ئو, هەروەسا خامەو کاغەزێن سپی ژی دکرین.

قازی: خودێ مەزنە! چەوتی پویچ بوو.. راستی ب سەرکەفت. ئەگەر گونەهباری خواندن و نڤێسین نەزانیبان مالێ خوە ل کرینا کتێبان وکاغەزان و خامەیان خەرج نەدکر.

دیدەڤانێ دووێ (پیرە ژنەکە): هەمی ئەوا ئەز دزانم, گونەهباری بتنێ حەز ژ پەیڤان دکر.. ژنکەکێ حەز ژ وی دکر, گۆت بو من کو وی یا گوتیێ ئەو پتر حەز ژپەیڤان دکەت ژجوانترین ژنکا لسەر رویێ عەردی.

قازی: حەز ژپەیڤان دکەت؟! چ جورە ڤارێبون و نەشارزییە! کەسێ باش .. بتنێ حەز ژ دایکا خوەو حکمەتێ دکەت.

دیدەڤانێ سیێ (رۆژنامەڤانە): من هۆزانێن گونەهباری خواندن, وەسا خویابوو کو چ پەسنێن باشییا حکمەتێ تێدا نینن.

قازی: ئەڤەژی گروڤەکێ ڤەبرە کو گونەهبار حەز ژمللەتی ناکەت.

دیدەڤانێ چوارێ (زەلامەکێ ریهـ درێژ): ئەز سویند دخوم .., بڤان هەر دوو گوهێن کو پشتی مرنا من دێ کرم خون, من بهیست بوو, گونەهباری دگۆت مەی خەما دردڤینیت.

قازی: ئەڤ ئاخفتنە دێ یا ترسناك بیت ئەگەر بوادگەهێ خویا بوو کو خەلك پێ خەمگینە.

دیدەڤانێ پێنجێ (بەرپرسێ مەخفەرەكا پولیسانە): مشە راپورت لسەر بزاڤێن وێرانكەرێن وی كەسێ دگۆتنێ (خەم) پێ رادبوو بو مە دهاتن ، لێ هەتا نهو ئەم نەشیاینە دەستەسەركەین و ڤەكولین و لێگەریان یا بەردەوامە.

دیدەڤانێ شەشێ (زیندانییەك): خەمێ ئەز پالدام كو داخوازا ژیانەكا ئازاد بكەم.

دیدەڤانێ حەفتێ (زیندانییەك): خەمێ ئەز نەچاركرم خەبەرا بێژمە حكمەتێ.

دیدەڤانێ هەشتێ (زیندانییەك): خەمێ ئەز هاندام كو پشكدارییێ د خۆنیشاندانەكێدا بكەم.

دیدەڤانێ نەهێ (زیندانییەك): خەمێ وەل من كر كو هەولدەم ژ زیندانێ ب رەڤم.

دیدەڤانێ دەهێ (زیندانییەك): خەمێ بتنێ یا وەل من كری كو ئەز حەز ژ پولیسان نەكەم.

قازی: گۆتنێن دیدەڤانان خویاكر كو هۆزانێن عەمەرێ خەییام بانگەوازییەكا سوروسورە بو مەی و ئیسترادكرنا شتومەكێن بیانی . هەروەسا بجھ ئینانا پیلانەكا بەرگومانە ژبو ئاژاوەییێ و هەروەسسا گۆتنێن دیدەڤانان وەسا خویاكر كو عەمەرێ خەییام هەڤكارییا دگەل خەمێ كری . هەروەكو بو دادگەهێ هاتییە ئاشكراكرن ژی .. خەم سیخورەكە تابورێ پێنجێیە . دوژمنێن مە بكار دهینن ژبو تێكدانا تەناهیێ و بەلاڤكرنا بێ سەروبەرییێ.

قازی بێهنەكێ بێدەنگبوو. ب مورتاحی و كەیف بێهنا خوە هەلكێشاو پاشی دومدا ئاخفتنا خوە ، عەمەرێ خەییام حوكمكر كو نابیت ئێدی ب چ تەرزا هۆزانان بنڤیسیت. پولیسان عەمەرێ خەییام هەلگرت و برە گورستانێ و زڤراندەڤە دناڤ گورێداو تژی سەر ئاخكرن .. پشتی هەمی خامەو كاغەزێن وی پویچكرین . لێ خەم هەر ماڤە ئازاد و بزاڤێن خوەیێن وێرانكەردكرن.

*   *   *

## زەلامەك ژ دیمەشقێ

## 1. خوشی یێن بچووك

ئەویٚ گارسۆن یێ زەعیف بوو، ب ساویلکەیی دەنگێ خوە بەرداو دگۆت: چایەك. ب گرانی ژ مێزا من دوور بوو، پاشی ڤەگەریاڤەو کوپەکا چایێ ڤێبوو، هێدی هێدی من دەست ب ڤەخوارنێ کرو من بەختەوەریەکا مەزن ژێ ددیت. ئەز حەژ ڤێ چایخانا ڤەدەر و بها ئەرزان دکەم، لڤێرە بو من خۆشە چاڤێن خو پیچەکێ دانمە سەرێك و گوهداریا قەرەبالغا لدورماندۆری خوە بکەم: دەنگێ زارێ ئەوا لسەر رویەکێ رەق دوەرگەریێت.. ب قێژی, سترانەکا ژ رایویێ بلند دبیت .. کەنی .. هندەك ئاخفتنێن تەراوبەرا دهێنە گوهێ من: هش بە .. تو کەنگی دسیاسەتێ دگەهی؟

"خوزی ئەم شیابایین بێ نان بژین".

هەمی ژنك قەحبەنە ..

گوهداریا ڤێ هەمیێ دکەم و دهەمان دەمدا ژی هزرا ژیانا خوە دکەم کو خەونەکا مەزن و خۆشە، ئەز گەنجەکێ ئەحمەق و بێ مفامە. دگەلەك کاراندا من کارکرییە. چ کار ب دلێ من نەبوون. ژبەر هندێ هەردەم بەریکێن من ڤالانە، ئەز شەرمەزارێ ڤێ رەوشا خوە نینم، چونکو وەسا هزردکەم کو بەریکێن ژ پارەی ڤالا پشکەکن ژ گیانێ ڤێ رۆژگارا تێدا دژیم.

من چ بەلا نینن، من یێ‌خوە تەسلیمی تەناهییەکا مینا ساویلکەییێ کری. رۆژێ سێ جاران ئاشکێ خوە ب نانێ بابێ خوە پڕ دکەم، پارێن پێدڤی ژبو جگارا و روونشتنا ل چایخانێ و بەرێخودانا فلمەکی، ژ دایکا خوە دگڤێشم. گەلەك جاران من پرسیار دکر: مادەم چ هیڤی نەبن بوچی بژیم, هەبوونا من ژی ئەگەر چ مفا تێدا نەبیت، بوچی دژیم ..ما بوچی خوە ناکوژم؟

ئەڤ پرسیارە من عەجباند، وەل من کر کو دناڤ خەون و هەپارەیێن هشك و دژوار و خەمگیندا ب خەندقم، لێ گەلەك دخۆش بوون. رەفتارا من هاتە گوهارتن، بو ئەگەرێ وێ چەندێ کو دایك و برایێن من دناڤبەرا خوەدا پستەپستەکێ بکەن و ژمن پرسیارکەن: تە چییە؟

من ب بێدەنگی سەرێ خۆ دهژاند. چ نینە، چ نینە. لێ ددلێ خوەدا پێ دکەنیم .. بێگومانە کو مرنا من دێ بویەرەکێ دلتەزینێ ژنشکاڤە بیت بو وان، دایکا من دێ بەردەتە گرییێ و قێژیا و دێ بخۆ دادەت، باب و برایێن منژی دێ دپەشێمان بن کو بەری نهۆ پویتە ب من نەدکرن.

دەربارەی کەسوکارێن من .. ئەز تشتەکێ پێکەنوك و سەبرین بوم، ئەڤجا گومان تێدا نینە کو ب مرنا من دێ خەمگین بن، هەرکەسەکێ من بنیاسیت دێ نەچار بیت کو خوە خەمگین دیارکەت، ئەگەر نە، ئەزمانێن تیژێن خەلکی ژێڤە نابن.

ددەمێ ئەز لسەر جاددەیان دمەشیم، لبەرامبەری جامێن دکانان رادوەستام، داکو ب گرنگی هێڤکەمە خەیالا خوە و پرسیارکەم: ما ژ رەفتارا من دیارە کو من لبەرە خوە بکوژم؟

من گەلەك حەز دکر، ب دەنگەکێ بلند ل خەلکی بکەمە هەوار و بێژمێ: ئەز دێ مرم..هوون دزانن رامانا وێ چییە؟

بو ماوێ هەفتییەکێ من جگارە هێلان: ب وان پارێن من ئابور تێداکری موسەکا دەڤ ساروسپی .. من کڕی. دێ هوسا مرم. ب یەك لێدان. فەرە یا ب هێزو هوّڤانە بیت، ئێکسەر ل دلی بدەم، ل وی دەمی .. هەمی تشت دێ تەڤاڤ بن، ئەڤ پێترانکییە دێ ب خەمگینی تەڤاڤ بیت. لێ من ئەڤ دوماهییە ژبو بوهارا بهێت گیروکر، ئەز حەز ژ زڤستانێ دکەم و من دڤێت خوّشیێ ژ دلڤەکەریا وێ ببینم، پاشی بلا ئەو دوماهیا مشتی گریان بهێت.

ژیانا من خەونەکا مەزن و خوّشە، لێ هندەك جاران هەتا راددەیێ ئێشانێ یا نەخوّشە، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی دبیت بەرێخودانەکا شروّڤەکار و رامانداری زەلامەکی یان ژنکەکێ بیت، یان دەمێ ئەز دوو عاشقان دبینم، ب ئەڤینییەکا جوان دەستێن وان تێکدانە، یان ژی دەمێ کەنیەکا کەهی یا کویراتیا زاروّکەکێ بێگونەهـ گوهـ لێ دبم. ژیانا ئەوێن دی خوّدیکەکە ئەز ژیانا خوە یا بێ رامان و ستەور و بێ خوشییەکا ب راستی تێدا دبینم، هەڤال ژ بەحسێ پاشەروّژ و موغامەرە یێن نایاب ومشت خوبایی بێزار نابن، ل داویێ ژی دبێژن: ئاهھـ..ئەم زوی پیر بوین.

ئەز چ جاران بەحسی پاشەروّژا خوە ناکەم، چونکو ئەز دزانم وەکو ئەڤروّیا منە، ئەوا ئەز نهو تێدا دژیم، چ تشت ژێ ناهێنە گوهورین،چ جاران ژی بەحسی چیروّکا ئەڤینا خوە ناکەم. ئەز ئەڤیندارم و دلبەرا من پەیکەرەکێ ژ شەمایێ یان گێچێ چێکرییە – ئەز ب دروستی نزانم ژ کیژان ماددەی هاتییە چێکرن – لێ کچکەکا رندە، ب شەرمینی ل بەرامبەری دکانا فروّتنا جلکێن ژنکارادوەستێت. ئو ئەڤ دەربرینا ڤەشارتییا دێمێ وێ یێ دامایی داپوّشیت. من ئێخسیر دکەت. ئەڤ دەربرینە تێکهەلەیە ژ کەهیبوون و خەموکییەکا کویر. من ناڤەکێ رەنگمەزیقەیی ژێرا هەلبژارت: سوّزی.

هەر جارەکا ئەز ژبو دیتنا وێ دچووم. دناڤبەرا مەدا دانوستاندنەکا بێدەنگروی ددا. ئەڤروّ من گوّتێ: سوّزی .. ئەز خەمگینم.

– دژیانێدا .. چ تشت هێژایی خەمگینیێ نینن.

– سوّزی .. من تو دڤێی.

– ئەڤینی .. ئەحمەقییەکا مەزنە.

– سوّزی .. ئەڤینییا مە. ژ یا خەلکێ دی جوّدایە.

– تو گەنجەکێ باشی.

- سۆزی .. تو بونەوەرەکا نایابی.

ب دەنگەکێ بلند من گۆت: سۆزی .. من تو دڤێی، من تو دڤێی، من تو دڤێی.

ئێکسەر ل هەمبەری خۆدانێ دکانێ راوەستام، ئەوێ ب سەرسوورمایی و ب چریسەت سەح دکرە من، من گەلەك شەرمکر. لێ من خوە راگرت و وەسا دا خویاکرن کو چ پویتە پێناکەم. ئەز چوومە چایخانێ و من خەبەر دگۆتن، فەر بوو ب کێمی، ئەز ب قەرفینەکا زێدەڤە سەحکەمە خودانێ دکانێ. لێ بوچی نەۆ، ڤان بیرهاتنان – ئەوێن دلتەنگییەکا رەش بو من پەیدا دکەن – بیر لێ دکەمەڤە. ئەز لڤێ چایخانا ڤەدەردا یێ روونشتیمە، فەرە چ هزران نەکەم، ژبلی خۆشیێن خوە یێن بچووك.

من جگارەك بەردایێ و ب لێڤێن خوەڤە عەلاویست و من هێلا هێدی هێدی ب سۆژیت. داکو دەست پێ بکەم، خۆشی یێن خوە یێن بچووك – ئەوێن من بخۆ بو خوە چێکرین – خۆشیێ ژێ ببینم. لپشت مێزا ب رەخ منڤە، زەلامەکێ پیر یێ روونشتییە. ما بوچی ئەز وەسا هزر ناکەم کو ئەو ملیۆنێرە، خوە دناڤ جلکێن درپایدا ڤەشارتی.

من خوە کوخاند. ب مایتێکرن هێڤ دکرە من. پشتی دەمەکێ کورت دێ مێزا خوە هێلیت و ب کەیفەکا بێ توخیب دێ ب نك منڤە هێت.

دێ بێژتە من: ئول دوماهیێ، من تو دیتی .. روخسەت هەیە ب روونم. دێ بێژمێ: کەرەمکە.

- سوپاس .. تو نزانی ب دیتنا تە .. چەند یێ کەیفخۆشم. ل هەمی جهان ل تە دگەریام، دڤێ دونیایێدا ئەز زەلامەکێ ب تنێمە، من چوار لیرەیێن سۆری هەنە، من دڤێت نیڤەکا مالێ خوە بدەمە تە، ل نك من یا ئاشکرایە کو تویی ئەو گەنجێ ئەز لێ دگەریام، ئەو گەنجێ ماقویل و ژیرمەند و وێرەك و جوامێر و خۆشمرۆڤ

دێ ئاخفتنا وی برم و دێ بێژمێ: گەلەك سوپاس .. مەردینیا تە شەرمەزارکرم.

دێ خوە گێلکەم و دێ بێژمێ: ببوورە .. مەخسەدا تە تێناگەهم.

- من دڤێت نیڤەکا مالێ خوە بدەمە تە .. دوو ملیۆنن.

- نە .. نە، ئەز گەنجەکم، ب دیناتی کەربێن من ژ پارا ڤەدبن.

- ئوه ه ه .. ئەڤ رەتکرنا تە، من دئێشینیت .. هیڤی ژ تە دکەم قەبیلکە.

- باشە .. مادەم تو دکارێ ل من دکەی، ب ملیۆنەکێ ب تنێ رازیمە .. ملیۆنەك تێرا من دکەت.

ئەز ب دلخۆشی گرنژیم و من ژخوە پرسیارکر: دێ چ لڤێ ملیۆنێ کەم؟

ل دەسپێکێ دێ تەکەکێ جگارێن لوکی سترایك کرم. ئها ئەڤە زەلامێ پیر یێ ژ پشت مێزا خوە رادبیتەڤە، قورمکێ جگارا خوە دخولیدانکێدا پەتشاند. ئەو دەمێ ئەز ل هیڤیێ .. یێ نێزیك دبیت، یێ دهێت، یێ ب نك مێزا منڤە دهێت، لێ ئەو مەلعوون بەرەف دەرگەهێ چایخانێڤە چوو، خەونا من

پووچکر. خۆشیا من یا بچووك. دێ قوتم. دێ خەبەرا بێژمێ. دێ کوژم. ئەڤەر جارەکا دی من دیتەڤە، دێ بێژمێ کو بابێ وی جردەکێ رێزدارە. ئەز ئیهانەکرم .. ئیهانەیەکا نەهێتە ژبیرکرن. ما دا چ لێهێت ئەگەر پویچەکا دی خوە گیرۆکربا، هەتاکو من ئاشۆپ و خەیالێن خوە تەڤاڤ دکرن .. ئو نهۆ دێ چکەم؟

من قاپووتێ خوە، کرە بەر خوە و جگارەکا دی بەردایێ، پاشی ئەز ژ چایخانێ دەرکەفتم. جاددە یا تەر بوو، ئاسمان ژی ب عەورێن رەش یێ تژی بوو، بایەکێ تەزی ب هۆڤاتی دهات، من پستوویێ قاصووتێ خوە بلند کر و ئەز ل جهەکێ مشتی مرۆڤ ل هیڤیا پاسێ راوەستام، من وەسا دا خویاکرن کو ژ چاڤەرێکرنا پاسێ یێ بێزار بویم. پاس گیرۆ بوو. من ژڤانەکێ گەلەك گرنگهەیە. پرسا مان و نەمانێیە.

ژنەکا مەش بلەز، دبەر منرا بوری، کەرب و کینەکا دچاڤێن وێدا و ژ هەمی دێمێ وێ گازی دکر، سەرنجا من ب نك خۆڤە راکێشا. خوینگەرمییەکا ژنشکاڤە ئەز گرتم و من ددلێ خوەدا گۆت: چ لێ قەومییە؟ ئێکی ئیهانە کرییە؟ نە .. نە، ئەڤ هزرە نە ب دلێ منن. ئەرێ فەرمانبەرە و ژ کاری هاتییە دەرێخستن؟ نە .. نە، ئەڤە ژی گریمانەکا چەوتە. کەواتە ئێکی یا گۆتیێ کو مێرێ وێ – ئەوێ هەتا رادەیێ عیبادەتی حەز ژێ دکەت – یێ دڤەل ژنەکا دی و ل جهەکێ دیارکری یێ خیانەتێ لێ دکەت. ئێکسەر وەروەرا دکەنتۆرێدا هاتە بیرا من، وێ ژنکا گەنج ب تۆرەیێڤە هەلگرت و کرە دچانتەیا دەستیدا، دەرکەفتە ژ دەرڤە دا تۆلا خوە ڤەکەت. دێ دەرگەهی پالدەت و مێرێ وێ .. ب مەندەهۆشی دێ سەحکەتێ، وەروەرەکا ددەستیدا و یا ئاراستەکرییە مێری. تبلێن نە لەرزۆك و جێگر دێ لسەر جەلەبکێ شدینیت.

ئاخ خ خ .... چ کارەساتەکە! دێ .. دا بگەهمە ڤێ ژنێ، بەری ژبەر چاڤێن من هندا ببیت. چ جۆرە کارەساتەکە!

## 2. شەڤ ل باژێری

دشیانێن مندا نینە خوە گێلکەم، ل وێ پرسیارا ب رجا ومەلوولیڤە د چاڤێن دایکا مندا دهاتەکرن: تە چ کار نەدیتن؟

هەر دەمێ ئەز ژ جاددێ ڤەدگەریامەڤە، دایکا من دگەل ڤێ پرسیارێ راهاتبوو، دەمێ ئەز بێدەنگمایم، گۆتەڤە: خودانێ خانی ئەڤرۆ هاتبوو کرێیا خوە. یا لسەرێك کوم دبیت. مرۆڤەکێ قەنجە، لێ ئەڤە ژمێژە ل هیڤیێ و ئێدی سەبر نەمایە.

من گوتیَ:چ بکەم؟ تودزانی کو هەمی وەختیَ من ب لێگەریانا کاریڤە دچیت. پاشی من پێلاڤا خوە ئێخست و چوومە دژوورڤە، من خوە هاڤێتە سەر مەحفیریَ سور و من پالا خوە دا ویَ بالیفکا ب کاییَ حەشاندی. دایکا من پرسیارکر و گۆت: تەدڤێت تشتەکیَ خوارنیَ بو تە بینم؟

بێی کو باخڤم، من سەریَ خوە هژاند و دناخیَ مندا مەلوولییەکا پیس وەرارکر، بێهنەکیَ دایکا من بەرزە بوو، پاشی زڤریڤە و دوو نان و سێنیکەکا فاسولیا دانانە بەرمن، پاشی عەباییَ خوەییَ رەش کرە بەر خوە، من ژیَ پرسی: دیَ کیڤە چی؟

- خویشکا تە یا نەخۆشە؟

دەمەك ژ بێدەنگییَ بوری، من نان و فاسولیا دحەشاندنە دەڤیَ خوەدا. ددەمیَ چونێدا دایکا من گۆت: دەرگەهیَ لێنانگەهیَ نەهێلییە ڤەکری؟

ئەو ژ پشیکا مە دترسیت، ئەوا خوە ل قولاچەکا ئودیَ متکری. من گازیکریَ: پس..پس.

ب خاڤی سەحکرە من، دەمیَ چاڤێن ویَ ب سێنیکیَ و دەڤیَ من ییَ لڤوك کەفتین، بلەز رابوڤە و خوە نێزیکی من کر، منژی پرتەکا مەزن ژ نانی کرە دناڤ ئافکا فاسولییَدا و هاڤێتە بەر. بخۆ.. پشیکا من.

هەردەم دایکا من ل تە دکەتە ڤێژی: ئەبلەهیَ .. دگەل مە برسی نەبە. هەرە مالێن زەنگینان. ئاخ خ.

ژبو دایکا من یا دلسوژ.. من درەو لێکر دەمیَ من گۆتییَ کو ییَ ل کارەکی دگەریێم. ئەڤرو من چ نە کرییە ژبلی بەرزەبوونا لسەر شوستەیێن بازێری. پی یێن من، ئەزگەهاندمە جاددەیەکا ماقویل، ل وێریَ .. ل هەمبەر ئاڤاهی یێن وی یێن بلند، من هەست پێکر کو خالەکا رەشم ب بانەکیَ سپییَ پیسکریڤە. دناڤ باخچەییَ ئاڤاهییەکی، من سەیەکیَ جوان دیت و زارۆکەکیَ هێژ جوانتر یاری پیَ دکرن. ئەز راوەستام و من سەح دکریَ، پاشی ژ زارۆکی پرسیم. ناڤیَ سەییَ تە چییە؟

ب ساویلکەیی گرنژی و گۆت: جونی.

- سەییَ تە چ دخۆت.

-گوشتیَ کەلاندی .. هەر رۆژ کیلویەکا گوشتی دخۆت.

پشیکا من .. ل وی دەمی، من حەز دکر بێژمیَ: مرۆڤێن تە چ دبێژن؟ کنفیَ بێخنە ستوییَ من وگۆتی بدەنە من.

ئەگەر وی زارۆکیَ بێگونەه پرسیارکربا: تو دکاری وەکو وی ب رەوی؟ ئێکسەر دا بێژمیَ: دەمیَ گۆشت دچیتە دزکیَ مندا. وەکو وی بتنیَ نارەوم، لیَ دا ژسەیێن هەمی جیهانیَ باشتر رەوم.

کچکەکیَ گازی زارۆکی کر، من ژ ڤەلەوی و دێمیَ ویَ ییَ پف زانی کو خدامە، دەمیَ ب بەرێخودانەکا دوژمنکاری سەحکرییە من، ئەزگەلەك پیَ ئێشام. پی یێن من ب نە زانی دلڤین و چاڤێن من ب

ئاڤاهی یێن رند و جوانڤە بوون، ل وی دەمی، من ددلێ خوەدا گۆت: خوەزی ئەز ژی دئاڤاهییەکێ هوساڤە ژیا بام.

ئەی خەونا خوش! ترومبێل لبەر دەرگەهی راوەستایە، ل نێزیکی وێ شوفێرەکێ هێژایە، دژوورڤە کەلوپەلێن هەژینە و خولام و خدام دهێن و دچن، ئەزبەنی تو چ ئەمر دکەی. ئەزبەنی ئەزبەنی. خوارن گەلەکە. پارە گەلەکن و ژنکێن تەڕ و جوان.

ئەی خەونا خوش! لێ ئەڤە نە خەونا منە، ئەوا من ژ ژیانێ دڤێت. مالەکا بچووکە دگەل کچکەکا هێشتا من نە دیتی بژیم، دێ هەر رۆژەك هێت، کچکەکێ دێ بینم و ژدل دێ حەز ژێکەم، من دڤێت چ رۆژان برسی نەبم، هەروەسا ئەگەر ئەز نەخۆش کەفتم، من دڤێت من هند پارە هەبن تێرا کرێیا دختوری و بهایێ دەرمانان بکەن. بخۆ.. پشیکا من بخۆ. زکێ تەیێ مەزنە و دایکا من یا حەقە ژتە تورە ببیت.

ژیانا مە هند نەخۆشە، تەحەمولێ ناکەین. ئەڤە چەند هەیڤ بورین و ئەز هێژ بێکارم، بابێ من یێ رەبەن، هندی خوە ب وەستینیت، نەشێت ب تنێ هەمی خەرجییێن مالێ دابینکەت، فەرە هاریکاریا وی بکەم. گەلەك جاران هزر دکەم ریکلامەکا بڤی ئاوایی درۆژنامەگەرییێدا بەلاڤکەم:

"گەنجەك ژبو فروتنێ، ژییێ وی بیست و پێنج سالن، هەمی کاران دکەت و بهایێ وی ب تنێ دابینکرنا خوارنا رۆژێیە".

بڤێ رێکێ دێ ژ بەرپرسیارییێ قورتال بم، لێ ژبەر بێ پارەییێ ئەز نەشیام ڤێ هزرێ ئەنجامدەم. رۆژنامە .. ریکلامان ب هەروەیی بەلاڤ ناکەن. ئای .. پشیکا من، پێدڤییە ب هەر ئاوایێ هەبیت کارەکی ببینم، کارەك بیت مەزناهیا من بریندار نەکەت. ما دێ چ ژمرۆڤی مینیت ئەگەر مەزناهیا وی ژێ هاتە ستاندن، ما دێ چ مینیت ژبلی کومەکا گوشتێ رزی؟ پشیکا من .. ما ئەڤە یا دروستە؟

دایبابێن من و گەلەك ژ خەلکی - ئەوێن ئەز دنیاسیم - نە دگەل هزرا منن، ب ئەبلەهی شیرەتان لمن دکەن ودبێژن: ئەگەر تەڤیا دلخۆش بژی، خوە بچەمینە، سەرێ بلند هەلگرێ خوە بێزار دکەت.

نهو ژی .. پشیکا من، ژبلی ڤێ پارچێ چ دی ژ نانی نەمایە، دێ ب نیڤی کەین. پاریەکێ بچووك بو تە، بگرە. پارییێ مەزن ژی بو من. نەچە، پشیکا من، وەرە. من پشیك هەلگرت و دێمێ وێ نێزیکی چاڤێن خوە کر.

پشیکا من یا خوشتڤی. ژیانا من نەخۆشە و هەر چریسکەکا خۆشیا ددلێ مندا بوری هەژاری دخەندقینیت، لێ ئەز بێ ئومێد نابم. دێ هیڤییێ دناڤ خوینا خوەدا چینم، ب تامەزرویی دێ ل هیڤیا تیرۆژکێن خۆشیێ بم، ئەوێن کو دێ هەر هەلێن، ئو دێ خۆشیەکا راست و بەردەوام ئێخنە هەمی دلان، ل وی دەمی ژی، چ هەستێن داگرتی یێن رەش ددلێ مندا ناڕەون، ئو دەمێ مینا زارۆکەکێ دلخۆش لسەر

جاددەیێن مرۆڤان همبێزدکەن دکەمە غار، یێ سەرسورمایی نابم، من ب هەمی دەنگێ خوە کرە گازی:
ئەی مرۆڤێن لسەرگویا زەمین، من هوون دڤێن، هوون دباش بن یان ژی خراب.
هەول نەدە ژ دەستێ من ڤەرەسیێی، پشیکا من هەول نەدە. تو هەڤالا منی. ژنشکەکێڤە و ب لڤینەکا هۆڤانە پشیکێ سەرێ خوە بادا و لەقەکا ب ئێشان ل دەستێ مندا، ئەز نەچارکرم کو وێ بەردەم، یێ مەندەهوش و کەربڤە بۆی. بەری برەڤیت، من خوە لێدا و من ب دۆژمنکاری دقوتا .. هەتاکو وەلێ هاتی نەونەوەکا دژوار بکەت. تو بوچی دگەل من یا هوسایی، پشیکا من؟ بوچی؟
من هێلا ژ دەستێ من دەرکەڤیت، من خوە دیت یێ دکەڤمە سەر عەردی و یێ رویێ خوە ب مەحفیرێ سورێ زڤرڤە دنم و یێ دکەمەگری، گریانەکا تەحل.

### 3. باوشك

دەنگەکێ زڤر و بلند، یێ فرۆشوەرەکێ گەرۆك ژ کولانێ هاتە من و ئەز ژ خەو هشیار کرم، من حەز دکر ژناڤ نڤینان رابمەڤە و سەرێ خوە ژ پەنجەرێ بینمە دەر و بارانەکا خەبەران لێ ببارینم. لێ ترسا من ژ پێ زانینا بابێ من نەهێلا ڤێ حەزا خوە بجھ بینم. بێگومانە کو نهۆ یێ ل بەرسفکێ و لپشت نارگیلا خوە یێ روونشتییە، یێ ل هیڤیێ هشیار ببم و بهێتە نك من، دەستێ خوە ب نك منڤە درێژکەت: کا بینە.
دەمێ بیرا من ل خەرجکرنا پارێن شەڤا بۆری هاتی، دلتەنگیێ گرتم. ئووف .. خۆزی، دەمێ ب خەموکی ل هنگۆرییا ئێڤاری دمەشیم، من ئەو قەحبە نە دیت با، ژبلی بیست لیرەیان چ دی دبەریکێن مندا نە بوون. ب تنێ ئەڤ پارە ژ مووچەیێ من یێ هەیڤانە ما بوو، ئەوێ من لسەر جگارەفرۆشی و دکانداری و باربەری و جلك دورواری بەلاڤکرین.
من سۆز دا بوو بابێ خوە کو دەمێ وەرگرتنا مووچەیێ هەیڤانەدا چل لیرەیان بدەمێ، ئەو دەمێ شیرەتێن درێژێن بابێ من دهاتنە بیرا من کو ئەگەر بیست لیرەیان ل شوینا چلان بدەمێ، دلێ من ژ ترسا سزادانا وی درەجفی.
دەمێ من ئەو ژنك دیتی، ئەز شەپرزە بووم، من گەلەك هەولدا کو چ پویتەی پێ نەکەم، لێ ب نك منڤە هات و ب گەرمی سلاڤکر، پاشی ب دلخۆشی پرسیارکر: تو ل کیڤە یێ ڤەشارتی بوی؟ .. خۆنە تە ژن ئینایە؟ .. ئەڤە دەمەکێ درێژە من تو نەدیتی.
چ نەما بوو بێژمێ: ما دێ چ ل ئێکێ مفلس کەی؟

دەستێ خوە ل من دا و گۆت: دگەل من وەرە .. دێ مالا خوە یا نوو نیشا تە دەم. لڤێ دوماهیێ من یا کرێ کری .. یا نێزیکە.

ب شەلەژانی تبلێن من چوونە سەر پارا. ب ئێمنی. من ددلێ خوەدا دگۆت: دێ دگەل چم .. ب تنێ دا مالێ ببینم.

دەمێ خوە لسەر تەختی درێژکری. تبلێن من ب دژواری لسەر پارا شدیان. حەزەکا ب هێز دمن وەربوو کو ببەر سینگێ خوەڤە همبێزکەم. پشت راست بووم کو ئەو پارەیێن دبنێ بەریکا مندا .. نهۆ یێ لبن گەفێن مەترسییا بەرزەبوونێ. من هەولدا حەزا خوە بخەندقینم. من چاڤێن خوە ژسەر ژنکێ لادان و من سەح دکرە وێ ئۆدا تەسلیمی رۆناهییەکا کز بوی. کەلوپەل دساکار و سرۆشتینە. لێ ب ئاوایەکێ سەرنجراکێش هاتینە رێکخستن. من ددلێ خوەدا پرسیار دکر: بوچی ئەڤ ژنە. شوو ناکەت و ب تەناهی ناژیت؟

دەنگێ وێ یێ پرسیارکەر هاتە گوهێن من: مالا من یا ب دلێ تە یە؟

ئاخینکەك راهێلا و پاشی گۆت: ئەز گەلەك یا وەستیایمە.

چاڤێن من مانە پێڤە. لێڤێن وێ دڤەکری بوون. چاڤێن وێ دوەستیای بوون و گەشاتییەکا برسی تێدا بوو. خوە درێژکرنا وێ یا تەنا لسەر لێڤا تەختی. مەمکێن وێ یێن تژی ب ئیغرایەکا کوژەك ئاشکرا ببوون.

من هێدی گۆتێ: مالا تە یا جوانە .. گەلەك یا ب دلێ منە.

رابومەڤە و باوشك دهاتنە من. دەمێ پێنگاڤێن من نێزیکی تەختی دبوون. من گۆتێ: ئەز ژی وەکو تە .. یێ وەستیایمە.

ئاخ خ خ .. چ ژنەکا جوان و مەشرەبخۆشە. ئو هەکو بێهنا پرچا وێ هاتییە من. دلینییەکا ژنشکاڤە بەربوو من. هند نەما بوو ژبیرا من ببەت کو ئەز یێ دگەل قەحبەیەکێ و یا ژمنڤە تورینەکا بچووکا بێگونەهە همبێز دکەم.

ئاخ خ خ .. چ ژنەکا خۆشە. من دا خویاکرن کو حەز دکەم بچم. لێ وێ نەهێلا و گۆت: هەتاکو قەهوێ نە ڤەخۆی .. تو ناچی.

دەمێ من هێدی قەهوە ڤەدخوار. بو من بەحسی ئاستینگێن ژیانا خوە دکر. من لێ دنێری و ددلێ خوەدا دگۆت: ئەڤ ژنە یا باشە. هەژی مالەکێ و مێرەکێ جوامێرە.

دلوڤانییەکا دژوار ئەز گرتم. ل دەمێ خاترخواستنێ. لبەر دەرگەهی. ئەو بیست لیرە من کرنە ددەستاندا. ئەز نە یێ پەشێمانم ژڤێ کریارا خوە. لێ ل ڤێ سپێدێ. دێ چەوا ل هەمبەری بابێ خوە راوەستێم؟ ئاخ خ خ .. ژیانا من چەند یا نەخۆشە. ئەز ژ تەنگاڤییان بێزار بووم.

رۆژەكێ ژ رۆژان ، دێ دلێ خوەیێ ساویلكە ڤەكوژم . ئەو دلێ حەز ژ ڤی باژێرێ قەلس دكەت ، سەرەڕای وێ چەندێ كو ژیانا دلی دڤی باژێریدا ب تنێ گریانەكا درێژە . لێ دێ هەر ڤەكوژم. دێ لسەر عەردێ مەزن بەرزە بم. دبیت برسی ببم و تەنگاڤییا ببینم ، دبیت ژی ببمە خازۆك . لێ دێ یێ دلخۆش بم ، چونكو دێ دێم و باژێرێن نوو بینم. ددەمێ لێگەریانا خوەدا ، دویر نینە ، بسەر باژێرێ خوە هەلببم ، ئەو باژێرێ هەردەم خەونان ب هەبوونا ویڤە دبینم ، باژێرەك ژ جۆرەكێ سەیر و نوو ، باژێرەك كو برس و خەموكی و بێزاری خەندقاند بیت ، نە دیرۆك هەیە و رۆژێن وێ بێناڤ دبۆرن ، ئاسمان و هەیڤ و بوهار و شەڤ و پاییز و زڤستان و رۆژ و هاڤین ... هەمی دئازادن و ب چ دەمێن دیاركری و رەنگێن جێگر و نەگۆر نە دگرێداینە. هەمی خەلكێ باژێری دروژێدا چەند دەمژمێران كار دكەن و دەمێ مایی ژی ب خاڤبوونێ و باوشكا و لەزەتا ب خۆشی یێن نەدیارڤە دبورینن.

دەمێ دگەهمە ڤی باژێری ، سەرپەرشتێن وی دێ بێژنە من: ئەی بیانی .. هەتاكو تو ل باژێرێ مە بهێیە قەبیلكرن ، فەرە تو تو دبەرسڤدانا پرسیارێن مەدا بسەركەڤی. ئەڤ دانوستاندنە دناڤبەرا مەدا دقەومیت:

- ناڤێ تە چییە؟
- ئەز بێناڤم.
-كەنگی ژ دایكبۆی؟
- هێشتا نە بۆیمە.
- تو حەز ژ كاركرنێ دكەی؟
- نە .. ئەز حەز ژ هەمی تشتان دكەم ، ژبلی كاركرنێ.
- ئەو چ تشتە جانەوەران دگەهینتە پلەیا مرۆڤان؟
- نە چالاكی.
- باشترین رەفتار چییە؟
- نە چالاكی.
- تە چ ئارەزوو هەیە؟
- باوشكدان.

ب گەرمی دێ هێنە دەستێ من و دێ بێژن: وەرە دباژێرێ مەڤە .. تو كەسەكێ نموونەیی یی. ژبو رۆژا خوە ب تنێ كاربكە ، چەوا تە ڤێت وەسا بژی ، خوە تەسلیمی پالێنەرێن خوە بكە و ب خوینگەرمی ، هەمی ئەحمەقی یێن هەیی بكە. ل وێرێ ژی دێ ژنەكێ بینم سپییاتیا وێ زەڤییەكا بەفرێیە یان رویێ هەیڤەكا دلخۆشە ، شەڤا دارستانێن كچین زنجییەكە رەشاتییا خوە و گولاڤا خوە ژ پرچا وێ

وەردگریت . د ئاسمانێ چاڤێن وێ یێن کەسکدا هۆڤاتییا کویڤییا ژنێ و پاقژیا زارۆکینییا ئەبەدی همبێز دبن. ب شرینییەکا مەزن دێ بێژییە من:

- فەرە تو شەڕی بکەی؟

- دێ شەڕێ کێ کەم؟

- فەرە کار بکەی؟

- دێ چ کارکەم؟

- فەرە ل هەسپەکی سوار بی؟

- من چ شمشیر نینن؟

- فەرە بلبلەك بی.

- دەنگێ من یێ هێدی و زڤرە.

- ببە ئەلهۆ.

- بێ شاپەر.. یێ ژدایك بویم.

- پەیڤەکا لەرزۆك بە .. دسترانەکا ئەڤینیێدا.

- کەربڤەبوونەکا زیندانکریمە.

- دەمێ بەفر دباریت .. دێ مری.

ل وی دەمی ژی ب خەموکی دبێژم: دەمێ بەفر دباریت .. دێ مرم.

ب بێدەنگی دێ حەز ژ ڤێ ژنێ کەم .. هەتاکو دمرم. ددەمێ ب تنێیاتییا خوەدا ، دێ ل هندەك پەیڤێن سەیر و نوو یێن ب رتمەکا زڤر گەریێم و ب دەنگەکێ سەرخۆش دێ بو خوە سترینم. جیهان بێی پەیڤ و ستران گەلەك یا بێزار و نە خۆشە. ئاھ ھ ھ .. ل وی باژێری، ژیان چەند یا خۆشە، دێ رۆژەك هێت .. دێ بارکەم و باژێرێ خوەیێ مشتی جەندەکێن لڤۆك ، دێ لپشت خوە هێلم. دێ خوە ژ خەمەکا هەردەم ب دویف منڤە رزگارکەم.

پشتی بێهنەکا دی، دێ ل هەمبەر راوەستێم، پی یێن بابێ من دارێ دەرەجکێن دگەهنە ژوورا من دقوتن. بێگومانە دێ هێت و دێ پارا ژمن خوازیت. چارە چییە؟ بلەز من خوە ئێخستە دنڤستنەکا کویردا. دەرگەھ ڤەبوو. کوخکا بابێ من یا هشك و کورت گەهشتە ئۆدێ، پشتی هینگێ، دەمەکێ بێدەنگیێ دئۆدێ وەربوو، ئەز ژی ژجھ نە لڤیم، من گوھ لێبوو، پێنگاڤێن وی بەرەف جلکێن من دمەشیان. دێ لێگەریێت ، دێ ب دیتنا بەریکێن ڤالا سەتمیت. چ پێ نەچوو، دەستێ بابێ من ئەز دهژاندم و دەنگێ وی ب ڤێژی بلند بوو: کا پارە؟

من چاڤێن خوە ڤەکرن و خوە مەندەهۆشکر.. جارەکا دی ب تورەیێڤە پرسیارکر: کا پارە؟

دیٚ چ کەم؟ پێدڤییە خوە ژ شیرەت و کەربڤەبوونا وی رزگارکەم. ژبلی درەویٚ چ چارەیێن دی نینن، بابیٚ من یێ دلساف و باشە.

من گوت: باب .. بلەز تۆرە نەبە. خوە بگرە هەتاکو بو تە دبێژم .. کا چ ل پارا هاتییە. دوهی من سەرەدانا هەڤالەکیٚ خوە یێ کەڤن کر و من دیت کو یێ نەخۆشە، پاشی من زانی، ئەڤە ماوەیەکیٚ درێژە یێ بێکار، ئەو ب تنێ بەرپرسیٚ خێزانەکا بۆشە، بێی دوودلی من بەریکێن خوە ڤالاکرنە بەر، هەرچەندە نەڤیا هەلگریت و رەتکرنا پاراکر، لیٚ من دکارییەکا زۆر لێکر و من هیڤی ژێکرن کو هەلگریت، ئو پاشی هەلگرتن.

دبەرێخۆدانەکا بلەزدا من زانی کو ئەز د درەوکرنا خوەدا بسەرکەفتم، تۆرەبوونا وی نەما ل شوینا ویٚ، حەییرینەکا پۆسیدە بەربوییٚ.

بێهنەکیٚ ب دوودلی ما راوەستای و پاشی ژ ئۆدیٚ دەرکەفت، بێی هیچ ئاخفتنەك .. دەرگەه ب دژواری لدویف خوە پێڤەدا.

من ئاخینکەکا رەحەت راهێلا و چاڤێن خوە دانانە سەرێك، زڤریمەڤە خەونا خوە، کو بەرەف باژێرەکی بارکەم، برس و خەموکی و بێزاری یا خوە یا خەندقاندی.

## 4. نان و خەمۆکی

جاددەیا فوئادیٚ ئێکیٚ ب دلخۆشی دبن رۆناهیا تیرۆژکێن بوهارێڤە بوو، خەلك ب مشەیی لسەر شوستەیێن وی دبەلاڤەبوون، ئاسمان ب فرەهی و دلڤەکەری ل هنداڤ من یێ شین بوو، نالینا ترێنیٚ و دەنگیٚ مەکینەیێن ترۆمبێلان دناڤ دەنگەکیٚ ب تنێدا تێکهەل دبن و وەل من دکەن کو هەست ب هاڤیبوونەکا ئەبلەه بکەم. پێنگاڤا من لڤینەکا کەڤنە لسەر لێڤێن شوستەیێن بچووکێن چوارگۆشەیی دووبارە دبیت، من قەمبەلەیێن کادییٚ ژ جگارا خوە بەردان و من هەژاری و پیراتییا کویراتییا خوە لسەر دێمیٚ خوەییٚ دامایی هەلگرت بوون.

ل بەرامبەری دکانا بابیٚ خێری راوەستام، داکو وەکو هەرجار دگەل باخڤم .. فرۆشوەریٚ رۆژنامە و عەرەقیٚ و جگارا، من سلاڤکرە بابیٚ خێری و بلەز ژیٚ پرسیم: ئەریٚ ما بازارا عەرەقیٚ هاتییە گوهارتن؟ ب گرنژینەکا درێژ بو من گرنژی و گۆت: نەخێر.. یێ ئێمن بە.

لسەر رێڤەچوونا خوە یێ بەردەوام بووم و ب دلخۆشی من قەستکرە باربەریٚ خوە .. چەند پێنگاڤەکا یێ دویر بوو، چ راستی ژبو وان گۆتگۆتکان نینە، ئەوێن دبێژن کو بهاییٚ عەرەقیٚ یێ گران بوی، فەرە بهایێن عەرەقیٚ و ژنکا و نانی هەردەم د ئەرزان بن، چونکو ئەڤ تشتەنە رامانەکا خۆش ددەنە ژیانیٚ.

چارداغا باربەری یا نیڤ ڤالا بوو، خۆدان ژی یێ مژوولی چێکرنا پرچا ئێکی بوو، من ملێ خوە دا دەرگەهی و سەح دکره وان جانەوەرێن خوە لسەر جاددێ دراخشینن. ئەز تێهنیمە، تامەزرویێ لەشێ ژنەکێمە!.. چ ژنکا بیت. ئەز دکارم بچمە قەحبەخانێ، لێ قەحبەیێن سەر جاددان دچێترینم، ئەوێن پیچەکێ ژ هەپارە یا خۆشیێ ددەنە کەسێن دگەل دنڤن. دوهی ب شەڤێ پتر ژ دوو دەمژمێران لسەر جاددەیێن بەغدا .. ل ژنەکێ دگەریام، پتر ژ جارەکێ ئەز نێزیکی مەرەما خوە دبووم، لێ ترۆمبێلێن مەلعوون لبەر من دراوەستای بوون. ترۆمبێل ب پێلاڤا شوستەیانڤە دراوەستێن، دەرگەهی ڤەدکەن و ژنێن دەهمەنپیس دادعوینن، ژن خۆدانێن ترۆمبێلان لسەر کەسێن وەك من یێن پەیادە دچێترینن.

عەیب و شۆرەیی!

کچەکا پێگەهشتی ژ لایێ مێیاتییێڤە، دبەر منرا بۆری و چاڤێن من یێن برسی .. هێدی هێدی ئەو دخوار. چاڤێن وێ یێن رەش شەڤەکا هۆڤ بوو ب منڤە نووسیای. ئەز کێشامە دناڤ کورکەکا ب ترسدا، مەمکێن وێ دبن کراسێ تەنگڤە، جوانییەکا هۆڤانە ددەتێ. دلێ من ب دژواری دچوویێ. من ددانێن خوە لسەرێك دسیرکاندن، ل وی دەمی کەچك .. هێدی هێدی ژبەر چاڤێن من دویر دکەفت و رەجفینەك هێلا دلەشێ مندا، ئەز ئەشکەنجە ددام، ژ نەما بوو بلڤم و ب دویف بکەڤم .. لێ دوی دەمیدا، گازیا باربەری ئەز لێڤەکرم.

لسەر کورسیکا فرەه روونشتم و من سەرێ خوە پالدا پشتێ، فرچەیێ نەرم لسەر رویێ من دگەڤزی و تەخەکا کەفا سابوونێ داناسەر، پاشی مۆسا تراشینێ هێدی هێدی لسەر رویێ من دچوو هەتا گەهشتییە حەفکێ، من ب ترس هزرکر: ئەگەر ژنشکەکێڤە، سەرێ خوە بەرەف پێشڤە بلڤینم، مۆس دێ دحەفکا مندا چیتە خوار، ل وی دەمی مۆس گەهشت بوو گەوریا من و هەناسەیەکا ب ترس ژمن دەردکەفت.

پشتی بێهنەکێ چارداغا باربەری ئەز هاڤێتمە سەر جاددێ، سیگارا من ژی هەر یا دسۆژیت. سیگار هەڤالا منە و دەمێ ئەز دمەشم و هەژاری و پیرییا کویراتییا خوە لسەر دێمێ خوەیی دامایی دهەلگرم، هەردەم دناڤ لێڤێن مندایە. دناڤ هەموو دێمێن ل دورماندۆری خوە، ئەز نەشێم دێمەکێ دامایێ ب تنێ ژی ببینم. بوهار هاتەڤە و خۆشیا خوەیا گەرم لسەر هەمیا بەلاڤکر. هندەك بلەز یێ بەرەف سینەمایێ دچن، ئەوێن دی ژی ب خۆشی لبن گەرمیا رۆژێ دچەورن، ژن ژی چاڤ ب بشکورینن و دجوانن .. ئەز هوسا وان دبینم، نەمازە ل ئەڤرۆ.

ئەڤە کیژ ئەحمەڤە، دەستێ خوە ب سلاڤکینی بلند دکەت و ژمن نێزیك دبیت؟ ئوه ه ه .. بیرا من لێ هاتەڤە، من ل چایخانێ نیاسی بوو، چەندین جاران من ل وێرێ دیت بوو، لێ من ناڤێ وی یێ ژبیرکری.

ب گەرمی دەستێ من گڤاشت، هەروەکو ئەم ژکەڤندا هەڤال .. گۆت: دێ کیڤە چی؟

- بێی ئارمانجەکا دیارکری، یێ دگەریێم.

- ئەز ژی وەکو تەمە.

ب رەخ منڤە دچوو، دەست ب ڤلڤلیێ کر. بەحسی کارێ خوەکر، ژیانا خوە، بەحسی وێ کچکێ کر ئەوا ل ڤان نێزیکان دێ خوازیت. چ ئەبلەهەکە! .. ما من چ شۆل بڤێ هەمیێ هەیە.

ژمن پرسیارکر: ئەرێ تو ئەڤینداری؟

من گۆتێ: نەخێر .. ئەز نە ئەڤیندارم.

گۆت: ما بەری نهو ژی تە ئەڤینی نەکرییە؟

من گۆتێ: نەخێر .. بەری نهو ژی من ئەڤینی نەکرییە.

ب کەنیڤە گۆت: کەواتە، تە تام نەکرییە خۆشیا ب راستی، ئەو خۆشیا ئەڤینی ب تنێ ددەتە مرۆڤی.

چ ئەبلەهەکە! بو راستیێ بێژم؟! رۆژەکێ ژ رۆژان، من ژی کچکەك دڤیا. من ب هێز حەز ژێ دکر، مینا حەزکرنا من ژبو نانی و جاددەیان. لێ ئەڤینیێ ژبلی خەموکیێ چ نەدا من. وەل منکر کو ب نێرینەکا نوو سەحکەمە وی باژێرێ ئەز تێدا دژیم، نهو ئەز دبینم کو باژێرەکێ دلڕەق و بێ بهایە.

بێهنەکێ بێدەنگما و پاشی گۆت: هیڤیا تە چییە، ئەوا تە دڤێت بجه بینی؟

چ بەرسڤدەم؟ سەرێ من بوشاییەکا سپییە. گەلەك جاران حەزدکەم خەلك هەمی ببنە صە، هەر ب ڕەون و نەراوەستن.

من گۆت: من چ هیڤی نینن.

- ئەز باوەرناکەم .. پێدڤییە تە هیڤییەك هەبیت.

- ما بوچییە، هیڤییان لسەرێك کومکەم، ئەگەر بزانم ئێکا بتنێ ژی ب دەست منڤە ناهێت؟ ئەوا ئەز دبێژمە تە .. ژیانا منە. پشتی ئەز ئاشکێ خوە ب نانی تژی دکەم و دگەل ژنەکێ دنڤم، من چ دی نەڤێت.

بەری باخڤیت، بێهنەکێ هزرێن خوەکرن و پاشی ب دوودلی گۆت: کەواتە .. تو نە ژ توخمێ مرۆڤانی.

ئەی ئەوێ بیانی، ئەز ژتە باوەر ناکەم. تشتەکم یێ هشك و زڤر رەق و نە مرۆڤانتی.

بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و پرسیارکر: مادەم تە چ هیڤی نینن .. پا تو بوچی کار دکەی؟

من سەرێ خوە هژاند و مامە بێدەنگ، من چ جاران هزرا خوە دڤی بابەتیدا نەکرییە. ل نڤیسینگەها راگەهاندنێ، ئەز فەرمانبەرەکێ ساکارم. رۆژێ هەمیێ ب خاڤی لپشت ئالاڤێ نڤیسینێ دروونم و تبلێن من ب ساویلکەیی لسەر رویێ تیپان دلڤن. دبیت کارکرنا من ژبەرهندێ بیت چونکو هێزەکا پەستدار ژمن دەردکەڤیت. دبیت ژی کاربکەم داکو نانەکێ ژبو پرکرنا ئاشکێ خوە دابینکەم، یان ژی

دبیت ژبەر ژنەکێ بیت، بو ماوەیەکێ دیارکری ب پارێن من بهێتە کرین. ئەی ئەوێ بیانی، ب خاترا تە. یێ هەست پێ دکەم کو دیوارەکێ بلند دناڤبەرا مەدا هاتە دانان و ئێدی ئەم نەشێین یەك پەیڤ ژی ل هەڤ بگوهورین. ژێ دوورکەفتم، بەرەف رێکا حیجازێ ژێهەل چووم، ل بەرامبەری من دەمژمێرا دانانگەهێ سێ بوو.

ئها .. ئەڤە سینەما یا درژڤریت، دا پیچەکێ لنك وێنەیان راوەستم. لبەر دەرگەهێ دوو لا بوون، وێنەیێن فیلمی لپشت بۆردەکێ شووشەی درێژکری بوون، ل بەرامبەری یەك ژ لایان راوەستام و من تێرا مانا وێنەیانکر: کولێن داوەشاندی لسەر دەڤی و زکی .. وەروەرە .. سهێن رەش .. تبلێن گرژبۆی ژ ترساندا. دەنگەك هاتە گوهێن من، زەنگەکا نویسەك تێدا بوو، سەرنجا من راکێشا: ئەرێ فیلم، یێ خۆشە؟

من سەرێ خوە زڤراند، دا بزانم چییە، من بەرێ خوە دا رەخێ دی یێ بۆردا شووشەی، سنێلەیەکێ شازدە سالی ل وێرێ بوو، زەلامەکێ پیر ل نێزیك وی یێ راوەستای بوو، جارەکا دی پرسیار ژ سنێلەی کر: ئەرێ فلیم .. یێ خۆشە؟

ئەوێ سنێلە پیچەکێ ڤەما و پاشی گۆت: ئەز نزانم .. چونکو من نە دیتییە.

ئەوێ پیر گۆت: هەروەکو ژ وێنەیان دیار، فیلم یێ خۆشە. ها بگرە .. دوو پلێتان پێ بکرە. یەك بو من و ئەوا دی ژی ژبو تە.

زەلامی دەستێ خوە درێژکرە بەریکا خوە.

من خوە دیت ب زڤری یێ دکوخم، ب قەرفینڤە یێ تف دکەمە سەر عەردی کو هەمیا گوه لێ ببیت، زەلام ل من زڤری و چاڤێن وی پەلێن نەرازیبوونێ ژێ دپەشین، ل وی دەمی زارۆکی ب دەرفەت دیت و بلەز ژێ دوورکەفت. ئەز رك و رك، ب قەبخواستن دوی زەلامی فوکریم .. دێ .. حەزا من یا ژ هەمیا چێتر ئازراندنا شەرانە. ئەو زەلام ل هەمبەری نێرینێن من یێن جێگر شەپلی. ژنشکەکێڤە بەرەف وی جهێ زارۆك تێرا چۆی، کرە غار.

زڤریمەڤە سەر مەشا خوە. ئاخ خ خ بازێرێ من. رۆژەکێ ژ رۆژان لسەر شوستەیێن تە .. یێ ژدایکبویم و هەتا مرنێ ژی دێ یێ پێڤە گرێدای بم. چەند یا دژوارە، ئەو هەرایا ل جاددەیا نەسر رووسدای، پێنگاڤێن من لسەر رویێ شوستەیێن وی دهێنە راکێشان .. ترۆمبێل .. پاس .. رۆژ .. ئاسمان .. دارێن کەسکاتییا وان گەلەك جوان .. زەلام .. ژنێن رەند .. چاڤێن من ب برسیبوون لێ دنێرن.

چەند حەز دکەم من هەڤالینییەك دگەل کچکەکێ هەبیت .. من نەڤێت ئەڤینیێ دگەل بکەم، ب تنێ من دڤێت هەڤال بیت و چ دی نە. دێ بو وێ بەحسی خەموکییا خوەکەم، ئەوا من ب هندەك جاددە یێن لەولەبی یێن بێ دوماهیڤە گرێددەت. دێ بو وێ بەحسی خۆدێ و خەلکی و نانی و شەڤێ و هۆڤێ

بلیانی کەم. دبیت ژی ژنشکەکێڤە راوەستێم وبیێ شەرم بەردەمە گرییێ. ب درێژی بکەمە ڤێژی مینا ڕەوینا صەیەکێ لبەر قوتانەکا دژوار. لێ ئەو کچ ل کیڤەیە؟

فرۆشوەرەکا بەختی رێکا من گرت و گۆت: ئێکێ بکڕە.

یا جوان بوو. ئەز دبێژم ژییێ وێ نێزیکی دەھ سالییێ بوو. من گۆتیێ: نەء.

- دێ فایدە بی.

ل وی دەمێ وێ دکاری ل من دکر. من ب گرنژینڤە سەح دکرێ. بەدلەیا جوان و پێلاڤا تەییسۆك و کوملەکێ سپی یێ پستۆرەق و بویمباخێ دسەردا بربوو. ب پێتڕانکیڤە من گۆتیێ: ئەز نا کرم. لێ دێ پێنج لیرەیان دەمە تە. ئەگەر دگەل من بهێیە مال.

ب بەرێخودانەکێ سەح دکرە من. ب پەشێمانی ئەز ل جهێ خوە هشککرم. بەرێخۆدانەك بوو. مشتی پەشێمانی و خەم و دلقەڕفین. کچکووکا من وەرە .. ب هندی پارێن من هەین دێ ژتە کرم. لێ ژمن دوورکەفت.

ئاخ خ خ .. ئەز چ مرۆڤەکێ چ نەمە. هەستپێکرنەکا ب هاڤیبوونەکا ساویلکەیی دناخێ مندا درەوی.

بابێ من ب دێمێ خوەیێ چرمسۆکڤە ب پێتڕانکی دگۆت: تو کورەکی .. ب کێر چ ناهێی.

دایکا من ئاخفتنا خوە ب پەشێمانیڤە دووبارە دکر. ئەوا هەردەم دهافتە روییێ من و بابێ من: ژیانا من لبەر پی یێن وە یا بەرزەیە.

مرۆڤێن من. ئەوێن چاڤێن وان گازنان دبارینن. دگۆتن: ئەگەر تو هوسا ب مینی .. پاشەرۆژا تە یا رەشە.

هەکو ئەز لسەر شوستەیێ مشتی مرۆڤ راوەستای. ئەڤە هەمی دهاتنە بیرا من. من هەست ب حەزەکێ کر کو دناڤ دلبوورینەکا درێژدا ب خەندقم. دوی دەمیدا. کومەکا کچان دبەر منڕا بۆرین. ب دلخۆشی دئاخفتن و دکەنین. من سەحکرە ئێکێ ژوان. ب گرنژینەکا مشت دلوڤانی کو دێمێ وێ یێ بالکێش گەش دکر. بو من گرنژی.

ئاھ ھ ھ .. ئەی کچا باش. ئەز نە هەژی گرنژینا تەمە. ئەگەر پیچەکێ پێنگاڤێن خوە گرانکەی. دبیت ژتە نێزیك ببم و بێژمە تە. دا مرۆڤەکێ باش بم .. ئەگەر باژێرێ منژی وەکو تە با.

*　　*　　*

## دویر ژ مال

عەبدلا لسەر پشتێ یێ درێژكری بوو. چاڤێن وی دگرتی بوون. ئو ژكەیف دگرنژی. گەلەك ئالاڤێن دەنگتیژ دخەودا ددیتن. دەستێ لەمیا یا ژنا خوە دهژاند لێ دەنگێ ئالاڤان هەر بلند دبوو. هەروەكو سترانەكە و ب ملیونان خەلك یێ دبێژن .. دەنگێ لەمیایێ ژی بلند بوو: رابە. درەنگە ل كارێ تە!

عەبدلای چاڤێن خوەڤەكرن. هەمی ئالاڤ یێكڤە راوەستان. ب گرانی ژناڤ نڤینان دەركەفت و چوو لێنانگەهێ. ل وێرێ دەست و چاڤێن خوە شویشتن و پیچەكێ پرچا خوە تەركر و ژڤریڤە ژوورا خوە. دەستوچاڤێن خوە ب خاولییەكا شین هشك كرن. جلكێن خوە كرنە بەرخوە و ل بەرامبەر خودیكێ راوەستا. پرچا خوە شە كر و پاشی تێشتا خوە دخوار.

ژنشكەكێڤە دەرگەهـ هاتە قوتان. لەمیایێ پاریەك هاڤێتە ددەڤێ خوەدا و ب لێڤموچكی گازیكر: كییە؟ چ بەرسڤ نەبهیستن. لێ دەرقوتان بهێزترو دوژمنكاریتر لێهات. عەبدلای ب خەمساریڤە گۆتە لەمیایێ: دێ ب لڤە. هلو هەرە دەرگەهی ڤەكە.

لەمیا ب غار چوو دەرگەهی و پیچەك ڤەكر كو بشێت ببینیت. سێ زەلامێن ئەنی گرێ و چاڤ هشك دیتن. پولیس بوون.

ئێكێ جوان گۆت: عەبدلایێ نەجمی ل مالە؟

لەمیایێ ب ترس لێ ڤەگەراند: هەوە چ ژێ دڤێت؟

پولیسی ئەنیا خوە لێ كرە گرێ و گۆتێ: مەدڤێت بتنێ پرسیارەكێ ژێ بكەین.

لەمیا. رەنگسیس و ب لەرزكڤە زڤریڤە ژوورێ. عەبدلای سەرێ خوە بلندكر. بەرێخودانەكا پرسیاركەر ژچاڤێن وی دباری. ب دەنگەكێ ترتری لەمیایێ گوتێ : پولیس یێ پرسیارا تە دكەن.

عەبدلا رابوڤە و ب شەپرزەیی و سەرسورمایڤە گۆتێ: پولیس!؟

بەرەف دەرێ ژدەرڤە چوو. لەمیا ژی ب دویفڤە بوو. دەستەكێ دلرەق دلێ وی دگڤاشت. دەمێ عەبدلای دەرگەهـ ڤەكری و كەفتییە بەرامبەری سێ پولیسێن مینا ئاسنێ كەڤن راوەستای.

ئێكێ ژوان ب دەنگەكێ هشك گۆتێ: تویی عەبدلایێ نەجمی؟

- بەلێ ئەز عەبدلامە.

هەر دەملدەست هەرسێ پێكڤە داجریانێ و ب دوژمنكارییەكا ژنشكاڤە گرتن و ژملاڤە راكێشاو كرە دهناڤێن ترومبێلەكا سوردا. لەمیا نەشیا بكەتە ڤێژی. دەنگەك ژ ترومبێلێ هات. ژمالا وان دویركەفت و بەرزە بوو. هینگێ ژنوی لەمیایێ كرە ڤێژی و كەفتە دنالنالەكا درێژدا.

هەڤسوی و هەڤدەران ئەڤ نالەنالە بهیستن و دەرگەهـ ڤەبوون. سەرێن ژنكان و زەلامان ژ پەنجەران شۆر دبوون. ژنك بلەزگەهشتنە مالا لەمیایێ كو بزانن كا چ قەومییە و زەلام ژی ل دورماندۆری بەر دەرێن مالا مابونە ل هیڤیا زانینا ئەگەرێ ڤێ نالەنالێ.

- عەبدلا گرت.

- کیّ؟

- پولیسان.

- عەبدلایێ رەبەن.

- ماچ کریوو؟

- رەبەنی.

- هەرە و لێ بگەریێ.

- ئها نهو هەرە.

- ل کیڤه لێ بگەریێم؟!

- ل بنگەهێ پولیسان.

هەر ژدەمێ ژنك ڤەرەڤین و زڤرینەڤه مالێن خوه , لەمیا بزدیا .. چونکو بتنێ مابوو دمالڤه , دێ چەوا بتنێ چیت و ل عەبدلای گەریێت؟ هوی ببوو کو هەردەم دەمێ جلك دکرین یان ژی دەمێ دچوو سەرشوا بازاری دگەل کەسوخزمێن خوه دا بیت , لێ دەمێ هزرا عەبدلای دکر و پولیسان .. ئەو وەکو بەرحکا رادکێشا , هێزەکا ژنشکەکێڤه بو چێبوو, ئێکسەر کراسێ خوەیێ رەش کرە بەرخوە و ژمال دەرکەفت , بلەز ب رێڤه دچوو, بێ پێچە، روندك ژچاڤان دبارین , زەلامەکێ پیر, زەرفەکێ کاغەزی یێ مشتی نان ڤێبوو.. رێکا وێ گرت و ب گرنگی ژێ پرسیارکر: تە چییە؟ کەچا من.

لەمیایێ بەرسڤ نەدا , پیرەمێری ب دلوڤانی جارەکا دی گۆتێ: ئەرێ تە پێدڤی ب هاریکاریێ هەیە؟ شەرم نەکە , ئەم هەمی مروڤین و مە پێدڤی ب هاریکاریێ هەیە. لەمیایێ روییێ خوە ب کەفیکەکا سپی مالشت وگۆتێ:

- مێرێ من یێ گرتی.

- بوچی؟

- نزانم؟

- یائێمن بە ئەگەر چ گونەهکاری نە کربن دێ بەردەن.

لەمیا یا بەردەوام بوو دکولانگێن تەنگو خواردا ب رێڤه دچوو, دەمێ گەهشتییە گورەپانا باژێری , جرفەك ڤێ کەفت دەمێ دیتی خەلکەکێ زۆر یێ لدور سێدارەکا دنیڤەکا گورەپانێدا خرڤەبوی , ژهندەکان بهیست , دگۆتن: ئەوێ خەندقاندی ژنکەك یا ڤەکوشتی.

لەمیایێ خوە دیت بێی حەمدی خوە بەرەف سێدارێڤه دچیت و خوە دناڤ قەرەبالغێ قوتا .. هەتا گەهشتییە نك سێدارێ, ئەوێ خەندقاندی زەلامەکێ بەژن درێژ بوو, روییێ وی مەیلەو شین بوو, لەشێ

وی یێ ب کراسەکێ سپی داپوشی بوو. جارجار ب گرانی دهژیا. لەمیا نەشیا چاڤێن خوە ژ وی کەسێ خەندقاندی ڤەکەت کو نە عەبدلا بوو. هەرماو ب هەردوو چاڤێن خوە یێن مەزن، ئەوێن مشتی ترس و نەڤیان، تێ دفوکری.

گەنجەکێ پرچ رەش، داڤەکا پرچا وی بسەر ئەنیێدا هاتبوو خوار. ژلەمیایێ نێزیك بوو. ب مەرەم لپشت وێ راوەستیا و پێڤە نویسیا. لەمیایێ هەست ب لەشەکێ بیانی کر دڤیا بلڤیت لێ قەرەبالغ زێدەتر لێهات. ئەوێ گەنج پتر پێڤە نویسیا.. لێ زڤری، ب ئاڤرییەکا بلەز لێ نێرێ. روییێ گەنجی یێ تەڕبوو. ب ئەڤینی و ب بێگونەهی دگرنژی.

پێڤە نویسیانا گەنجی ب لەمیایێڤە دژوار بوو.. ئێمناهی و ترس، دخوینهێنەرێن لەشێ وێدا تێکهەلبوون. هزرکر یا گوهـ ل بێهن کورتییەکێ دبیت، عەبدلا هاتە بیرێ.. پیچەکێ پەشێمان بوو. ژنشکەکێڤە لڤی و خوە ژڤەرەبالغێ قورتالکر.

ژێ دویرکەفت، بەرەف بنگەهێ پولیسانڤە چوو. هەست پێکر کو ئەو گەنجێ پرچ رەش ژ دویرڤە یێ لدویڤ دهێت.

گەهشتە ئاڤاهیێ بنگەهێ پولیسان، ب دوودلی چو دژوورڤە، ل بەرسفکەکا فرەهـ سەوداسەر راوەستیا و پاشی چوو دژوورەکا دەرڤەکریڤە. یامشتی زەلامێن پولیس بوو.. ل نێزیکی دەرگەهی. پولیسەك لپشت مێزەکێ یێ رونشتی بوو. ژێ پرسیارکر: من دڤێت زەلامێ خوە ببینم؟

- کا زەلامێ تە، ما پولیسە؟

- نەخێر. زەلامێ من یێ گرتییە.

- ناڤێ وی چییە؟

- عەبدلا نەجم.

دەفتەرەکا مەزن لبەرسینگێ پولیسی یا ڤەکری بوو.. هێڤکرێ و تبلا خوە ب ناڤاندا دئینا خوار. دگەل خوە دگۆت:

عەبدلا نەجم.. عەبدلا نەجم ........

پاشی سەرێ خوە بلندکر و گۆت: تێدا نینە.

ژنك حەییری و ژێ پرسیارکر: دێ ل کیڤە بینم.

- ل بنگەهەکێ دی یێ پولیسان پرسیارکە.

ژ بنگەهێ پولیسان دەرکەفت و خەموکییا وێ زێدەتر لێهات، جادده د زۆرن و هەرجاددەکێ بنگەهەکێ پولیسان یێ لێ.

ئەوێ گەنج ژی هەر ب دویڤڤە بوو، رۆژێ تیرۆژکێن خوە بەرددانە سەر ئاڤاهییا و چیمەنتوییێ، ترومبێل ژی ب هۆڕێنێن خوە یێن تیژڤە دبورین، خەلکەکێ تێکهەل ب سەرشوستەیاندا دهاتن و دچوون، دەمێ ئەوێ گەنج ژێ نێزیك بوی، لەمیا شەپلی و ئالۆز بوو، گەهشتە بنگەهەکێ دی یێ پولیسان و هلدا ژوور، بەرامبەری مێزەکێ راوەستیا، پولیسێ لپشت مێزی ب تێلەفونێ دئاخفت، دکەنی و دگۆت: نە .. نە .. ئەڤە درەوە.

هندەك پەیڤێن دی گۆتن و پشتی خاترخواستنێ تێلەفون دانا. دویکێلا جگارا خوە بەردا و لەمیا پشت گوهـ هاڤێتبوو. خو ئاورەکێ ژی لێ نە نێری. لەمیایێ خوە کوخاند و پتر خوە نێزیکی مێزێ کر. پولیسی ب هشکی گۆتێ:

- تە چ دڤێت؟

- من دڤێت زەلامێ خوە ببینم.

پولیسی ب دوو چاڤێن ڤەکولەر هێڤکرێ. دێمێ وێ سپی و ژێهاتی بوو. ب غەرەزداری گرنژی و گۆتێ: ناڤێ وی چییە؟

- عەبدلا نەجم.

- چ زەلامێن بڤی ناڤی لڤێرە نینن.

- ب شەپرزەییڤە گۆتێ: دێ ل کیڤە بینم؟

- ل بنگەهەکێ دی یێ پولیسان لێ بگەرییێ.

جارەکادی زڤریڤە سەر جاددێ و دبن لێڤلێڤکاڤە دگۆت: ئوف .. خودێ من چ کرییە کو هوسا من ب ئێشینێ. خوەزی دراهێلان کو گوهدارییا دایکا خوە کربا و رۆژێ پێنج جاران نڤێژ کربان و نە هێلابان.

ئەو گەنجێ پرچ رەش ژی ب رژدی هێشتا یێ ب دویڤڤە. ژبنگەهەکێ دی یێ پولیسان نێزیك بوو.

خەلکەکێ بۆش لبەر دەرێ بنگەهی خڕڤە ببوون و ب مایتێکرن هێڤ دکرە زەلامەکێ سەر سفرکری.

چاڤێن وی دمەزن بوون و روییێ وی یێ چرمسی بوو. لێ نە عەبدلا بوو. هندەك پولیسان زەلام گرتبوو.

لێ زەلامی نە دڤیا بچیتە دبنگەهێ پولیسانڤە .. لەوا پولیس ب دەستا دابەزینێ و روییێ وی و سینگو زکێ وی ددانە بەر کولما هەتا کەفتییە سەر عەردی. ئەڤجا پولیسان پێن لێ ددان و وی ژی دکرە قێژی: ئای دێ مرم .. دێ مرم.

دەمێ بێهێز بوی. پولیسان هەلگرت و برە دبنگەهیڤە و هندەك پولیسێن دی ژێ دەردکەفتن ..

حەیزەرانێن زراڤ و درێژ ددەستاندا بوون. ل روییێ خەلکی بلند کرن. ئانکو داخوازا وان ژێك ب بژکن و دویرکەڤن.

پولیسەکی گۆتە لەمیایێ: حورمەت ماتە گوهـ لێ نە بوو؟ دێ دویرکەڤە.

لەمیایێ گوت: من دڤیت پرسیارا زەلامێ خوە بکەم.

- کانێیە؟

لەمیایێ ئیشارەتکرە بنگەهێ پولیساو ئەوێ پولیس گۆتێ: هەرە ژوور.

لەمیا چەند دەرەجکەکا بسەرکەفت و چوو ژوور. هۆلەکا پان و درێژ بوو.. ل هەردوو رەخان هژمارەکا ژوورا بوو. دەرگەهەك ڤەکر. هژمارەکا پولیسان دیت، ب دەنگەکێ بلند دئاخفتن و دکەنین و چا ڤەدخوارن و جگارە دکێشان. ئێکێ ژ وان ب رەقی گۆتێ: تەچ دڤێت؟

پولیسەکێ روی جوان رابوڤە و چاڤێن وی ژنێرینێن فیلبازی دپر بوون. گۆت: رێزێ ل ژنان بگرن.

خوە نێزیکی لەمیایێ کر و ژێ پرسیارکر: تە چ دڤێت؟

- من دڤێت زەلامێ خوە ببینم.

- زەلامێ تە ل کیڤەیە؟

- یێ گرتی.

- کەنگی؟

- ڤێ سپێدێ.

چاڤێن پولیسی مانە ب لێڤێن وێ یێن سورڤەو و گۆتێ: تە کەنگی شوو کرییە؟

- بەری حەفت هەیڤان.

- نهو من زانی تو بوچی پرسیارا وی دکەی!

پێلەکا گرنژین و کەنیێ ژ پولیسان دەرکەفت. لێ ئەوێ پولیس لێ زڤری و گۆتێ: پرسیارا ژوورەکا دی بکە.

ژ وێ ژوورێ دەرکەفت دا بچیتە دئێکا دیڤە. دژوورا دیڤە ئەفسەرەك لپشت مێزەکا جوان یێ روونشتی بوو.. پشتی بێهنەکێ سەرێ خوە بلند کر و ب عێجزیڤە گۆتە لەمیایێ: کێ تو دەستویر دای بهێیە دژوورڤە.

- من دڤێت پرسیارا زەلامێ خوە بکەم.

- چ کرییە؟

- چ نەکرییە.

- باشە .. پا تو بوچی لڤێرە پرسیاردکەی؟

- یێ گرتی.

ئەفسەری ب پێترانکیڤە گۆتێ: چ نە کرییە، ژبەر هندێ هاتییە گرتن.

- ناڤێ وی چییە؟

- عەبدلا نەجم.

- پرسيارا بنگەهەكێ دى بكە.

لەميايێ هەست پێكر كو حيلەكا لێ دهێتە كرن . باوەرييەكا موكم بو چێبوو كو عەبدلاى گوننەهەكا كرى و نە گوتيێ .. بەردا گرييێ و گۆت: من دڤێت ببينم.

سەرو چاڤێن ئەفسەرى تێكچوون.

لەميايێ ژێ داخوازكر: من دڤێت بو ماوێ دوو دەقيقا بتنێ ببينم.

ئەفسەرى زەنگلەك لێدا , پوليسەكێ روى چرمسى ئێكسەر هاتە ژوور, ئەفسەرى لێ حەيتاند: ما تو يێ نڤستى بوى؟! .. ما من نە گۆتييە تە ژبەر دەرگەهى نەلڤى و دوور نەكەڤى؟ .. ڤێ ژنكێ ژڤێرە دەربێخە.

پوليسى دبەرسڤێدا گۆت: ئەمرێ تەيە ئەزبەنى.

ئەوێ پوليس ملێ لەميايێ گرت و برە وێ نافليوانكا فرەها ب تەڤاڤى ژ مرۆڤان يا ڤالا , لەميايێ ڤێژى يێن زەلامەكى بهيستن , وەكو نالنالەكا دبن لێڤلێڤكانڤە بوو, بێگومانە كو يێ دقوتن , وەسا هزركر كو دەنگێ عەبدلايە , لەواى رەجفى و هێشتا ملێ لەميايێ ددەستێ پوليسيدا بوو, دەمێ هيڤى ژێ كرين: من دڤێت زەلامێ خوە ببينم.

- ما چ گۆتييە تە؟

- گۆتى .. ل بنگەهەكێ دى يێ پوليسان بگەرييێ.

پوليسى تبلێن خوە لسەر گوشتێ ملێ وێ گڤاشتن , گوشتەكێ تەڕ و تژى بوو, گۆتێ: ياب عاقل بە و ل بنگەهەكێ دى , لێ بگەرييێ.

پێ خوە بلندكر, هەولدا كو بكەتە دناڤ لنگێن وێدا , لێ لەميا ڤەزڤڕى و چاڤێن پوليسى زيقبوون , لەميا ژمليڤە راكێشاو دانا سەر كورسيكەكا دارى يا درێژ.. ب رەخ ديواريڤە , پاشى روونشتە بەر تەنشتا وێ و دەستێ خوە ژملى ڤەكر و گۆتێ:

- زەلامێ تە چ كار دكەت؟

- ل كارگەها رستن و چنينێ كار دكەت.

پوليسى دەستێ خوە كرە دكوشا وێدا و ب دەنگەكێ پر لەرزينڤە گۆتێ: تە نەزانييە كا ل كيڤەيە؟

- نە ...

تبلێن خوە دانانە سەر گوشتێ رەهنێن وێ و قورنجيكەك لێدا , ب ددانێن خوە لێڤا خوەيا خوارێ گەزت و هێدى گۆتێ "ئاخ .." دڤيا ڕابيت لێ دەستێن پوليسى رەهنێن وێ گرت بوون و نەهێلا ژبەر تەنشتا وى رابيت , لەميا كەفتە دترسەكا دژواردا , پوليسى گۆتێ: من دڤێت هاريكاريا تە بكەم.

لێ ل وی دەمی دەرگەهێ ژوورەكێ ڤەبوو.. ناڤلیوانك مشتێ پولیس بوون, ئەو زەلامێ سەرتراشی ددەستادا بوو, های ژخوە نەبوو, ئێكسەر پولیسی دەستێ خوە ژ كوشا لەمیایێ راكر و راست رابوڤە, لەمیایێ ژی بلەز بازداو ژبنگەهی دەركەفت.

ئەو گەنجێ پرچ رەش لبەر دەرگەهێ بنگەهی یێ راوەستای بوو, دەمێ لەمیا دیتی بو گرنژی و جارەكا دی دا ب دویڤڤە.

لەمیا هێدی ب رێڤە دچوو, گەلەك دترسیاو یا وەستیای بوو, هاتە بیرێ كو ئەوەی سپیێدێ ژبلی چەند پارییەكا چ دی نەخوارییە, روییێ خوە ب كەفیكا خوە پاقژكر و دا رێ.

لەمیا نارینەك بوو ل ژیێ پێگەهشتنێ, دێمێ وێ یێ جوان, تەر, لەشێ وێ یێ تژی, عەبای نەدشیا كوباری و سەرنجراكێشییا وێ ڤەشێریت.

لەمیایێ دیت ئەو گەنج راوەستیاو دگەل دوو گەنجێن دی ئاخفت, هەرسێكا بەردا كەنیێ و ئێكی ژ وان تبلا خوە درێژكرە لەمیایێ, بێی كو لپشت خوە بزڤریت, لەمیایێ بلەز دا رێ.

پشتی ماوەیەكی هەست پێكر كو ئەوێ گەنج هێشتا یێ ب دویڤڤە, پاشی ب رەخڤە دچوو, چ نەما بوو ملێن وان ڤێك بكەڤن, پتر شەپرزە بوو, ب بەرێخودانەكا پر بێهنتەنگی و نەرازیبوون هێڤكرە گەنجی و ب لڤینەكا سەربەردای پێچە ژسەرچاڤێن خوە راكر, جاددە ب خەلكێ خوە و رۆژێڤە رەش دیتن.

ئەوێ گەنج گۆتێ: مەرهەبا..

بەرسڤ نەدا, لێ بلەزتر دا رێ, ئەوێ گەنج ژێ پرسی: تول بنگەهێن پولیسان چ دكەی؟

دەنگێ وی یێ مشتی دلوڤانی و نازكی بوو, هەست پێكر یا دخەندقیت و پێدڤی ب تشتەكێ رەقە كو خوە پێڤە بگریت. ب دەنگەكێ لەرزوكیڤە گۆتێ: تو بوچی دگەل من دئاخڤی؟ ئەز تە نانیاسم.

- ئەز تە دنیاسم.

- ئەز تە نانیاسم.

گەنج ب دلخوەشی كەنی و گۆتێ: ما ئەم پێكڤە ل گەرەكێ نە دژیاین؟

- تو درەوا دكەی, ئەز تە نانیاسم.

- تو ل بنگەهێن پولیسا چ دكەی؟

لەمیایێ خوە دیت بێی حەمدی خوە یا دبێژتێ: ئەز یال زەلامێ خوە دگەریێم .. یێ گرتی.

- ئەز حەسیدیێ ب مێریێ تە دبەم, چونكو ئێكا وەك تە جوان ژنا وییە .. بێی حەمدی خوە هەست ب مەزناهیێ كرو شەرم ژڤێ هەست پێكرنا خوەكر, گۆتێ: دگەل من نەئاخڤە , ژمن دویركەڤە.

- ژبلی مێریێ خوە, تە چەند زەلامێن دی نیاسینە؟

ب دەنگەكێ مشتی كەربڤە گۆتێ: ئەز ژنكەكا دەهمەن پاقژم.

رێکا خوه بادا و چوو دناڤ کولانکەکا نیڤ ڤالادا . ئەوێ گەنج گۆتێ: نەکە غار. ماتو نا وەستیێی؟

لەمیا راوەستیاو گۆتێ: ماتوشەرم ناکەی ب دویڤ ژنکا دکەڤی؟

دبەرسڤێدا گۆت: مادێ بوشەرمکەم.

گەلەك حەز دکر سەترەکێ لێبدەت . لێ رویێ وی یێ تەر و ئەو مویێ رەش بسەر ئەنیێدا دالەقاندی ، تشتەك دئینا بیرا وێ یێ جوان و مەشرەبخۆش و ب تەڤاقی ژیرکری بوو.

گۆتێ: ما تو قەبیل دکەی کەسەکێ بیانی ب دویڤ خوشکێن تەبکەڤیت.

- ئەز نە کەسەکێ بیانیمە.

ئەوێ گەنج دەستێ وێ گرت . هەولدا دەستێ خوە بکێشیت لێ تبلێن وی بهێز دەستێ وێ دگڤاشت ، لەمیایێ دەستێ خوە هێلا ددەستاندا ، دەمێ دیت کو ژنکەك و زەلامەك دگەل زارۆکەکێ پرچ زەر دبەررا بورین . هەردوویان ب دلخرابی و مایتێکرن هێڤ دکرە لەمیایێ و ئەوێ گەنج. لەمیایێ دبن لێڤلێڤکاڤە گۆتێ: دەستێ من بەردە.

- نا بەردەم.

- دێ کەمە ڤێژی و دێ خەلکی لدور تە خرڤەکەم.

- هەر چییا تە بڤێت بکە . ئەز حەز ژدەستێ تە دکەم ، یێ تەڕ و نەرمە.

- ژمن بگەڕە . من دڤێت ل زەلامێ خوە بگەریێم.

- ئەز ژی دگەل تە دێ لێ گەریێم.

دەستێ وێ راکێشا و وەلێکر کو بەردەوا میێ بدەتە رێڤە چوونا خوە . بێهنەکێ یابێدەنگبوو پاشی گۆتێ: ئەز هیڤی دکەم .. ژمن بگەریێ.

- ئەز دێ دەستێ تە بەردەم . ئەگەر تو رویێ خوە نیشا من بدەی.

- لەمیایێ پێچە ژسەر رویێ خوە راکر. ئەوێ گەنج گۆتێ: رویێ تە گەلەك یێ جوانە.

- دەستێ من بەردە.

ئەوێ گەنج کەنی وگۆتێ: ئەز بتنێ دژیم. مالا من گەلەك یانێزیکە ، وەرە پیچەکێ بێهنا خوە ڤەدە و پاشی دێ ل مێرێ تە گەرێیین.

- ئەز هیڤی دکەم .. بەلا خوە ژمن ڤەکە.

ئەوێ گەنج ب ئاوایەکێ نازك گۆتێ: دگەل من وەرە ، توب چ خسارەت نابی ، نە ترسە . ئەز نە رووڤیمە و ئەز تە ناخوم.

لەمیا و ئەوێ گەنج بلەز ب رێڤە دچوون . ژنشکەکێڤە ئەوێ گەنج ئیشارەتکرە دەرگەهەکێ ب رەنگێ کە سکەکێ تاری بویاغکری: ئەز بتنێ لڤێرە دژیم.

- بەلاخوە ژمن ڤەكە.

ئەوێ گەنج دەستێ وێ بنك دەرگەهێ كەسكڤە كێشاو لەمیایێ دەنگنەكر چونكو ل وی دەمی هندەك ژنك ب رەخ وانڤە دبورین.

- ئەزچ ناكەم، تە نا ئێشینم، من دڤێت بتنێ دگەل تە باخڤم، دێ وەكو خویشكا خوە سەرەدەریێ دگەل تەكەم.

ئەوێ گەنج كلیلەك ژ بەریكا خوە ئینا دەروكرە دكونا قفلا دەرگەهی را.

- من بەردە ئەگەر دێ كەمە قێژی.

- ئەز زەلامم، ئابرووچوون چ ئاكامێ لسەر سومعەتا من ناكەت.

دەرگەهـ ڤەكر، لەمیایێ گۆتێ: من بەردە، دبیت جیران مە ببینن.

- لەعنەت لسەر جیرانا بن.

دەرگەهـ لدویڤ خوە پێڤەدا، دەستێ وێ بەردا و گۆتێ: ما توب تشتەكی خوسارەت بوی؟

لەمیایێ سەحكرە دورماندۆری خوە، بەرسفكا مالێ باخچەیەكێ كەسك بوو، هندەك حەودكێن ئاخێ لێبوون، دارێن نارنج و ئاسمێن و لیمویان تێدا چاند بوون .. ل نیڤەكا بەرسفكێ بركەكا ئاڤێ یا ڤالا لێ بوو، عەردو دیوارێن بركێ گەلەك دسپی بوون، ئەوێ گەنج گۆتێ: ئەرێ مالا من یاب دلێ تەیە؟

لەمیایێ ب كزگریوكیڤە گۆتێ: بهێلە بچم، ئەز هیڤیا ژتە دكەم، من دڤێت ل زەلامێ خوە بگەریێم.

ئەوێ گەنج دەستێ وێ گرت و گۆتێ: وەرە سەحكە ژوورا من .. لەمیایێ خوە ڤەكێشاو ژجهـ نەلڤی، دەستێ وێ بەردا، هەردوو دەستێن خوە دناڤتەنگا وێ ئالاندن و پالدا هەتاكو ب دیواریڤە نای، گەلەك ب نازكی ناڤچاڤكا وێ ماچیكر و گۆتێ:

- تو دلبەرا منی.

گەلەك هەولدا خوە ژێ قورتالكەت، لێ دەستێن وی ب هێز ب لەشێ وێڤە دنوسیایی بوون .. نەهێلا قورتال ببیت، ب عێجزی گوتێ: ئەز نە دلبەراتە مە، ئەز ژنكەكا پاقژم.

گەلەك بەرهەنگاریكر، لێ پاشی، تەسلیمی هێزەكێ بوو.. هەلگرت و برە دژوورەكێڤە دانا سەر تەختەكی، چاڤێن خوە نقاندن و هێدی دگۆتێ: ژمن ڤەبە، بهێلە بچم.

ئەوێ گەنج دگۆتێ: نە ترسە.

لەمیایێ هەست پێكركو حەز دكەت بكەتە گری و بنڤیت، ب دەنگەكێ بلند دنالی.

- نەكە گری .. نەكە گری.

نالینا وێ زێدەتر لێهات، تو ل كیڤەیی عەبدلا؟ خوە دیت بتنێ و بێی حەمدی خوە، ب دلتەنگی یادبێژیت:

- راوەستە دێ کراسێ من درپێت.

- دێ درپینم.

لەمیا چاڤ نقاندی کەفتە سەر پشتا خوەو دبن گرانییا ئەوێ گەنجڤە یا هەرشی بوو, هەست پێکر کو ئێشانەك یا ل لەشێ وێ بەلاڤە دبیت. ئەوێ گەنج ب دەنگەکێ لەرزوکیڤە گۆتێ: تە کەنگی شوی کرییە؟

چ پەیڤ ژدەڤی دەرنەکەفتن, لێ گوهێ خوە ددا هەناسەیا وی, ئەو هەناسەیا رویێ وێ ب بێهن هەلکێشانێن گەرم و پرت پرت پێچای, هەست پێکر کو هەڤبەندییا وێ دگەل لەشی وێ پیچ پیچە یێ لاواز دبیت هەتاکو بویە بونەوەرەکێ دوژمن و بیانی ژ وێ, ب شکەستن هێڤ دکرێ, ئێشانا وێ زێدەتر لێهات, دبن لێڤلێڤکاڤە دگۆت: ئاخ .. ئاخ.

دەمێ هناڤێن وێ بەر ئاتاڤێ هندەك پالدانێن بلەزو نەجێکر بوین ژ شهێ و گەرماتییێ, د رەجفی. دهزرا وێدا زەلامەکێ خەندقاندی, پێن وی درەر و رویێ وی شین دلڤلڤی, هەناسەیا گەنجی ڤەمریا, هێدیتر و شەپرزەتر لێهات .. لێ دەستێن وی هەر لدور لەشێ وێ دئالاندی بوون.

ژنشکەکێڤە گوهـ ل ڤەکرن و گرتنا دەرگەهێ ژدەرڤە بوو, ب ترس چاڤێن خوە ڤەکرن و گۆتێ: ئەو کییە هات؟

ئەوی گەنج ژنەدل گۆتێ: نە ترسە .. هندەك هەڤالن.

ئەوێ گەنج خوە ژسەر قولپاند و ب رەخڤە درێژ بوو, هەولدا رابیت, لێ ئەوێ گەنج دەستێن خوە دانانە سەر ملێن وێ و جارەکا دی درێژکرەڤە. ل وی دەمی دوو گەنج هاتنە دژوورڤە, ماوەرکرن دکرن لەشێ وێ یێ سپی و رویس, لەمیایێ ژترس و ژشەرما چاڤێن خوە گرتن، هەر دوو گەنج نیاسین، ئەو بوون یێ گەنج لسەر رێکێ دگەل ئاخفتی، نەشیا بلڤیت .. ئەوێ گەنج خوە ژ سەر تەختی هاڤێت و چوو.

لەمیایێ گوهـ لێ دبوو، هەرسێ گەنجان پستە پستەك دکرو دکەنین، پاشی بهیست کو دەرگەهێ ژووریێ هاتە گرتن، گەنجەکێ دی هاتە سەر تەختی، ئێشانەکێ لەشێ وێ ئەشکەنجەددا، نەچار دبوو کو ناڤبەین ناڤبەین ڤێژییەکا هێدی ب راهێلیت.

پشتی بێهنەکێ دەرگەهـ هاتە قوتان و دەنگەکێ پر کەیف گازی دکر: ما تو نڤستی!؟

پشتی چەند دەقیقەکا دەرگەهـ هاتە ڤەکرن و پاشی هاتە گرتن و گوشتێ وێ دبن گەنجێ سیێڤە دهەرشی.

پاشی دەرگەهـ هاتە ڤەکرن و ئەو گەنجێ پرچ رەش زڤری و ب شەوق خوە دلەمیایێ وەرکر و گۆتێ: تو یا جوان و خۆشی.

بیرا لەمیایێ ل سەر شویا ژنکا هات دەمێ ژنکان ب سەرسورمایی هێڤ دکرنە لەشێ وێ یێ رویس، ئێشانا لەشێ وێ دەست پێکر، دبوو خۆشیەکا لسەر سەپاندی، نەدشیا رێ ل پەقین و وەرارا وێ بگریت، گەلەك حەز دکر هێشتا بهێتە ئێشاندن، لێ ماڤە متبۆی .. ئو چاڤگرتی.

* * *

## کێڤریشك دمشەنە

گورگەکێ دەڤ بخوین گەلەك حەز ژگوشتێ کێڤریشکان دکر. هەمی کێڤریشك خوار بوون ژبلی ئێکا فێلباز و بلەز دغاردانێدا. دەمێ گورگ ژنێچیرا وێ کێڤریشکێ بێ هیڤی بوی، رۆژەکێ ل نێزیك راوەستاو گۆتێ: هو کێڤریشکێ، تو چ دبێژی ئەگەر ئەم کومبونەکا تایبەت یا پێکهاتنێ بکەین.

کێڤریشك لسەر رەڤینێ بوو. گۆتێ: پێك بهێین؟! یا دیارە، بابەتێ پێکهاتنا مە، ژبلی گوشتێ من چ دی نینە .. هەما بێژە و سەرەکی نەبادە، تە چەوا دڤێت من بخوی، یێ کەلاندی یان قەلاندی یان ژی خاڤ

گورگی لێ ڤەگەراند: تویا چەوتی، چونکو نهو ئەز پتر گرنگیێ ددەمە بابەتێن گیانی، نەمازە پشتی من زانی کو چەوتییە گرنگیێ بتنێ ب ئاشکێ خوارنێ بدەین.

کێڤریشکێ ب پێترانکیڤە گۆتێ: ئەرێ تە دڤێت کونگرەکێ فیلوسوفی گرێدەین یان ژی تە دڤێت دانوستاندنێ بکەین و تو من قاییلکەی کو ببمە ئەندام دپارتییەکا دیارکریدا.

گورگێ لێ ڤەگەراند: پێتڤی ناکەت تڕانا بمن بکەی .. من لبەرە سوزێ بدەمە تە، کو چ چاران ب دویڤ تە نەکەڤم، ئەگەر ئەوا من بڤێت تو بکەی.

کێڤریشکێ گوتێ: ما تە چ دڤێت؟

گورگی گۆت: هندەك جاران ئەز هزرێ دبارێ دونیایێدا دکەم و خەمەکا مەزن من دگریت و من دئێشینیت، لەوا ئەز پێدڤی ئێکێمە بشێت خەما من ب رەڤینیت و کەیفا من بینیت، تو دکاری ڤی کارێ جوانمێرانە بکەی؟!

کێڤریشکێ ب شەهنازیڤە گۆتێ: ئەز کێڤریشکەکا بەهرەدارم، ئەگەر ئەو کێڤریشکێن تە خوارین نهو دساخ بانە، دا شیانێن من بینی کو ئەز دشێم یێن لبەر مرنێ ژی بکەنینم.

گورگێ لێ ڤەگەراند: کەواتە ئەم پێکهاتین، تو دێ من کەنینی و ئەز دێ ژ تە ڤەبم، چ هەولێن نێچیرکرن و خوارنا تە ناکەم. کێڤریشکێ گوت: تو دکاری ب باوەریڤە بێژی .. ئەم پێکهاتین.

گورگێ لێ ڤەگەراند: ما ئەم نەچینە دەستێن ئێك و دوو. دا دەربرینێ ژ ئنیەتێن خوەیێن ساخلەم بکەین.

کێڤریشکێ گۆتێ: نە .. نە، ب هزرامن د بەرژەوەندا گشتیدایە کو نهو ئەم تەوقەکرنێ پاشبێخین.

کێڤریشکێ بو گورگی خویاکر کو ب راستی کێڤریشکەکا بەهرەدارە، هەردەمێ گورگ خەمبار ببا، کێڤریشك دا کەنییا وی ئینیت هەروەکو چ جاران خەم لسەر گویا زەمین نەبوی.

رۆژەکێ ژ رۆژان، گورگ برسی بوو، هاتە جەم کێڤریشکێ و گۆتێ: گوهدە من، ئەڤرو ئەز گەلەك یێ ژگریێ خەریب بویم.

کێڤریشکێ لێ ڤەگەراند: ئەڤ خەریبی یا سەیر ژگریێ ژبەر چییە؟

گورگی گۆتێ: ئەز نزانم، دبیت ژبەر هندێ بیت چونکو ئەز یێ هەست ب گونەهبارییێ و پەشێمانییێ دکەم، چونکو من هژمارەکا زۆر ژ کێڤریشکان یا خوارێ.

کێڤریشکێ لێ ڤەگەراند: ئەگەر سەمەدێ تە ئەڤە بیت، بکە گری.

گورگی گۆتێ: ئەز نەشێم بگریم، ئەز یێ هاتیمە نك تە .. دا من ب گریا بێخی، ئەرێ تو دکاری حەزا من بجهـ بینی؟! کێڤریشکێ گۆتێ: هەلبەت ئەز دکارم رۆندکان وەکو بارانەکا بۆش ژچاڤێن تە ببارینم، ما تە ژبیرکرییە کو ئەز کێڤریشکەکا بەهرە دارم.

گورگی ب پێترانکیڤە ژێ پرسی: ئو .. ئەگەر تو نەشیای؟

کێڤریشکێ ب باوەریڤە گۆتێ: هینگی تە چ ڤیا وەل من بکە.

گورگی ب گەفڤە گۆتێ: هەڤرکیا من نەکە، ئەگەر تو نەشیای دبیت تە بخۆم.

کێڤریشك لەرزی و چاڤێن وێ ب کێلبێن گورگیڤە بونە پێسترك، لێ دسەر هندێ را گۆتێ: هندێ تو من ب ترسینی، تو ب سەرناکەڤی .. چونکو من باوەرییەکا موکم یا ب شیانێن خوە هەی.

گورگی ب بێهەداری گۆتێ: تە خوە ل چ گرتییە، هەولدە من ب گرینی.

کێڤریشکێ لێ ڤەگەراند: دێ چیرۆکەکێ بو تە بێژم کو ب سەعەتان تو بکەیە گری.

گورگێ گۆتێ: بێژە ئەز هەمی گوهم ..

کێڤریشکێ گۆت: ل دەمێ بوری ژن و مێرەك هەبوون، بتنێ زارۆکەکێ مینا شنەبای دهاڤینەکا گەرمداو وەك ئاگری درڤستانەکا ساردا دهەلات و دبرسقی ...

گورگی ئاخفتنا وی بری و ب باوشکڤە گۆتێ: من بێزار نەکە بڤێ ئاخفتنا وەك یا ئەدیبان.

کێڤریشکێ ب سەرسورماییڤە لێ ڤەگەراند: ئەدیب رەوشەنا ژیانا دونیایێنە و هەروەکو ئەز دبینم، تو ب بێ رێزگرتن بەحسێ وان دکەی.

گورگی ئاخینکەکا خەمگین راهێلاو گۆت: رۆژەکێ من ئەدیبەك خوار بوو.. بو چەندین رۆژان دەنگێ وی دزکێ مندا بلند دبوو. بەحسێ باشی یێن پێگریێ ب دۆزا جەماوەریێ دکر. زکئێشەکێ ئەز گرتم.. هند بوو بمرم. دێ ئاخفتنا خوە تەڤاڤکە لێ شیرەتا من بو تە کورتکە و بلا یا بێ خۆشخۆشك بیت.

کێڤریشکێ لێ ڤەگەراند: شیرەتا منژی بوتە. ئاخفتنا من نەبڕی دا هزرێن من تێك نەدەی. ئها ئەڤە من ژبیرکرکا من چ گۆت بوو. سەرێ چیروکێ چ بوو.

گورگی گۆتێ: دێ بیرا تە ئینم. تە بەحسێ ژن ومێرەکا دکر. زارۆکەك هەبوو..

کێڤریشکێ گۆت: ئەو زارۆك یێ بچووك بوو. دەمێ مەزن بوی دەسپێکر ئاخفت و پرسیارکرن. هەیڤ بوچی یاسپییە؟ گیا بوچی یێ کەسکە؟ ما دار ناوەستیێن هەردەم ژپیاڤەنە و دراوەستاینە؟ بوچی دەمێ کێتك سا دبینن.. دنەون؟ بوچی رۆژ ب شەڤێ نا هەلێت؟ دایکا وی پر ب دلوڤانی و ب شەهنازی لێ دنێری. هەولددا بەرسڤا پرسیارێن وی بدەت. لێ نە دکاری چونکو پتر پرسیار دهاتنەکرن .. بابێ ژی هەردەم یێ بێدەنگبوو. ب تۆرەییڤە ل زارۆکێ خوە دنێری. دایك دا سەرسورمایی بیت و دا بێژتێ: ما ئێك ژسترانێن چویچکا تورە دبیت؟ بابێ بەرسڤ نەددا. لێ پتر کەربێن وی ڤەدبوون و دا ناڤچاڤێن وی تێکچن. رۆژەکێ.. بابی زارۆکێ خوە هەلگرت و بەرەڤ دەرگەهی چوو. دایکێ گۆتێ: دێ کیڤە بەی؟!

بابێ گۆت: دێ بەمە خەستەخانێ.

دایکێ ب سەرسورماییڤە لێ ڤەگەراند: لێ نە یێ نەساخە.

بابێ گوه نەدایێ و ژمال دەرکەفت و زارۆکێ وی دەدەستا دا بوو. دەرگەهـ ب هێز ل پشت خوە دائێخست. پاش چەند دەمژمێرەکا. باب و زارۆکێ خوە ب هەڤرا زڤرینەڤە مال. جرفەك ب دایکێ کەفت و قێژییەکا کورتا پر ترس راهێلا. هورکرە بابێ و ملێن وی ب تبلێن خوە یێن رەق ولەرزوك گرتن و ب کەرب هژاندن. لێ دکرە قێژی: ماتو بابی؟!

ئەزا کوورە بووم.. ئەزا دین بووم.. چەوا ئەز یێ نەهەسیام کو تو حەژێ ناکەی.

بابی ب دەنگەکێ لسەر خوەو هێدی گۆتێ: چونکو ئەز حەژێ دکەم لەوا من وەلێکر.

دایکێ گۆت : هش بە. بەحسێ ئەڤینیێ نەکە.

بابێ ب دەنگەکێ پاشپێشکی گۆتێ: گوهدە گۆتنا من. ئەو کورێ منە و ئەز ژی وەکو تە حەژێ دکەم. لێ مادەم بەردەوام پرسیارا دکەت. بێگومانە کو دێ رۆژەك هێت و دێ پرسیارکەت: ئەم بوچی وەکو صا و بەرخکا دژین؟ ئو بوچی ئەم دهێلین ژیێ مە لبن پێلاڤێن خوەدانێن نانی و زیندانان بەرزە ببیت؟ ئەرێ باشترە تە کورەکێ بێ ئەزمان هەبیت. یان ژی یێ گورایی و تژی پیستێ وی کا؟ وەکو دایکەك هزرکە و پاشی بەرسڤێ بدە.

دایکێ هەردوو ملێن بابێ بەردان و ب سەوداسەری هزر دکر. پاشی دەملدەست خوە درازۆکێ خوە وەرکر و هەمبێزکر و دەڤێ وی یێ بچووك و مشتی خوین ماچیکر. ل بابێ زڤری و ب دوو چاڤێن پرسوپاسی هێڤ دکرێ. پاشی ژنشکەکێڤە بەردا گرییێ و گۆت: ئێدی نابێژتە من دادێ.

بابێ سەرێ خوە چەماند. لێ چاڤێن وی ب هشکاتی ما نە ل هیڤیا هاتنا زارۆکێ دووێ.

کێڤریشك بێدەنگبوو. ل گورگی دنێری دەمێ گۆتیێ: ئەرێ چیرۆکا تە ب دوماهی هات.

کێڤریشکێ سەرێ خو هەژاند و هەولدا برەڤیت. لێ دەمێ دیتی گورگی یا بەردایە گرییێ .. بلەز ئێمن بوو. دلێ وێ پێڤە ما و خوە نێزیککر داکو دلەك دلەکی وی بدەت. گورگی ب لڤینەکا بلەزو ژنشکاڤە گرت و ب دلخوەشی بەردا کەنیێ. کیڤریشکێ ب ترس گۆتێ: تە چییە؟ خونە تو دین بوی؟

گورگێ لێ ڤەگەراند: پرسیارا من بکە. کەسەك وەك من رێزێ ل پەیمانان ناگریت. دێ تە خۆم چونکو چیرۆکا تە یا پێکەنینێ بوو .. ئەوێ هەولدەت من بقوتیت. بەری من بقوتیت دێ وی قوتم. یێ پیلانا کوشتنا من بدانیت. بەری من بکوژیت دێ وی کوژم.

کێڤریشکێ ب دەنگەکێ نزم و لەرزوکیڤە گۆتێ: خوە بگرە. من چیرۆکەکا دی یا هەی. ئەگەر تو گوهدەیێ. بێگومانە کودێ تە گرینیت.

گورگی لێ ڤەگەراند: ئەڤە چ گۆتنە. ما تو نابینی. رۆژ بەرەڤ ئاڤابوونێیەو هەتا نهو هێشتا من خوارنا نیڤرو نە خوارییە.

کێڤریشکێ ب لێنێرینێن خاترخواستنێ هێڤ دکرە دەورو بەرێن خوەو پاشی گۆتە گورگی: ئەزا پەشێمانم. ب گەرمی داخوازا لێبورینێ دکەم. هلو من بخو. هیڤیدارم. گوشتێ من یێ کێم .. جهێ رەزامەندیا تە بیت.

گورگی سوپاسیا تورەیی و ئەدەبێ کێڤریشکێ کرو ب هێواشی و پر رێزگرتن دخوار. کو هەژی کێڤریشکەکا بەهرەدارە.

* * *

## مەلیك

- ترسناکی

مەلیکێ سەمیانێ مە هێڤ دکرە وی زەلامێ لاوازو زەعیفێ پشت چەمیای و گۆتێ: دبێژن تو ئەو زانایی یێ تە تشتەکێ نوی چێکری و تە دڤێت نیشا مە بدەی, کا تە چ هەیە بینە.

زەلامێ پیر ب دەنگەکێ هێواش و دلخۆشییەکا ڤەشارتیڤە گۆتێ: باشترین تشتێ من چێکری دێ نیشا سەمیانێ خوە دەم. هۆلەکا رەنگشین ژبەریکا خوە ئینا دەرێ و ب شانازیڤە گۆتێ: ئەڤە چێکریێ منە.

مەلیکی گۆتێ: ئەڤە چییە؟

پیرەمێری لێ ڤەگەراند: ئەڤە هۆلەکا مەتاتییا کاکلك ڤالایەو من ناڤێ وێ یێ کرییە تەپە.

مەلیکی ژێ پرسیارکر: مفایێ وێ چییە؟

پیرەمێری گۆت: من یا چێکری دا زارۆك یاریا پێ بکەن.

مەلیکی ئەنیا خوە کرە گرێ و ژێ پرسیارکر: دێ چەوا زارۆك یاریا پێ کەن؟

پیرەمێر پرب شانازی و فێلبازیڤە گرنژی و تەپە ب هێزل عەردیدا , چەندین جاران تەپە بلند بوو, کەفت, مینا چویچکەکا سەربەردای ژکەیفادا دفری .. زەلامەکێ ریه سپی رابو ژپیاڤە و ب دەنگەکێ ژکەربڤە گۆتێ: ئایین .. سەمیانێ من, ئایین یێ دمەترسییێدا.

پاشی تبلا خوە درێژکرە تەپێ و گۆت: شەیتان یێ دکاکلکا ڤێ تەپێدا ڤەشارتییە و ئەو یێ ڤێ تەپێ دلڤینیت.

دەملدەست دەنگێ وەزیرو هاریکارو ماقویلان بلند بوو, لەعنەت ل شەیتانی دباراندن, چاڤێن هەمیا مانە ب تەپێڤە, ئەو تەپە یا بێ لڤین لسەر عەردی راوەستای.

- زڤستان

چێکەرێن تەختا ژکارێ خوە مانگرت هەتاکو کرێ یاوان زێدەکەن, دەمێ ئەڤ خەبەرە گەهشتییە گوهێن مەلیکی, تورە نەبوو, لێ ب دلوڤانی گرنژی و پرسیارکر: ئەرێ تەختان ژ چ دروست دکەن؟!

گوتنێ: تەختا ژداری چێدکەن.

مەلیك جارەکا دی گرنژی و فەرماندا دارا کو ئێدی بەرهەمێ وان تەخت بن, لێ داران فەرمانا مەلیکی پشتگوه هاڤێت و چ پویتە پێ نەکر, مەلیك ژێ تورە بوو, دار حوکمکرن کو ژتێهنا بمرن. ئو دەمێ دیتی دار ژتێهنادا یێ لبەر مرنێ .. گەلەك کەیفا مەلیکی هات, لێ هەکو زڤستان هاتی کەیفا وی دۆم نەکر.

- زیندانێن ڤالا

شەرەفا هەڤدیتنا مەلیکێ سەمیان بو رێڤەبەرێ گشتیێ زیندانێن مەلیکی هات. ب دەنگەکێ پر ترس گوتێ کو زیندان یێن مشتی زیندانی بوین و ئێدی زیندان تێرا هەمیا ناکەن. ژێ خواست کو هندەك زیندانێن نوی ئاڤاکەن.

مەلیك تورە بوو. گۆتێ: تو چ دبێژی؟ ماتو نزانی کو ئاڤاکرنا زیندانێن نوی پێدڤی ب گەلەك مالی هەیە؟ ئوما تە ژبیرکرییە کو ئەو مالێ من هەی ئەگەر دبەرژەوەندیا گشتیا خەلکیدا نەبیت. نا بیت بهێتە خەرجکرن.

رێڤەبەرێ گشتی ب دەنگەکێ پرترس و دبن لێڤلێڤکاڤە گۆت: سەمیانێ من ....

لێ مەلیکی ئاخفتنا وی برِی و گۆتێ: هش بە.

رێڤەبەرێ گشتیێ زیندانێن مەلیکی بێدەنگبوو. هەمی خەلکێ میرگەهێ بێدەنگبوون. ب ترس مانە ل هیڤییێ کا دێ چ رویدەت.

مەلیکی گۆت: مەلیکێ باش، نابیت مالێ مللەتی خەرجکەت.

پاشی پرسیار ژ رێڤەبەرێ گشتیکر: ئەرێ هەر رۆژ زیندانی خوارنێ دخون؟

- جارەکێ بتنێ دخون.

ئو.. کی بهایێ خوارنا وان ددەت؟ هەلبەت مللەت. ئەڤە چەوتییە ددەرهەقێ مالێ مللەتیدا دهێتە کرن و پێدڤییە ئێکسەر چارەکەین.

فەرمانا مەلیکی هەر دەملدەست هاتە بجهـ ئینان و هەمی زیندانی هاتنە سێدارەدان و زیندانێن مەلیکی مانە ڤالا .. ژبو هندەك زیندانی یێن نوو.

- دەمێ هەژار سەرخۆش دبن

رۆژەکی مەلیك بێزار بوو. جلکێن هەژاران کرنە بەرخوەو دەرکەفتە ناڤ کولان و جاددەیێن باژێری هەتا گەهشتییە کولانکێن هەژار لێ دژین. ل وێرێ بویەرەکی سەرنجا وی ب نکخوڤە راکێشا. دیت کومەکا خەلکی یێ لدور زەلامەکێ جلك دریای و سەرخۆش. خرڤەبوینە و ئەو ژی ب راست و چەپاندا دهژیا و دگۆت: ئەز مەلیکم. هەرکەسەکێ تشتەك بڤێت بلا بهێت و داخوازکەت.

زەلامەکێ پیر ژ ئەوێ سەرخۆش نێزیك بوو. دەستێن وی لسەر زکی بوون و ب دەنگەکێ کزگریوکیڤە گۆتێ: ئەز دێ ژبرسادا مرم ومن چ نینە نانەکێ ژی پێ بکرم.

ئەوێ سەرخۆش کتەکا پێلاڤا خوە ئێخست و دا پیرەمێری و گۆتێ: فەرمو .. ئەڤە نیڤەکا میرگەها منە بو تە.

خەلکی هەمیا پێ کرە کەنی .

پشتی ژ بێزاری یا خوە قورتالبۆی, مەلیك زڤریڤە تەلارا. لێ .. بڕیارەك دا کو نا بیت ئێدی خەلکێ هەژار مەیێ ڤەخون.

- سەرکەفتن

رۆژکێ مەلیکی پێ زانی, کو گەنجینەیا وی ژ زێرو زیڤا یا کێمڤە دبیت .. خەمبار بوو, شیرەت ژ وەزیری خوە دخواستن, کا چ بکەت, وەزێری بێی هزرکرن .. ئێکسەر گۆتێ: دێ جزیەکا نوی لسەر خەلکی سەپینین.

ب رازیبون مەلیکی سەرێ خوە هەژاند و وەزیرێ خوە هەلبژارت کو ڤێ پێشنیازێ بجه بینیت. خویك وەرگر دگەل پولیسان ل باژێرو گوندان گەریان و خەلك نەچارکرن کو ڤێ خویکا نوو بدەنە مەلیکی و ئەوێ نەدەت ژی دا هێتە قوتان و رەزیلکرن و زیندانکرن.

رۆژ هاتن و بورین, خەلکی سەبر نەما و کەربا وان دپێڤاژوکەکا مەزندا پەقی و بەرەف تەلارا مەلیکی چوون, دەنگێ وان دژی زورداریێ بلند دبوو. دەمێ مەلیکی پێ زانی .. رێ دا شاندەکێ خۆپیشاندانێ کو ل دیدارا وی بەرهەڤ بن.

مەلیکی گەلەك ب گرنگی گوهداریا ئاخفتنا پرخەموکی یا شاندی, دەربارەی برس و زیندان و خویك و وەزیرێ ستەمکار دکر. مەلیکی سەرسورمایی یا خوە ژڤان تشتێن بوین نیشا شاندی ددا و ب دەنگەکێ نزم و پرشەرمین گۆت: ل رۆژا قیامەتێ دێ چەوا بەرسڤا خودێ دەم .. زولم ل مللەتێ من دهێتە کرن و ئەز پێ نزانم, ئەز ئەوێ من ژیانا خوە هەمی ژبو خزمەتکرنا بەلەنگاز و هەژار و هێتیم و بیژنان تەرخانکری؟!

مەلیك رابو ژپیاڤە, ب دەنگەکێ هشك بڕیاردا کو وەزیری ژ وەزارەتێ دەربێخیت و وەك سزا لسەر وی کارێن ستەمکاری یێن وی کرین و وەك رێزگرتن بو حەزو ڤیانا مللەتی هەمی مال و ملکەت و تەلارێن وی ژێ ستاندن و دەستەسەرکرن.

شاندێ خۆپیشاندایی یا ژ تەلارا مەلیکی دەرکەفت و ئەنجامێ ڤێ دانوستاندنێ بو خەلکی گۆتن.

گەلەك کەیفا خەلکی پێ هات ب دلخۆشی سوپاسیا مەلیکی کرن .. کو هەردەم هاریکارێ راستیێ و دادپەروەرییێیە.

لێ .. دسەرڤێ چەندێ را ژی رۆژا پاشتر ژی خویك وەرگر هەر دبەردەوام بوون ل مال و دکانا دگەریان و خویك دوەرگرتن.

*      *      *

## صه

### 1. مەلیکێ نوی

ژنشکەکێڤە مەلیکێ پیر کوخی و کەفتە عەردی. نەلڤ بوو.. یاوەرو وەزیرو پاسەوانێن وی ب ترس کرە قێژی و د هەواریێ چوون. دیتن یێ مری. ب گەرمی لسەر دنالین. لێ پشتی بێهنەکێ دەمێ پشت راست بوین کوییێ مری. ئێکسەر روندکێن وان هشکبوون و خەما وان ڤەرەڤی. ب دەنگەکێ نزم بەحسێ ستەم و نەزانین و ساویلکەیی و چڤێلییا مەلیکێ پیر یێ بوری دکرن. پرسیارا وان ئەو بوو کا ل گورەی داب نەرێتێن وەلاتی. کی دێ جهێ وی گریت. پشتی هەفت رۆژان. گەلەك کومێن زەلامان ل گورەپانا باژێری راوەستان. هەرئێکی ژوان دڤیا ببیتە مەلیك. ب شەپرزەیی هێڤ دکرە وێ کوترکا سپییا دقەفەسکەکا زێریندا زیندانکری. دلێن وان بلەزلێددان. نەمازە دەمێ دەرێ قەفەسکێ ڤەکری و کوتر فری.

کوتر ل ئاسمانەکێ شین دفری. وەکو کەفیکەکا راهەژوك خویا دکر.. پشتی دەمەکێ کورت دالەقیا خواریێ و دادا سەرملێ کابرایەکێ جلك دڕیای. هەر دەملدەست دەنگێن خوە نەرازیکرنێ بلند بوون. لێ هەرجارەکا کوتر فڕیبا دا زڤڕیت و دا دادەتە سەر ملێ وی زەلامێ جلك دڕیای.. ئەڤجا شارەزاییێ ئێکێ یێ وەلاتی داخویاکرن کو قەدەرێ دڤێت ئەڤجارە دگەل هەژاران یا مەرد بیت. لەوا رێ دا ئێك ژوان کو ببیتە مەلیك.

ئو هوسا نورەددین سەعاییدی. ئەوکەسێ هەژار. بو مەلیك. گەلەك کەیفا سەیێ وی ژی هات. ئەویێ بەری چەند رۆژان دا ژبرسا دا مریت. صەی ب ڕەوین فەرماندا کو چەنداتییەکا باش ژ گوشتێ تەڕ بو بینن. ئێکسەر ئەوا داخوازکری هاتە بەردەستا. دەمێ تێر بوی. باوشك هاتنێ و تەسلیمی نڤستنەکا کویر بوو.

## 2. هەڤپەیڤینەکا تێلەفزیونێ

بێژەر: ئەز دشێم، بێی مەزنکرن بێژم کو هەمی جەماوەر یێ ژنڤستنێ زرپەهرە، یێ ل هیڤیێ کو رەئیا هەوە لسەر هندەك پرسێن رامیاری یێن چارەنڤیسی بزانن.

صه: نه .. نه، ئەز نەچارم داخوازا لێبورینێ بکەم کو بەحسێ چ تشتێن هەڤبەندی ب سیاسەتێڤە هەبیت ناکەم.

بێژەر: ئو .. جەماوەر.

صه: باشترە جەماوەر نه نڤیت، داکو بەرهەم زێدەتر بیت و داچ دوژمن نەکارن هێرشێن تەعداکار بینه سەر وەلاتی.

بێژەر: ئەرێ ئەم دشێین بزانین کا ئەو چ ئەگەرن هەوە پالددەن کو لسەر پرسێن رامیاری نه ئاخڤن.

صه: ئەگەر من بەحسێ پرسێن رامیاری یێن وەلاتی کرن، دوژمێن وەلاتێ مه .. دێ زانن کا ئەم چ هزردکەین و ئەگەروان زانی کا ئەم هزرا چ دکەین دێ ب ساناهی شێن پیلانێن ب سەرداگرتنا وەلاتی گێرن، لەوا ژپێخەمەت بەرژەوەندا وەلاتی و مللەتی .. دێ یێ بێدەنگبم و فەرە هەمی هاوولاتی ژی دبێدەنگبن.

بێژەر: ژگوتنێن کەڤن دیارە کو نەئاخفتن زێرە، چەند بەرسڤەکا جوان بوو کو هەڤبەندییەکا موکم یاب کلتوریڤە هەی.

## 3. ژئاخفتنێن پسپورەکێ پەروەردەیی

"... ئەم پێش ناکەڤین هەتاکو چەوتی یێن خوە نەزانین و هەول نه دەین کولسەر زال ببین، پێدڤییە ئەم دانپێبدەین کو بەرنامێ مەیێ نهو یێ خواندنێ دژی پێشکەفتنێیە و گەلەك کێماسی یێن تێدا هەین، گروڤێ مەژی ئەوە کو ئەزمانێ صا وەکو ماددەیەکێ سەرەکی دڤی بەرنامەیدا ناهێتە خواندن ....."

## 4. ژئاخفتنا سەرکردەکێ لەشکەری

".. ئەگەر دوژمنێ مه دێ ب نویترین چەکێن پێشکەفتی شەرێ مه کەت، بێگومانە ئەم دێ ب سەرکەڤین و دێ دوژمنی شکێنین، نەمازە ئەگەر بزانین کادێ چەوا ب رێکەکا دروست ددان و کێلبێن تیژو ڕەوینێ بکارهینین ..."

### 5. دانەزانییەك ژ وەزارەتا پیشەسازیێ

وەك دەربڕین ژباوەرییەكا موكم ب مافێ مرۆڤی كو ژیانەكا ئازاد هەبیت، ئو ل دویڤ حەزا جەماوەرێ خەباتكەر .. وەزارەتا مە یا دەسپێكری كو نویترین كارگەهێن تایبەتمەند ب چێكرنا كوری یێن دەستكرد بینتە دوەلاتیدا و ب دلخۆشی وەزارەتا مە داكوكیێ لسەر هندێ دكەت كو پشتی دەمەكێ نێزیك ئەڤ كورییە دێ كەڤنە دبازاریدا.

یا لێیە بو هەركەسەكێ بڤێت كوریەكێ بوخوە بكڕیت، ئەڤجا ئەوێن بێ كوری بلا تەنا بنڤن.

### 6. رۆژانەیێن هوزانڤانەكێ تایبەتمەند ب غەزەلێ

"... دێ هوزانەكێ ڤەهینم ئەڤینی ژێ بباریت، ئو .. دێ تێدا بێژم كو دلبەرا من وەكو دێهلەكا سپی یا بچووك یا جوانە ..."

### 7. ژسەرگوتارا رۆژنامەكێ

"... كییە كەسێ باش؟ بەرسڤا ئێكانەیا دروست ئەڤەیە: كەسێ باش ئەو كەسە یێ هەردەم هەولددەت كو پێڤەگرێدانا وی ب ئاخا وەلاتێ ویڤە زێدەتر لێ بهێت، ئو ئەڤ پێڤەگرێدانا ژێگوتی بجە ناهێت هەتاكو مرۆڤ لسەر چوارا ب رێڤە نەچیت و هەمی بەرتێلێن ئیمپریالیزمێ ژبو ب رێڤە چوونا لسەر دوو پیا رەت نەكەتەڤە ..."

### 8. پەیڤینا هزرمەندەكی

" .. ئەز نهو یێ ب دانانا پەرتوكەكێڤە مژویلم، لسەر باشیێن كوریێ، ئو .. دێ دەمە خویاكرن كو فیلوسوفێ ئیستعماریێ ئەوێ دبێژنێ دیكارت یێ دسەرداچویی و نەباش بوو ژبو مرۆڤ یەتییێ، نەمازە دەمێ گۆتی: ئەز هزردكەم لەوا ئەز یێ هەیم، دێ دیاركەم كو ئەوا وی گۆتی .. یا ژ راستیێ دویرە و هیخوازێن راستیی ژبلی ڤێ گۆتنا ل خوارێ چ دی نابێژن: ئەز خودان كوریمە، لەوا ئەز یێ هەیم.

### 9. هەواڵەکێ گەلەك گرنگ

گەلەك شاندا .. کو نوینەرییا تەخێن جوداێن مللەتی دکەن شەرەفا هەڤدیتنا سەمیانێ مە ببەرکەفت, سەروکێن وان شاندا بەحسی ئازادییا کەرافتی یا لسەر دەمێ مەلیکێ بەرێ کرن, سەمیانێ مە گەلەك پێ داخبار بوو, داخبارییەکا نە هێتە پەسنکرن, فەرماندا کوهەر هاوولاتییەکی مافێ لەقدانێ و ڕەوینێ هەیە, ئەو لەقدان و ڕەوینا ب هێز ژلایێ یاسایێڤە هاتییە پەسندکرن.

### 10. خەوگەها وەلاتینیێ

ئەڤێن هەنە مرۆڤێن گویا زەمین لسەر چواران ب رێڤە دچن, ب دلخوەشی کوری یێن خوە دلەقینن, دڕەون و ڕەوینا وان نیشانا سەرکەفتنا مرۆڤییە لسەر هەمی ئەشکەنجەکارێن خوە.

* * *

## ئەرد بومەیە و ئاسمان بوفرڕندا

دبێژن لسەر دەورێ بەرێ دیمەشق شیرەك بوو .. لسەر هات بوو سەپاندن کو دکاڤلانێ خوەدا زیندانکری بیت, ئو زارۆکەك بوو ژبەر زنجیران نەدشیا پێنگاڤان پاڤێژیت, ئاسمینێن وێ ژی ب دزیکیڤە لسەر گوڕستانان شین دبوون و رەشترین جلك دبەربوون, دەمێ دوژمنێن وێ .. سەروبەرێ وێ زانی, لەشکەرێن وان چوونێ و ل دوماندۆری شویرهێن وێ شویرهەك ژبکوژێن نڤستنێ نەزانن ئاڤاکر, تەنگەزاری و ترس و بێزاری ل دیمەشقێ بەلاڤ بوو, خەلکێ وێ تێك هاتنوچوون .. ل دور تەلارا مەلیکێ خوە ب گازی یێن شەلەژان و هەوارکی خرڤەبون, مەلیك ژ پەنجەرەکا تەلارا خوە هاتە پێش و ب دەنگەکێ هشك گۆتێ: بەس ڤێژ ڤیژێ بکەن. ئەڤە چ زڕین و نیقە نیقە نیقەە؟ ماوە ژبیرکر کو وەلاتێ دمەترسیێدا؟ وە چ دڤێت؟

خەلکی کرە هەوار: مە چەك دڤێت.

مەلیکی لێ ڤەگەراند: ما دێ چ ل چەکی کەن؟ دێ دشەڕێن خوەدا بکار ئینن؟

مە دڤێت شەڕی بکەین.

دێ شەڕی کەین.

دێ بەرەڤانیێ ژوەلاتێ خوەکەین.

مەلیکی گۆت: شەرکارێ سەربازانە. شەڕی بهێلن بو خودانێن شەڕی و ژبیرنەکەن کو شویرهێن مە دبلندن و دێ مە ژ دوژمنان پارێزن و دێ پیلانێن وان شکێنن. ئەڤجا بزڤرنەڤە دوکان و مالێن خوە و ل دویڤ رزقێ خوە بگەرێن. ئو هەرکەسێ گۆتگۆتك و درەوا بەلاڤکەت. سیخورێن دوژمنانە و ژسزای قورتال نابن. لەشکەرێ وەیێ زیرەك دێ ب ئەرکێ خوە رابیت و دێ دوژمنان شکێنیت و دێ دەرسەکێ دەنێ کو چ جاران ژبیرنەکەن.

لەشکەرێ مەلیکی و یاوەر و شیرەتکار و وەزیرێن وی گەلەك ب گەرمی و سەرسورمایی دەست قوتان و خەلك ب ساری ل جهێن خوەیێن راوەستای بوون. بوغومین و خەموکی و کەربوکین لسەر دزال بوون.

هەر ل وی دەمێ مەلیك ژبەر پەنجەرێ زڤریەڤە دتەلارا خوەڤە. خەلکی جارەکا دی گازی دکر: مە چەك دڤێت .. مە چەك دڤێت.

لەشکەرێ مەلیکی شیرێن خوە رویسکرن و هورکرنێ. یێ کوشتی کوشت و یێ گرتی گرت و یێ رەڤی ژی رەڤی.

دەمێ بێدەنگیێ دادای. مەلیکی رێ دا پیرەمێرەکی بهێتە نك. گۆتێ: دبێژن تە چەکەکێ چێکری .. دشێت دیمەشقێ ژ دوژمنێن وێ قورتالکەت. ئەرێ ئەڤ گۆتنە راستە؟

ئەوێ پیرەمێر گۆتێ: سەمیانێ من. من هەمی ژیێ خوە یێ بو زانستی تەرخانکری. ئو چونکو دیمەشق باژێرێ منە و من چ ژێ خوشتر نەڤێن. ئەڤروکە یاکەفتییە دبن گەفێن داگیرکرنێ و وێرانکرنێدا. ئەڤجا من چەکەکێ چێکری دێ دوژمنی شکینیت و شکەستنەکا دژوار دێ ڤێ ئێخیت.

مەلیکی ب پویتەپێکرنڤە گۆت: ئەو چ چەکە .. بێژە؟

پیرەمێرێ زانا گۆت: چەکێ من .. ناڤێ وی فرۆکەیە. فرۆکە ژی ئامیرەکێ ڤالایە ژ مەعدەنی یا چێکرییە و دوو شاپەرێن هەین. هەروەکو ئەلهۆیان ل ئاسمانا دفڕیت. سەرباز دکارت لێ سوار بیت و ل هنداڤ سەرێ دوژمنی بفڕیت و دربێن وێرانکەر لێ ببارینیت و چ ل وی نەهێت.

مەلیکی گۆت: ئوتە بهایێ چەکێ خوە چەند دڤێت؟

زانای گۆت: نە وەکو چەکێ من هەنە و نە دهێتە بەر بازارکرنێ ژی.

مەلیك تێکچوو. ب دەنگەکێ هشك گۆتێ: بێ چەپو چویر .. بێژە تە چ دڤێت. ئەوێن دهێنە نك من ئەز باش دنیاسم. چ ددلیدا نینە ژبلی دەست بسەر داگرتنا گەنجینە یێن من.

زانای گۆت: من مال وسامان ئەڤێت.

مەلیکی ژکەربڤە پرسیارکر: یا تە چ دڤێت؟ تە تانجێ سەرێ من دڤێت؟

زانای گۆت: ئەڤە ئەز چەکێ خوە بێ بەرامبەر پێشکێش دکەم. هەمی ئەوا من دڤێت. دیمەشقێ ژ دوژمنێن وێ قورتالکەم.

مەلیك ب خوەشی کەنی دگۆتە وەزیرو شیرەتکارو یاوەرێن دورماندوری خوە: هوین چ دبێژن بوڤێ ئەوا وە گوهـ لێ بوی؟

زەلامەکێ ریهدرێژ ئاخفت و ب دەنگەکێ مشتی ترس گۆتێ: کوفرو ئیلحادە ئەگەر مرۆڤ چاڤلێکرنا چێکرنا خودێ بکەت و دگەل حەزا وی یێ تێڤەل بیت.

بالندە دفرن چونکو خودێ یێن داین کو بفرن و ژبەر هندێ دوو شاپەرێن پێڤە چیکرین. لێ دڤێت مرۆڤ نەفرِیت. ئاسمان بو ملیاکەتا و فرِندانە. خودێ مرۆڤ ژی یێ دای دا لسەر عەردی بیت و دڤێت هەتا رۆژا قیامەتێ هەر لسەر عەردی بیت. ئەگەر خودێ ڤیا با مرۆڤ بگەهتە ئاسمانان .. دا دوو شاپەران پێڤە چێکەت.

ئەوێ ب ریهـ تبلا خوە یا لەرزوکی ژکەربڤە درێژکرە زانای وگۆت: ئەڤێ هە نە زانایە. شەیتانەکێ کراسگوهورییە. دڤێت مە دسەردا ببەت و مە ژ ئایینێ مە دویربێخیت.

زانای گۆت: لێ خودێ ئەو ئاقل یێ دایە من کو شیای فرۆکێ چێکەت.

ئەوێ ب ریهـ چ پویتە ب ئاخفتنێن زانای نەکرن. لدورخوە زڤرِی و ژجڤاتێ پرسیارکر: ئەگەر شەیتانی هاریکاریا مەکر و مە دۆژمن شکاند. مانە رامانا وێ ئەوە کو مە دونیا گرت و ئایین بەردا. ئەرێ ما ئێك ژمە هەیە نە ییا خوە ژ ئایینی بکەت و ڤێ دونیا یا بو کەسێ نەمای و نا مینیت لسەر ئایینی ب جێترینیت.

دەنگل دژی دونیا یا بوکەسێ نەمای بلند بون.

سەرلەشکەری گۆت: باپیرێن مە و باپیرێن باپیرێن مە. هەروەکو هوین هەمی درانن. چەندین شەرِ یێن کرین و تێدا بسەرکەفتینە. چەکێ وان ژی بتنێ شیرو سنجێ باش بوو. سنجێ مە .. ڤێ چەکێ نوو قەبیل ناکەت. چونکو غەدرەکا نە هەژییە و یا ڤالایە ژ زەلامینیێ و جوانمێرییێ و دژی عەدەت و دابونەریتێن مەیە. ما دێ چ ژمە مینیت .. ئەگەر مە دابونەریتێن خوە ژدەستدان؟ ئەگەر مە بڤێت ئەم بمینین و دبەردەوام بین .. فەرە پاراستنا میراتێ خوە بکەین و لدویڤ شوپا وی بچین.

دەنگبلند بوون کو فەرە شەرِەکێ پاقژێ ب سنجێ باپیرانڤە گرێدای بهێتەکرن.

زانای کرە قێژی: ئەڤە چ ئاخفتنە؟ دابونەریت چ دۆژمنا ناشکێنن.

وەزیرەکی گۆت: دبیت پیلانەکا پیس بیت لسەر وەلاتێ مە دهێتەکرن. ئەرێ ما یا بەرئاقلە کو مرۆڤەك چەکەکێ هوسا ترسناك چێکەت و پاشی بدەتە خویاکرن کو وی چ بهایێن ماددی ل بەرامبەری ڤی چەکی نەڤێن؟!

وەزیرەکێ دی ئاخفت وگۆت: من گوهـ لێبوو ئەف چەکێ نوو دێ شکەستنێ ئێختە دناڤ دوژمنادا، ئەڤە ژی وە نینە , ئەو مروڤێ چەکدار ب بهایێن پاقژ و سنجێ باش ئەوە دۆژمنا دشکێنیت .. نە چەکە.

وەزیرێ سیێ گۆت: ئەم نە پێدڤی چەکێن نوینە، مە شویرهێن بلند هەنە و هەر کەسێ بەحسێ دوژمنان و مەترسیا وان بکەت، ژبلی کێمکرنا گیانێ مەعنەوی و خزمەتکرنا دوژمنان چ مەرەمێن دی پێ نینن.

سەروکێ پولیسان گۆت: ئەز وە ئاگەهدار دکەم , کو ئەو فرۆکا ل هنداڤ سەرێ دوژمنان دفریت ,

هەروەسا ل هنداڤ تەلارا سەمیانێ مەیێ مەلیك ژی دفریت.

مەلیکی ب دەستی ئیشارەتککر. ئێکسەر هەمی بێدەنگبوون , مەلیکی ب ئەنی گرێیی بودەمەکی هزرا خوەکر. پاشی پرسیار ژزانای کرو گۆتیێ: فرۆکەیا تە ل کیڤەیە؟

زانای گۆت: یا لسەر بانێ مالا من.

مەلیکی فەرماندا کو زانای و مالا وی و فرۆکا وی ب سوژن , گرنژینەکا مشتی بێزاری و تولڤەکرن و خەم لسەر لێڤێن زانای هاتە نەخشاندن.

هەر دەملدەست فەرمانا مەلیکی بجهـ هات و دەمێ ئاگری مال و زانا و فرۆکە داعویراین , یاوەرێن مەلیکی ژکەیف دکرە هەوار.. لێ دەمێ دۆژمن شیای دسەر شویرهێن بلند را خوە ب کیسینیتە ددیمە شقێدا , هەوارێن وان دگەوریێ را مان.

خەلك و کولان و خانی کرنە کاڤل ..

پشتی هینگی ئاسمین ژ خولیێ شین بوون و بونە رۆژەکا سپی.

* * *

# کوشتن

(1)

ئەز چومە دناڤ باغەکێ رویسدا و ل وێرێ من دلبەرا خوە یا نڤستی دیت , من گۆتیێ: هشیار بە , دەمێ مە هات بزڤرینەڤە مال , ئەگەر مە دیت یێ وێرانبۆی .. ل شوینا وی دێ خانیەکێ ب بەرێن سپی ئاڤاکەم و دێ ل دورا گولێن سور و زەر چینم.

ئو من گۆتیێ: دێ دەرگەهێ میرگەها خەویێ ب دەستێ خازوکەکی قوتم.

ئو من گۆتیێ: ئەز وەغەرێ ناکەم و دێ خوە لتە گرم.

گۆتنه من كو دلبەرا من یامرییه و نه یا نڤستییه, من ب ترسڤه پرسیاركر: چەوا مر؟

گۆتنه من: یا هاتییه كوشتن.

من ب ترسكا زێدەتر ژێ پرسیاركر: كێ كوشتییه؟

گۆتن: ته یا كوشتی.

من خوه دلەشێ دلبەرا خوەدا ڤەشارت و من چاڤێن خوه گرتن و ئەز تەسلیمی نڤستنەكا پر ئارا مبووم.

نڤستنا من رۆژەكێ یان سالەكێ یان سەد سالان ڤەكێشا و پاشی ئەز لسەر دەنگەكێ ستوور هشیار بووم, دگۆته من: خوه دوور بكه, گورێ وێ یێ هاتییه كولان و ئەڤه دەمێ ڤەشارتنا وێیه.

من ب هەواركی گازی دلبەرا خوەكر. لێ یا نەلڤ بوو, ل وی دەمێ ئەز ب گوشتێ وێ یێ سارڤه, من بیرا چویچكا سپی یا بچووك دكر, رۆژەكێ من دیتبوو.. ژكەیفا تیرۆژكێن رۆژێ, ژتایەكی دچوو تایەكێ دی, لێ چویچك مر.. تاك مرن ..

ئو.. رۆژ ژی مر.

(2)

هندەك زەلامێن بیانی لدویڤ من دگەریێن, ئەز خوه دلەشێ دلبەرا خوەدا ڤەدشێرم, لێ زەلام بلەزو دلرەق و پر ژكەربڤه دهێن و دەرێ ژوورا دلبەرا من ڤەدكەن و لمن دگەریێن, نەشێن من ببینن, سەروچاڤێن وان تێك دچن, لسەر چوونێنه, لێ ئێك ژوان دبێژته دلبەرا من: جلكێن خوه بێخه.

ب سەرسورمایی دبێژتێ: شەرم بكه.

ب ئارامیەكا هشك لێ ڤەگەراند: دڤێت ب هویری لێ بگەریێن.

دلبەرا من ژنەدل جلكێن خوه دئێخیت و ب لەشەكێ رویس ل هەمبەر رادوەستیت, زەلام دەست دكەته گوشتێ وێ, پاشی ب لڤینەكا هۆڤانه یا ژنشكاڤه دئێخته عەردی و من گوه لێیه ب ترس هەناسه دكەت و ب دەنگەكێ نزم دبێژتێ: تو من دئێشینی. زەلام پتر ب ناڤ لەشێ وێدا دچیت ومن دبینیت, چ سەرسورمایی ناگریت, لێ ب دەنگەكێ رەق و فەرماندەیی دبێژته من:

- دەركەڤه ئەگەر دێ ته گولله بارانكەین.

ئەز گوهداریا وی دكەم .. لێ هەر لمن دگەریێت و پاشی زەلامێن دی ژی ددویڤدا لمن دگەریێن, ئەز ب نەرازیبوون لێ دكەمه ڤێژی, ژمن دخوازن كو بێ دەنگبم, ئەز گوهداریا وان دكەم و ب دوو چاڤێن مری دبینم كا چ دبیت.

(3)

دلبەرا من .. ئەوا لسەر تەختێ من رازای, گولا سپییە, دەنگێ وێ .. ئەوێ ئاڤ ب کەیفخۆشی لناڤ زەڤییێن کەسك دکەتە غار.

گۆت: نهو ئەز ماسیمە.

گۆت: ئەز حەز دکەم چیروکەکا ئەڤینیێ بخوینم.

گۆت: من دایبابێن خوە نەڤێن.

گۆت: من دایبابێن خوە دڤێن.

گۆت: ئەز حەز ژکەسێ ناکەم.

دەمێ شەڤ هاتی, ئەز ب دلوڤانیا خویشکەکێ هەمبێزکرم و روی یێن من ماچیکرن زڤریڤە مالبابا خوە, تەخت ما ڤالا, من هەست ب ترسیانێ کر, من خوە دبن لحێفکێڤە ڤەشارت و من هەولدا بنڤم, لێ سیکارەکا دەڤ تیژ هات و تبلێن من .. دەستێن من ژێڤەکرن, ئەز گریام و من گۆت: ئەز نەکارم ئێدی دەستێ خوە بکەمە پشیکەکێ.

من ب دوو چاڤێن ڤەکری و ب کەرب و دلوڤانیێ بارکری هێڤ دکرە خوینا خوە یا بەرە بەرە درژییێت, هەتا کو ئەز سار و ڤالا ژخوینبەران هێلایم.

* * *

# جەنگیزخان

دەمێ جەنگیزخان بوی، سەرێ وی ل هیڤیا تانجەکێ زێری نەبوو، بابێ وی هەژاربوو، کەسێ پویتە پێ نەدکر و رێز لێ نە دگرت. دایکا وی پیرەژنەکا چاڤ خەمگین بوو، چ جاران ژدل نەکەنییە.

جەنگیزخانی زارۆکینییا خوە ل کولانا بوراند، ب تەڤنێ و بەرا یاری دکرن، لێ دەمێ بویە گەنج، کرنە مەلیك چونکو گەلەك برسی ببوو، ئەڤینی یا وی یا مینا کەنیا زارۆکی ژبو هۆزانێ نە شکەست،

هەردەم دەڤ ب گرنژین بوو.. هەرچەندە جارجارە حەزا گریانێ بێ ئەگەر خوە لسەری ددا.

جەنگیزخانی کچکەکا تورین هەلبژارت کو ببیتە دایکا وان زارۆکێن هێژ نەهاتین. ئو دەمێ ل شەڤەکێ ژ شەڤان لەشێن وان بو جارا ئێکێ ڤێککەفتین، تورینێ خوە پێڤە شداند و ئەوی ژی ب هێز شداندە بنك خۆڤە، جەنگیزخانی هەستپێکر کو لەشێ وێ گیانەوەرەکە هزاران دەڤ و ددان و کێلب هەنە.

ل سپێدێ جەنگیزخان ژ ژوورا خوە دەرکەفت، یێ دێم بوغومی و تورین ژی لسەر تەختی یا درێژکری بوو، خەنجەرەکا دەڤ درێژ دسینگێ وێ را بوو، جەنگیزخان بو ماوەیێ چەندین رۆژان یێ خەموکی و بێدەنگبوو. مینا هەلامەتەکێ رەشێ بێ سەر دتەلارا خوەڤە دگەریا، یاوەر و وەزیرێن وی ژی ب دلتەنگی و حەیرینڤە لێ دنێرین، دفێربوون کو خوە بو حەزێن حاکمێ خوە ب چەمینن، ئەو حاکمێ وان بخو بو خوە هەلبژارتی.

رۆژەکێ جەنگیزخان دناڤ وەزیرو یاوەرێن خوە دا یێ راوەستای بوو، مینا دارەکا ژئاخێ هەلکێشای و دبوشاییێدا چێگرکری بوو، فەرمان دانە سەرلەشکەرێن خوە کو بەرەڤ جیهانێ بچن و هەر ئاڤاهی و باژێرەکێ لسەر روییێ عەردی هەبیت وێران بکەن.

باژێرەکێ بچووك هەبوو، بێ شویرهە بوو ، خەلکێ وێ ئولدار بوون، باوەری هەبوو کو خودێ ل هەمی جهان هەیە و هژمارەکا زۆر ژفریشتەیان ئافراندینە، ئو فریشتە ژی ژئاگرینە و پەرێن سپی یێن پێڤە،

خەلك ب چاڤان نابينن. هەر كەسەكێ ساخ .. يێ دبن چاڤدێرييا دوو فريشتەيانڤە .. باشى و خرابى يێن وى تومار دكەن. دەمێ مرۆڤ دمريت. باشى و خرابيا دكەنە دهەر دوو لايێن تەرازيێدا و ئەو لايێ بلند دبيت بەرێ مرۆڤێ ددەتە دۆزەخێ يان ژى بەهەشتێ. ئو دۆزەخ ژى ئاگرێ سوتنێيە .. مرۆڤى بێ مرن ئەشكەنجە ددەت. بەهەشت ژى جهەكێ جوان و مشتى دارێن كەسك و ژنكێن جوان و رووبارێن هنگڤين و مەيێ و يێن شيرييە. خەلكێ وى باژێركى گەلەك حەز ژنارگيلا دكر. ئو دەمێ دەستێ ئێكى ژوان دگەهشتە نارگيلەكێ .. گەلەك كەيفا وان دهات و هەست ب خۆشيێ دكر.

ل ترومبێلا سوار دبوون. چونكو هێشتا هەسپ نەديت بوون. هەسپ ژى دكويڤى بوون ول چولا دگەريان.

بو لەشكەرێن خەنگيزخانى يا ب زەحمەت نەبوو هێرش كەنە ڤى باژێركى و بگرن. چەند هزاركەسەك كوشتن. جەنگيزخانى ب مجدى هێڤ دكرە وان جەندەكێن سێدارەداى .. هەروەكو ستێرێن گەشن .. دبرسقن.

ل مالان گەريان و زارۆك خرڤەكرن. لسەر لێڤا رووبارەكى ڤەكوشتن و رەنگێ ئاڤا رووبارى هاتە گوهارتن.

چەند هەيڤەكێن پر هەراو هاوار وكەيف بورين .. پاشى بەرە بەرە بێدەنگيێ خوە ب سەردادا و خەلكێ وى باژێركى ڤەگەريانەڤە سەر ئەڤينييا خوە يا بەرێ ژبو نارگيلا و سوحبەتێن هەتكبەرييا خەلكى و هەبونا خودێ يێ ل هەمى جهان.

بێزاريێ دەسپێكر .. دناڤ گوشتێ جەنگيزخانيدا چوخوار .. هەروەكو ئێشەكا ب ترس و نەديار. ڤێ بێزاريێ وەلێ كر كو رۆژەكێ تانج و جلكێن خوە بێخيت و ب هندەك جلكێن دى دناڤ باژێريدا بگەريێت. وەكو مارەكێ ژانددانێ ل گوشتەكى دگەريێت. دا ڤێ بكەڤيت. پشتى وەستيا چوو دچايخانەكێڤە. يا مشتى گەنج وسێلە بوو. فنجانەكا قەهوێ داخوازكر. ل قولاچەكێ ژقولاچێن چايخانێ سترانەك ژسندوقەكا سترانا بلند دبوو.

جەنگيزخانى قەهوە يا خوە ڤەدخوار و جگارا خوە دكێشا. ل وى دەمێ سترانبێژێ زەلام ب دەنگەكێ ستووريێ بريندار دنالى. **گەر من ب هێلى .. ئەز دێ مرم**

جەنگيزخانى قەمبەلە ژ دويكێلا جگارا خوە بەردان. هزرا كچكەكا جوان دكر. ل نێزيكى خوە .. يێ خوە دگەل سەليقا مەزيقا گەرم دهژاند و هەردوو دەستێن وێ كەفتبونە سەر روويێ مێزا ئاسنى. دبچووك بوون و گەلەك دسپى بوون. جەنگيزخانى هێڤ دكرە دەستێن خوەيێن زڤرو مەزن. پەشێمانييەكا نەديار لناڤ خوينا وى بارى. گەلەك ژبهيستنا وان هۆزانان يێ خەريب بوو .. ئەوێن دەنگەكێ ستووريێ دگەوريێ راماى دگۆتن.

هەستپێکر کو دلێ وی چیچکەکا بێ پەرە , حەز دکەت ب فڕیتە وێ مالا ئەو لێ ژدایکبۆی , مالەك بوو, دیوارێن وێ ئاخ بوون و دارنارنجەك دحەوشێدا بوو. جەنگیزخانی ئاخینکەکا ژدل راهێلا و هەستپێکر کو بەرەبەرە لێهمشتەکا ژ خوینا زارۆکان یا ژێ دویر دکەڤیت و جەندەکێن خەلکێ سێدارەدای ژمەژییێ وی دەرکەفتن.

ژچایخانێ دەرکەفت و یێ مجد بوو کو جەنگیزخانێ خوینرێژ ب دوماهی مر و ل جهەکێ نە نیاسێ دویر هاتە ڤەشارتن , لەشکەرێن وی ژی .. هندی خوە ل هیڤییێ بگرن دێ یا ژخوە بیت.

لەشکەرێن وی چاڤەرێ بوون , گەلەك لێگەریان , لێ وی ب شارەزایی خوە ڤەشارت بوو, کەسەك ڤێ نەکەفت , ل دوماهیێ .. نەچاربوون بارکرن. دەمێ توز ژ دوماهییا وان بلند بوو.. جەنگیزخانی ب دلخۆشی سەح دکرێ.

خوە بەردا سەر جاددا هەروەکو زارۆکەکە بەری بێهنەکێ ژدایکبۆی , د رۆژێن بهێندا دێ بیتە کەسەکێ نەنیاس , دێ ل باژێرکەکێ بچووك ژیت و دێ بو خوە کارەکی بینیت و ل ئێڤاریا دێ هوزانان خوینیت , دێ خەونان بینیت و دێ ئەڤینیێ دگەل کچکەکێ کەت .. وەکو زارۆکەکا مەزن بیت , حەز ژ هاڤینێ و ئاسمینان بکەت , دێ لەشێ وێ کەنییەکا خۆش بیت , دێ پێکڤە ژین و دێ زارۆك هەبن , ئو دێ حەز ژێ کەت , چونکو زارۆکێن وێنە , ئو دەمێ پێدڤی یێن مالێ دکڕیت , دێ ب گەرمی بازارێ دگەل دکانداران کەت.

جەنگیزخان ژ ئاشۆپیا خوە ڤەگەریاو کومەکا مرۆڤان لبەر دەرگەهێ خانیەکی سەرنجا وی راکێشا , خوە دناڤڕاکر, دیت ژنکەکا دکەتە گری و خوە ڤەدقوتیت و یا ئیشارەت دکەتە زارۆکەکێ بچووك , لبەر دەرازینکا خانی یێ درێژکرییە.

جەنگیزخانی ب هویری سەحکرە وی زارۆکێ مری .. دیت کو جردا دێم و لەپێن وی یێن خوارین , ب ترس ڤەجنقی و پاشڤە زڤری , خوە ژناڤ قەرەبالغێ دەرێخست و حەزەکا ڤەشارتنی یا تێکهەلکری ژگریانێ و کەربڤەبونەکا زەییری ددلیدا بوو, ژ باژێری دەرکەفت و جەنگیزخان زڤریڤە ژیانێ.

دەمێ سەربازێن وی ئەو دیتی , دەنگێن خۆشیێ ژێ بلند بوون.

جەنگیزخانی بەرکوشێن خوە کرنە بەرخوە و کولاڤەکێ ئاسنی کرە سەرێ خوە و ب کێمبهایی هێڤ دکرە تانجێ خوە یێ زێرێ, شیرێ خوە بلند کر و فەرماندا لەشکەرێن خوە کو پێشکەڤن.

دەمێ گوهدارییا قەرەبالغا سەربازێن خوە دکر, کو مینا هورەبایەکێ کەربڤەبوی بوو, وەسا هزرکر کو یێ لیهمشتەکا ئاسنێ بوهژاندی دبینیت , هەمی عەرد یێ ڤەگرتی , هینگی ب بێهنفرەهی گرنژی.

ئو.. هێشتا بەهەشت ژی جهەکێ گەلەك خۆش و مشتی دارێن کەسك و ژنکێن جوان و رووبارێن هنگڤینی و مەیێ و شیری بوو.

*    *    *

# ئالایێ رەش

غەسان یێ لسەر جاددەیێن دبن رەشاتییا نیڤ شەڤا پرچ رەشدا دمەشیت و دەستەکێ وی کتێبەك یێ تێدا و لەشێ وی ژی مشتە ژ کەیفا چویچکەکا فرۆکە لبن ئاسمانەکێ مشتی شیناتی.

با دبێژیت: ئەز حەز ژ فلمێن کومیدی دکەم.

هەیڤ دبێژیت: ئەڤ سەرئێشە من بەرنادەت و دەرێن دەرمانخانەیان گرتینە.

دار دبێژن: دترێناندا .. خەونان ب وەغەرکرنێڤە دبینم.

گلۆپێن کارەبێ دبێژن: ئاھ ھ ھ .. بێهنا لیمۆیێ چەند یا خۆشە.

غەسان هزرا ماموستایەکێ پیرێ خواندنگەهەکێ دکەت, ب دەنگەکێ هێدی دگۆت: لسەر دەورێ بەرێ, دوو هەیڤان رۆناهی ددا عەردی, رۆژەکێ لێککەفتن, هەیڤا شکەستی پرت پرت بوو, پاشی گۆتنە ڤان پرتێن بچووك .. ستێر. غەسان هزرا رووبارەکی دکەت ل بەرامبەرخۆدیکێ رادوەستیت, ب خەموکی هێڤ دکەتە دێمێ خوەیێ چرمسی و پۆرا خوە یا سپی.

غەسان بەرە بەرە ژ جاددە و ئاڤاهی یێن بەرین دویر دکەڤیت و دچیتە دناڤ کولانکێن تەنگو ڤالادا .. قەستا مالا خوە دکەت. ل وی دەمی هزرا هندەك مرۆڤێن سەرپری دکەت, ئالایێن رەش ڤێنە و ب رەزیلی دکەنە هەوار: ئاڤ.. ئاڤ

غەسان دگەهتە سەریێ کولانکا خوە, ل وێرێ پێنگاڤێن وی کورت دبن و ب تامەزرویی گوهێ خوە ددەتە هەوارەکێ ژ خانیکێن ئاخێ دەردکەڤیت و گازی رۆژێ و هۆرەبای دکەت. دبەر دوو زەلامان را دبوریت, شەلوال د پیا بوون, ئەو زەلام لبەر دەرگەهێ مالەکێ رادوەستن و ب دەنگەکێ بلند دئاخڤن و کەنییەکا چڤێل و بلند ژێ دەردکەڤیت, ژنشکەکێڤە مت دبن, پاشی ئێکی ژوان ب دەنگەکێ ستووریێ لێڤمچاندی گازی غەسانی دکەت: برا .. برا.

غەسان رادوەستێت و ب سەرسورمایی هێڤ دکەتە وان هەردوو زەلامان, کو ب پێنگاڤێن راهەژوك یێ خوە نێزیکی وی دکەن و بێهنا مەییێ یا ژێ دفریت.

زەلامەك ب دەنگەکێ بەخری دبێژتێ: سلاڤ سلاڤا خودێیە .. ما دا ب چ خوسارەت بی ئەگەر تە ژی گۆتبا سلاڤ ل وە بن .. یان ئێڤاری باش.

غەسان تێك دچیت, هەولددەت کو ب گرنژیت و بەرسڤێ بدەت, لێ زەلامێ دوویێ گۆتە هەڤالێ خوە:

صەیاح .. خوە خەلەت نەکە, کەسێن ماقویل نابێژن سلاڤ ل وە بن .. شەرمە, ئەو دبێژن: بۆنسوار.

صەیاح دبێژیت: بلا بێژتە مە بۆنسوار, ئەوێن ئەو دبێژتێ بۆنسوار, خونە ژمە چێترن, کا بێژە من قاسم, خونە ژمە چێترن.

ئێکسەر قاسم لێ ڤەدگێریت: پێلاڤێن مە ژ باپیرێن وان چێترن.

صەیاح ب پویتەپێکرنڤە دبێژتە غەسانی: باخڤە .. ئەوێن تو دبێژییێ بۆنسوار .. ژمە چێترن؟!

غەسان ب شەلەژانی دبێژیت: ببوورن, ئەز دهزرادا بووم و من ئاگەهـ ژهنگۆ نە بوو.

صەیاح ل قاسمی دزڤریت و دبێژتێ: تە بهیست ؟! برادەر دهزرادا بوو.

قاسم دبێژتە غەسانی: بێژە مە و شەرم نەکە .. تە هزرا چ دکر؟

صەیاح دبێژیت: ئەو وەکو مە هزرێ دژنکاندا ناکەت, ئەو هزرێ دچێکرنا مۆشەکەکێدا دکەت, یان چێکرنا بومبایەکێ .. یان ژی چێکرنا شەیەکی.

غەسان دبێژیت: ئەڤ پرسە یا ب ساناهییە, من سلاڤ نەکرە وە چونکو ئەز هنگۆ نانیاسم.

صەیاح ب نەرازیبوون دبێژیت: ئەڤە تو چ دبێژی, تو مە نانیاسی؟!

غەسان دبێژیت: ئەز دزانم هوون خەلکێ ڤێ گەرەکێنە.

صەیاح دبێژیت: ئو چونکو ئەم خەلکێ ڤێ گەرەکێینە, هەلبەت ئەم نە هەژی سلاڤێینە!

غەسان دبێژیت: تو یێ چەوتی .. تو ب دروستی دئاخفتنا من نەگەهشتی.

صەیاح دبێژیت: بەلێ ئەز ییێ چەوتم و ییێ کەرم و چ تێ ناگەهم, فەرموو شرۆڤە بکە.

غەسان دبێژیت: تەنها .. ئەز مرۆڤەکێ نوومە لڤێ گەڕەکێ.

قاسم ب پێترانکیڤە ژێ دپرسیت: ئو چەوا تە ژ خوەگرت .. تو ل گەڕەکا مە بژی؟

غەسان دبێژیت: ما بوچی لێ ناژیم؟!

پاشی ب رەحمەت تفا خوە دادعویریت و هێدی دبێژیت: ئەز ژی وەکو خەلکێ ڤێ گەڕەکێمە.

قاسم دبێژتە صەیاحی: سەیدای شەرمکر .. چونکو وەکو مەیە.

صەیاح دکەتە قێژی: تو نە وەکو مەیی و وەکو مە نابی ژی, چونکو ئەم زەلامین, لێ تو ژنکی.

غەسان کارێ چوونێ دکەت, لێ صەیاح رێکا وی دگریت و پالەکێ ب سینگێ وی رادنیت و پشت و پشت ل دیواری ددەت .. ئو دبێژتێ: کیڤە؟! .. بێ دەستوورخواستن!! .. تو ییێ دگەل زەلامان دئاخڤی.

غەسان دبێژیت: وە چ ژمن دڤێت؟

قاسم دبێژتە صەیاحی: بهێلە .. وە دیارە ئاخفتنا مە ب دلێ وی نینە.

صەیاح دبێژتە غەسانی: ئەگەر تو ژ مە تۆڕەیی .. فەرموو مە بقوتە, چ ل تەیە؟!.. ما تو نزانی دێ چەوا خەلکی قوتی؟!

غەسان دبێژیت: ئەز حەز ناکەم کەسەکێ بقوتم.

صەیاح دبێژیت: تو وەسا ڤێ ئاخفتنێ دبێژی .. هەروەکو تە یەمەن ڤەکری!؟ دڤێت تو شەرم ژخوە بکەی و خوە دناڤ گلێشیدا ڤەشێری .. ئەو زەلامێ نەشێت کەسێ بقوتیت, نە زەلامە.

قاسم قورنجیکەکێ ل کێلەکا غەسانی ددەت و پرسیار ژێ دکەت: ئەڤە چییە ددەستێ تەدا؟

غەسان دبێژیت: کتێبە.

قاسم ب دژواری دبێژتێ: ما کێ گوتییە تە ئەز ییێ کۆرەمە؟! ئەز دزانم ئەو کتێبە, یان ژی تو هزردکەی کو چ جاران من کتێب نە دیتینە؟!

غەسان دبێژیت: تە پرسیارا منکر و من .........

قاسم ئاخفتنا وی دبریت و دبێژتێ: پرسیارا من ئەوە کا چ دکتێبێدایە؟

غەسان دبێژیت: ئەڤ کتێبە دیوانەکا هۆزانانە.

صەیاح دبێژتە قاسمی: تە بهیست؟ .. ب راستی سەیدا ژ ماقویلانە, چیرۆکا عەنتەری ناخوینیت, ژبلی هۆزانان چ ناخوینیت.

قاسم دبێژتە غەسانی: ما تو نەشێی بێی کتێب ب رێڤە بچی؟ هەرەمێ تە دبینین کتێب دگەل تەنە.

غەسان دبێژیت: ئەز حەز ژ خواندنا کتێبان دکەم.

صەیاح دبێیت: ماشەللاە .. ددونیایێدا کەسەك هندی سەیدای ناخوینیت.

قاسم دەستێ خوە ددانتە سەر ملێ غەسانی و ب هەڤالینی دبێژتێ: کا بێژە من .. بوچی تو ب شەڤێ ژی کتێبێ دهەلگری .. دا خوە پێ مەزنکەی؟

غەسان بەرسڤێ نادەت, ژنشکەکێڤە صەیاح کتێبێ ژ دەستێن غەسانی دئینتە دەرێ, پەڕێن وێ ڤەددەت و پاشی ب غەیدینڤە ددڕینیت, دهاڤێژتە سەر عەردی, دڤی دەمیدا غەسان پتر ب دیواریڤە دهێتە نووساندن.

قاسم دبێژتە صەیاحی: تە دیت؟ ئەو ژنکە .. ئەگەر زەلام با, بێدەنگنەدبوو.

صەیاح سەرێ خوە دهەژینیت و دبێژیت: ئەڤێن هەنێ .. ئەوێن پانتۆرا دکەنە پێ خوە, سمبێلێن هەین, لێ کچێن بەرمال ژ وان زەلامترن.

غەسان دبێژیت: هوون بو خەبەرا دبێژن؟ ما من چ زیانا وەکرییە؟

قاسم دبێژیت: ئها .. ئەڤە یا ژمە کێمە, صەیەکێ وەکو تە زیانێ بگەهینتە مە.

غەسان هێدی و ب نەرازیبوون دبێژیت: چ پێدڤی ب ڤان گۆتنان ناکەت.

قاسم چەپلا لێددەت و دبێژیت: گەلەك باشە! .. صەی دەسپێکر یێ کوریا خوە دهەژینیت.

صەیاح دبێژتە قاسمی: خویشکا وی ژی وەکو وی یا ماقویلە, عەبای ناراکەت, ب دفن بلندی دمەشیت, هەروەکو هەردەم بێهنەکا گەنی دچیتێ.

قاسم دکەتە ڤێژی: ئاخ صەیاح .. بیرا من نەئینە.

ل غەسانی دنێڕیت و دبێژیت: خۆدێوو.. مەردێ مەردا , شەگەکێ بتنێ دگەل وێ بدە من و پاشی من ب سێدارێڤە بهەلاویسە.

غەسان ژکریڤە دبێژیت: ئەڤە چ گۆتنن؟!

صەیاح خەنجەرەکا دەڤتیژ رادکەت و دبێژتە غەسانی: ئەڤە چییە؟ بزانە ئەڤە چییە؟

پێڤەنووسیانا غەسانی ب دیواریڤە زێدەتر لێ دهێت ..

قاسم دکەنیت و دبێژیت: بهێلە صەیاح .. بهێلە, رەبەنی ترسیا و دێمێ وی وەکو لیمویێ لێهات.

صەیاح دبێژتێ: ئەز ناهێلم .. هەتاکو بەرسڤێ ددەت.

قاسم دبێژتە غەسانی: دێ باخڤە.

غەسان دبێژیت: هەلبەت .. ئەڤە خەنجەرە.

قاسم هەوار دکەت: ب راستی .. سەیدا رەوشەنبیرە.

صەیاح دبێژتە غەسانی: دێ کری؟

غەسان دبێژیت: ما دێ چ لێکەم؟

صەیاح دبێژیت: ئەو زەلامێ خەنجەرەك نەبیت, ب پەڕەکێ پیڤازێ نا ئینیت, دڤێت تو ببیە زەلام.

قاسم دبێژیت: دێ دێ صەیاح! .. ئاخفتنا تە شەکرە. هەر کەسەکێ ل گەرەکا مە بژیت, فەرە یێ زەلام بیت. ئەم ژی نهو.. دێ وی فێرکەین کا دێ چەوا بیتە زەلام.

قاسم زللەهەکا ب هێز ل روییێ غەسانی ددەت و دبێژتێ: دێ تو ژی زللەهەکێ ل روییێ من بدە.ئەوێ زللەهێ ل تە ددەت یان ل تە نەدەت, دڤێت تو زللەهەکێ لێ بدەی, نە خوە ب دیواریڤە ب نووسینی.

صەیاح ژی تف دکەتە غەسانی, لێ غەسان چ هەولێن خۆلڤاندنێ ناکەت و تفێ ژی ژ سەروچاڤێن خوە پاقژ ناکەت.

صەیاح ژکەربڤە لێ دکەتە قێژی: دێ دخوە بلڤە .. هەی صەییێ پیس, ما تو ژی نە خوین و گوشتی؟

قاسم دبێژیت: خوە نە وەستینە .. صەیاح, ژبلی کاغەزان و کتێبان چ تشتێ دی دبن جلکێن ویڤە نینە.

صەیاح خەنجەرا خوە دادوەشینیتە سینگێ غەسانی و رادکەتەڤە, خوینەلۆ دبیت.

قاسم ب ترس دکەتە هەوار: بهێلە ..صەیاح, دێ کوژی.

خەنجەرەکا دی ددانتێ, غەسان هەولددەت کو دەڤێ خەنجەرێ بگریت و نەهێلیت بگەهنە لەشی, لێ دەڤێ خەنجەرێ دەستێ وی کون دکەت و نەچار دبیت کو بەردەت. گەلەك ب لەز و ل دویف ئێك چەندین خەنجەران لێددەت و دیوار ژ پشتا غەسانی ڤەدبیت, غەسان دحلیسیت و دکەفتە سەرعەردی, ب دەنگەکێ مشت ژ خوین وئێشانێ دگۆت: ئاخ .. ئاخ.

صەیاح یێ بێنهەلمایی بوو, ب رەخ غەسانیڤە دروونیت, قاسم لێ دکەتە قێژی: دێ چ کەی؟ هلو.. دا ب رەڤزین.

صەیاح بژیا غەسانی دگریت و بو پاشڤە دکێشیت, غەسان دکەفتە سەرپشتا خوە و حەفکا خوە بو دەڤێ خەنجەرێ دهێلیت .. ب لڤینەکا دلرەق و ب هێز, ئەو خەنجەر سەرێ غەسانی ژسەر لەشێ وی ڤەدکەت.

ل وی دەمی, غەسانی ئالایەکێ رەش راکر و ب هەوارکی داخوازا ئاڤێکر.. دکرە غار, داکو بگەهتە وان زەلامێن ئالایێن رەش راکرین.

* * *

# كوما بەرخكا

هژمارەكا زەلامێن گەرەكا سەعدی ب سەرسورمايیڤە هێڤ دكرە عەیشا یا كەچا عەبدولا چەلەبی ,

چونكو عەیشا ب سەربلندی و بێ عەبا دمەشی , ژبلی هیزارەكا دوو رەنگ, رەش و سور, چ دی لسەر سەرێ وێ نەبوو.

دەمێ عەیشا ل پێش چاڤێن وان غەوارەبوی , ب تەحەمی سەرێن خوە دهەژاندن , خونەراژیكرنەكا دژوار خوە ل سەری دا , هێشتا شەڤێ نەدادای هەمیا خوە دمالا شێخ محەمەدیڤە قوتاو دەستێ وی یێ پیروز ماچیكرن , ب ئەڤینی و پر ب چریسەت سەح دكرنە ریهێن وی یێن سپی و دریژ, پاشی ئێكێ ژوان بەحسێ كریارا عەیشایا كچا عەبدلا چەلەپی كر, شێخ محەمەدی ب حەیرینڤە گۆت: ئەڤا هوون دبێژن .. ئەز باوەرناكەم , عەبدلا چەلەبی مرۆڤەكێ باش و ئولدارە , چ نڤێژ ژێ ناچن.

راستە دەمێ دبێژن ستری ب گولاڤە چێ دبن.

زەلامەكی ژوان ب دەنگەكێ شكەستیڤە گۆت: شێخ .. ئەم چ بكەین؟ مە شیرەتكە.

شێخ محەمەدی گۆت: دگەل بابێ وێ یان برایێ وێ باخڤن.

ل روژا پاشتر ئەو زەلام دگەل برایێ وێ یێ گەنج ئاخفتن و گۆتنێ كو خویشكا وی یا هاتییە دیتن , بێ عەبا ل كولانێ دمەشی , ئەوێ گەنج لێ ڤەگەراند كو خویشكا وی یا بویە قوتابی ل زانكویێ و نە یا بەرهۆزە كو ب عەباڤە بچیتە زانكویێ.

گۆتنێ: هەمی خەلكێ گەرەكێ ژكریارا خویشكا تە نە درازینە و هەمی ژنكێن گەرەكێ عەبای رادكەن.

وی گۆتێ: مایێ خوە دژن و كچێن خوەدا بكەن , ئو عەیشا خویشكا منە .. نە یا وەیە.

ژنە دل و ب كەرب , خوە ژێ دانەپاش .. چونكو گەنجەكێ سەربەردایە و هەمیا پێكڤە بریاردان كو دگەل بابێ وێ باخڤن. لێ بابێ پیرەمێر ب گلەییڤە گۆتێ كو وی كەچا خوە ب باشترین رەوشت یا پەروەردەكری و وی باوەری ب سنج و رەفتارا وێ هەیە. هەروەسا ب پێترانكیڤە گۆتێ: ئەگەر ئێكا دەهمەن پیس عەبای راكەت , ما دێ پاقژ و شەریف بیت؟

ئەو زەلام بوغومین , ئێڤاری ل مالا شێخ محەمەدی خرڤەبوون و ئەڤ سوحبەتا بوی بو ڤەگێرا , ب خەمڤە سەرێ خوە هەژاند و ب دەنگەكێ هێدی گۆت: ل ڤێ دوماهیا زەمانی .. ژنك عەبای نا راكەن و ب سەركۆلی ل جاددا دمەشن , جلكێن زەلامان دكەنە بەرخوە .. مرۆڤ نەشێت زەلام و ژنكا ژێك جوداكەت.

شێخ محەمەدی سەحکرە بانی و ب دەنگەکێ مشتی هیڤیڤە گۆت: خودێ وو.. تو مە ژوێ رۆژا رەش ب پارێزی.

هەمی زەلامێن ل وێرێ دبن لێڤلێڤکاڤە گۆتن: ئامین.

زەلامەکی ب گرداریڤە گۆت: ژن بونەوەرەکێ گەنییە, ئەگەر سەربەردای بوو.. دێ بیتە ئەگەرێ خرابیێ و گەنیبوونێ.

زەلامەکی گۆت: ئەگەر مە ئەڤروکە خوە بێدەنگکر, رۆژەك دێ هێت ژنکێن مە ژی دێ وەکو عەیشایێ لێ هێن.

شێخ محەمەدی گۆت: ئەز مرۆڤەکێ پیرم, ئەگەر نهو یێ ساخ بم, سوبە دووسوبە نامینم ساخ, ئەگەر ئەز ڤێ هەفتیێ مام, هەفتییا دهێت نامینم, ئو ئەگەر ڤێ هەیڤێ ئەز بمینم, هەیڤا بهێت دبیت نەمینم.

زەلامەکی گۆت: خودێ ژیێ تە درێژکەت .. شێخێ مە.

زەلامەکێ دی گۆت: خودێ تە بهێلیت, تو رۆناهیا مە و یا گەرەکا مەیی.

شێخ محەمەد پێڤە چوو گۆت: کەس نەشێت ژ مرنێ ب رەڤیت, هەر بونەوەروك ب مرنێ یێ حوکم کرییە, من ژیێ خوە یێ بری و هەرپێنگاڤەکا ب هاڤێژم من ژ گوری نێزك دکەت, مرۆڤێ ئاقل ژی دڤێ رەوشێدا پویتەی نادەتە کارێن دونیایێ و خو بەرهەڤ دکەت کو وەغەرێ ببەتە ژیانا دوویێ, ژیانا نەمر و بێ دوماهی .. لێ پەیڤا راستیێ دڤێت بهێتە گۆتن, عەبا بو ژنکێ پاراستنا وێیە و یا زەلامییە ژی, ئەگەر ژنك عەبای نەراکەن, هزر بکەن دێ چ قەومیت, لەشێ وێ هەمی دێ یێ ئاشکرا بیت, ئەگەر زەلامەکی سەحکرێ دێ شەیتان لێ موسەلەت بیت و دێ وەلێ کەت کو حەز ژ زنایێ بکەت.

کوخکەکا درێژ شێخ محەمەد گرت, دەمێ کوخکا وی راوەستای, گۆت: کورێن من .. برایێن من, ئەوێ خوە لسەر خرابیێ بێدەنگکەت, هەروەکو خرابی کری, وێ بکەن یا هوین دبینن دروستە, خودێ هاریکارێ وە بیت.

زەلامان دناڤبەرا خوەدا دانوستاندنەك کر کا پێدڤییە چ بکەن, ل دوماهیێ گەهشتنە وێ برِیارێ کو دڤێت خێزانا چەلەبی ژ گەرەکا خوە دەربێخن و بکەنە دەرێ.

رۆژا پاشتر, دەمێ عەیشا دزڤریڤە مال, سێ گەنجان رێکا وێ گرت و ئێکێ ژوان پرسیارکر: دێ کیڤە چی؟

عەیشایێ ب ئەنی گرێییڤە گۆت: ئو تو بو پرسیار دکەی؟

ئەوێ گەنج گۆت: ما پرسیارکرن قەدەغەیە؟

عەیشایێ گۆت: ئەز دێ چمە مال.

ئەوێ گەنج گۆت: مال نا رەڤیت . توچ دبێژی ئەگەر دگەل مە بهێی؟

گەنجێ دووێ گۆت: سەحکەمە .. مە هەرسێکا ,  هزرا خوه بکه کادێ چەند خوشیێ دگەل مە بەی.

عەیشایێ ژکەربڤە گۆت: شەرم بکەن.

گەنجی سییێ گۆت: تو بوچی تورە بوی؟ کا خەلك چەندێ ددەتە تە ئەم ژی دێ پارێن خوە دەین و هێشتا پتر.

عەیشایێ گۆت: هەما هوسا هوین دگەل کچەکا گەڕەکا خوە دئاخڤن؟!

گەنجێ ئێکێ گۆتێ: تو کچەکا گەڕەکا مەیی؟! ئوف! مە هزردکر تویا بیانی یی ,  کچێن گەرەکا مە جلکێن وەکی یێن تە ناکەنە بەرخوە.

گەنجێ سییێ گۆت: هەڤالینو ئەڤروکە بهێلن ,  ئو دێ هەر سوباهی بینین ,  وێ بڤێت یان ژی نەڤێت دێ هەر دگەل مە هێت. هەر هەر سێ گەنج ژعەیشایێ دویرکەفتن و حیلحیلا وان یا کەنیێ بوو.

عەیشا ژی بلەز زڤریڤە مال و پشتی بلەز دەرگەهـ لدویڤ خوە دائێخستی ,  ئێکسەر هلدا ژوور ب دەنگەکێ بلند بەردا گرییێ. برایێ وێ ودایکا وێ بلەز دهەواریێ هاتن و گەهشتنێ ,  پرسیار ژێکرن کا چ لێیە .. چیرۆك هەمی بو ڤەگێرا و برایێ وێ ئێکسەر ژمال دەرکەفت. دیت ئەو هەرسێ گەنج ل نێزیکی مالا وان دراوەستاینە حیلحیلا کەنیا وانە ,  ژکەربڤە خوە ژێ نێزیککرو لێ کرە قێژی: ما هوین شەرم ناکەن؟ وە بوچی رێکا خویشکا من گرت بوو؟ ماوە خویشك نینن؟!

گەنجەکی گۆتێ: هش بە .. کەسەکێ وەکو تە یێ بێ بها ,  نابیت بەحسێ خویشکێن مە یێن پاقژ بکەت.

برایێ عەیشایێ هێرشکرە وی گەنجی و زللەهەکا ب هێز لێدا ,  ئەوێ گەنج پشت و پشت چوو,  کێرکەك دەرێخست ,  برای کارێ خوە کرکو خوە لێ بدەت ,  لێ هەر دوو گەنجێن دی ئەو گرت و نەهێلا بلڤیت , سینگێ وی بو ئارمانجا دەڤێ کێرکێ.

دەمێ رۆژ ئاڤا بوی و رەشاتییا شەڤێ دادای ,  زەلامێن گەرەکا  سەعدی لپشت شێخ محەمدی رێز ببوون ,  پر ب ترس و ئۆلداریڤە نڤێژا خوەیا عەیشا دکر,  ل وی دەمی ژی .. خێزانا چەلەبی کراسێن بەهیێ دکرنە بەرخوە.

*　　*　　*

# ئەوێ روونشتی و ئەوێ ژپێرڤە

شەنفەری ل خوارنگەهەکێ یێ روونشتی بوو، گوشتێ مریشکا لسەر پەلێن ئاگری بێی بسوژیت هێدی هێدی دبراژت. هەر پاریەکێ هاڤێتبا ددەڤێ خوەدا و جوی با، دا خۆشی و کەیفەکا بێ سنوور بو چێ بیت و هەست دکرکو بێ شاپەریێ ل ئاسمانەکێ فرەهـ دفریت.

ژنشکەکێڤە، پولیسان چوار دەورداو ب دەنگەکێ هشك فەرمان دایێ کو بێ هیچ بەرگریەك دگەل واندا بچیت. گەلەك هیڤی و رجا ژێ کرن کو بهێلن خوارنا خوە یا بهایێ وێ دای تەڤاڤکەت، لێ نەهێلاو ئێکسەر دگەل خوە گەهاندە نێزیکترین بنگەهێ پولیسان.

دەمێ شەنفەری ئەو کەسێ وەکو بەرپرسان دیتی، هەر دەملدەست لێ کرە ڤێژی و گۆتێ: بوچی ئەز گرتیمە؟ ئەز نە سیخورو نە دزو نەجەردەچی و نە دژی دەولەتێمە، یا خویایە و دوست و دوژمن هەمی دزانن کو ئەز دهەمی ژیانا خوەدا نەبویمە ئەندامێ چ پارتێن رامیاری و ئەز حەز ژسیاسەتێ ناکەم.

تویژەر: هش بە و خوە ب ئەدەب بێخە، وەل مە نەکە کو تە فێرکەین کا دێ چەوا ب ئەدەب ئاخڤی، هزر نەکە کو نواندنا تە بو رۆلێ بێگونەهیێ و ستەملێکرنێ دێ مە دسەردا بەت، هەر رۆژ ئەم سەدێن وەکو تە دبینین.

شەنفەری: ب راستی ئەز بێگونەهم، ئەز نموونەیێ کەسێ باش و شەریفم.

تویژینەر: ما تو نە هەڤرکێ عەشیرەتا "سەلامان" ی.

شەنفەری: ئەڤە هەلویستەکێ پێزانە لنك من، ئەز حەز ژڤێ عەشیرەتێ ناکەم، لێ ب هزرا من یاسایێ چ ماددە تێدا نینن کو ڤیان و نەڤیانا مرۆڤی دەسنیشانکەت.

تویژینەر: ما تو نزانی ئەڤ عەشیرەتە پشتا رژێمێ دگریت و مادەم توحەز ژێ ناکەی، ئەڤە رامانا وێ ئەوە کو تو حەز ژ رژێما حوکمدار ژی ناکەی.

شەنفەری: ئەڤە بەلایەکا مەزنە، ئەز دانپێدانێ دکەم کو من های ژڤێ خالێ نەبویە، لێ سوزێ ددەمە وە کو ژنهو پاشڤە نەڤیانا خوە ژبو عەشیرەتا سەلامان بهێلم و هەر کەسەکێ وێ عەشیرەتێ ژدایك و بابێ من خۆشتڤیتر بیت.

توژینەر: گۆتنێن هندەك ڤەگۆ یێن باوەپێکری لنك من هەنە، خویا دکەن کو تە سویندخوار بوو، سەد زەلامان ژ وێ عەشیرەتێ بکوژی، توچ دبێژی؟

شەنفەری: ئەعوزو بیلا! پرسیارا من ژخەلکی بکەو دێ زانی کو ئەڤ گۆتنە گۆتگۆتك و درەوێن غەرەزدارن. گەلەك ب ساناهییە ئەز ڤان گۆتنا ب درەو دەربێخم. یائێکێ من چ شمشێر نینن. یا دووێ ئەز یێ زەعیفم و نەشێم مێشەکێ ژی بکوژم. ئەڤجا دێ چەوا شێم سەد مرۆڤان کوژم. یا سیێ ژی ئەز هۆزانڤانم و هۆزانڤان هەردەم یێ هەست نازك و دلنەرمە. حەز ژ خوینێ و خوینرێژتنێ ناکەت.

تویژینەر: ئەڤە خەبەرەکێ نوی بوو بو من. تو هۆزانڤانی یان ژی تو ترانا دکەی؟!

شەنفەری: هوزانڤانم و تو دشێی ژهەر ئێکەتییەکێ ژئێکەتی یێن ئەدیبان پرسیارا من بکەی. ئەز هۆزانڤانم و هۆزانڤانەکێ بناڤ و دەنگم. من هەلبەستەکا گەلەك ب ناڤ و دەنگیا هەی ب ناڤێ "لامیە العرب". ئو ئەگەر ئەز هاتمە زیندانکرن .. ئەز نەشێم باشترین کتێبا خوە یا هۆزانان تەڤاڤکەم کو هەمی یا تەرخانکرییە ژبو پەسەنکرنا باشی یێن دەولەتێ.

توژینەر: ب دروستی ناڤەرۆکا کتێبا تە لسەر چییە؟

شەنفەری:کتێب ژسەد هۆزانان پێك دهێت و هەر هۆزانەك مەدحێن بەرپرسەکێ دەولەتێ دکەت. ژبو رێڤەبەری هۆزانەك و ژبو بریکارێ وەزارەتێ هۆزانەك و ژبو وەزیری دوو هۆزان و دەهـ بو سەروکێ وەزیران و ئێك بو لەشکەری و ژبوسەرلەشکەری ژی هەفتێ هۆزان یێن تێدا.

تویژینەر: ئو سەروکێ دەولەتێ!؟ خۆدێ بهێلیت.

شەنفەری: ئەز دێ یێ خائین بم ئەگەر وی ژبیر بکەم. لێ من دیت کو نە دجهێ خوەدایە بەحسێ وی دگەل بەحسێ فەرمانبەرو خولامێن وی بکەم. ئەو دێ بابەتێ کتێبا من یا دووێ بیت کو ژ هزار هۆزانان پێك دهێت و هەر هۆزانەك مەدحێن پشکەکا وی دکەت .. هۆزانەك ژبو پەسنکرنا ددانێن وی و ئێك ژبو دەڤێ وی و ئێك بو سەرکەفتنێن وی دشەرِادا و ئێك ژبو دفنا وی و هۆزانەك ژبو پیێ راستێ و ئێك ژبو پیێ وی یێ چەپێ.

تویژینەر: هەڤبەندیا تە دگەل ئەوێ دبێژنێ ( **تأبط شراً** ) چییە؟ هشیار بی ڤێ هەڤبەندیێ لدەف من ماندلا نەکەی.

شەنفەری: نە .. نە، ئەو ئێکە ژ هەڤالێن من.

تویژینەر: مە گرۆڤ هەنە، کو ئەو درێکخستنەکا نهێنیدا .. دژی دەولەتێ کاردکەت.

شەنفەری: ژ ئەڤرو پێڤە، نە ئەو هەڤالێ منە و ئەز چ جاران دگەل نا ئاخڤم.

تویژینەر: نەخێر، بلا بمینیت هەڤالێ تە و هەر رۆژ دێ بینی، لێ ئەگەر تو ژدل وەلاتپارێز بی، ئەرکێ تەیە کو راپۆرتەکێ لسەر هەمی لڤین و ئاخفتنێن وی و ناڤێن وان کەسێن ئەو دبینیت بو مە بلندکەی.

شەنفەری: ئو ئەڤ راپۆرتە، تە رۆژانە دڤێت یان ژی هەفتییانە، تەب هۆزان دڤێت یان ژی ب پەخشان بنڤیسم.

تویژینەر: کا چەوا تە بڤێت وەسا بنڤیسە و وەسا پێشکێشکە، یا گرنگ ئەوە پێزانینێن مفادار بو مە هەمیا تێدا هەبن.

شەنفەری: ئەز بهایێ بەرهەمێن ئەدەبی دزانم ئەوێن روژنامەو گوڤار و تێلەفزیون و رادیو ددەتە نڤیسەران، لێ ئەز بهایێن وە نزانم.

تویژینەر: تو وێ بنڤیسە ئەوا ئەم و وەلات ژی درازی بین، ئەوا دلێ تە پێ خۆش .. دێ وێ دەینە تە.

شەنفەری: دێ چەوا دەنە من، دناڤ وەلاتیدا یان ژی ژ دەرڤەی وەلاتی، ئو دێ ب چ رەنگێ پارەی بیت؟ دێ ب دولاری بیت یان دێ ب جونەیها ئیستەرلینی بیت، یان ژی دێ ب مارکێ ئەلمانی بیت.

*     *     *

# نانێ هشك

بو ماوەیەکێ درێژ بوو عەباس ل کولانا دگەریا. هەمی دکانێن فرۆتنا نانی ددەرگرتی بوون. ئەڤە بو ماوەیەکێ درێژە گەنم نینە و ئەردی ژی بەرسڤا هەوارێن مرۆڤان نەدا.

عەباسی دیت زارۆکەك یێ ژمالەکێ دەردکەڤیت و نانەکا هشك و رەنگسپی یا ڤێ. عەباس حەییری. راوەستیا. شت ما ل جهێ خوە و بەرێ خوە ددا وی زارۆکی و پاشی هێرشکرێ. خوە ل نانی دا و ژدەستێ وی ئینا دەرو ب غاردان رەڤی. ڤێژییەکا ب ترس ب دویڤ ڤەبوو.

عەباس هاتەڤە مال. دەرێ ژوورا خوە ب موکمی لدویڤ خوە گرت و پاشی روونشتە سەر لێڤا تەختی. ژوەستیانێ بێهنا لێ چکبوی. لێ هەر چاڤێن وی ژنانیڤە نابن.

تبلێن وی ب دلوڤانی دەست کرە نانی و بێهنا نانی هەلکێشا، دێ ب پیچەکا ئاڤێ تەرکەت و دێ بێهنەکێ خوە لێ گریت هەتاکو جارەکادی نەرم دبیتەڤە، هینگی پرت پرتە دێ خوت .. هەتاکو تەمام دکەت.

ژنشکەکێڤە عەباسی گوهـ لێ بووکو ئێکێ ل دەرگەهێ وی ددەت، خوە کرە قورمچك و بێهنا خوە چککر، دەستێن وی نان گرت و لێدان یا بەردەوام بوو.

دەنگەك هاتە گوها: عەباس .. عەباس

ئێکسەر عەباسی خودانا دەنگی نیاسی، لێ ب خشیمی پرسیارکر: کییە ؟

- ئەز لەیلامە

ئو لەیلا دوتماما وی بوو، کچەکا جوان بوو، یا زەر و دامای بوو، حەز ژ بێدەنگیێ دکر، بەری چەند هەیڤەکا دایبابێن وێ مرینە و ژهینگێ وەرە ل مالا عەباسی دژیت. عەباسی گەلەك پێ نە خۆش بووکو لەیلا حەز ژبرایێ وی یێ مەزن دکەت، ئەوێ چوویە باژێرەکێ دویر بو خوە ل کارەکێ دگەرییت.

عەباسی گوهـ ل دەنگێ لەیلایێ بوو یا دبێژتێ: دەرگەهی ڤەکە.

- هەرە .. نەکو دایکا من تە ببینیت.

دایك ژی هەردەم یاهشیار بوو، نە دهێلا عەباس نیزیکی لەیلایێ ببیت، هەردەم عەباسی دڤیا کو ببیتە باولەیلا وی ب هەلکێشیت داکو دناڤ هەرخانەیەکێ ژخانە یێن لەشێ وێدا جێگر ببیت. لەیلا ژێ دترسیا و کەرب و کینەکا دژوار ژچاڤێن وێ دبەشی .. هەروەکو عەباس گایەك و دێ هێرشکەتێ و ب شاخێن خوە دێ زکێ وێ درینیت.

- دەری ڤەکە.

عەباس نێزیکی دەرگەهی بوو، رویێ خوە ب داریڤەنا بێی کو هەولدەت ڤەکەت، هێشتا نان ژی دناڤ دەستێن وی دا بوو.

جارەکا دی لەیلایێ دەرگەهـ قوتاڤە، گازیکرێ: عەباس .. عەباس .. دەری ڤەکە.

- هەرە .. نەکو دایکا من تە ببینیت.

- دەری ڤەکە.

- تەچ دڤێت.

- دایکا تە نە ل مالە؟

عەباسی ب خۆشی ئاخینکەك راهێلا و لەیلایێ ب دەنگەکێ لەرزوکیڤە دگۆتێ:

- دەری ڤەکە.

- تەچ دڤێت.

- من دڤێت ته ببینم.

- ته چ ژمن دڤێت.

- من دڤێت بێمه ژوور.

- ئەز دەرگەهی ڤەناکەم.

- ئەز یابرسیمه.

- ژوورا من نه ستێرکێ ئاهێن خوارنێیه.

- من نان دیت.

دەنگێ عەباسی هشکترلێهات: نان .. نانا منه.

- ئەز یا برسیمه.

- نان نانا منه .. ملکێ منه.

- پیچەکێ ژێ بده من.

- ب برسی بمره.

بێهنەکێ لەیلا بێدەنگبوو. پاشی ب دوودلی گۆتێ: ما تو حەز ژمن ناکەی؟

- خو پاریەکی ژی نادەمە ته.

- ماتو حەز ژمن ناکەی؟

- من تو نەڤێی؟

جارەکا دی بو بێدەنگی و پاشی لەیلایێ ب رەزیلی گۆتێ:

- ماته پیچەك ژی ئەز نەڤێم.

- ئەگەر من نان دا ته. دێ چ دەیه من؟

- دێ نانێ دەیه من.

- دێ نانێ هەمیێ دەمە ته.

- ته چ دڤێت دێ دەمە ته.

عەباسی کره قێژی: من چ دڤێت دێ وەل تەکەم.

- دەری ڤەکه.

- تودزانی من چ ژ ته دڤێت؟

- دەری ڤەکه.

- دێ ته ماچیکەم.

لەیلا یا بێدەنگبوو.

- دىَ كراسىَ تە درِينم.

لەيلا يا بىَ دەنگبوو.

- دىَ تە خوَم.

لەيلا يا بێدەنگبوو.

- تو نابێژییە دايك و برايىَ من.

- ڤەكە .. ئەزا برسیمە.

عەباسى دەرگەهـ ڤەكر و لەيلايىَ بلەز خوە دژوور ڤوتا و ئێكسەر چاڤێن وىَ مانە ب وىَ نانێڤە ئەوا ددەستىَ عەباسیدا . ئێكسەر نان دانا پشت خوە وخوە ژلەيلايىَ نێزیككر. لەيلا پاشڤە چوو گوَتىَ:

جارىَ ل بەراهيىَ نانىَ بدە من.

- ئەز نادەمەڤ تە. دبیت بكەیە ڤێژی یان ب رەڤی.

- ئەز نارەڤم.

- دىَ پاشی نانىَ دەمە تە.

لەيلايىَ ب بەرێخودانەكا مشتی هیڤی و رجا سەحكرىَ و گوَتىَ: نانىَ بدە من.

تبلێن عەباسی ب نانێڤە موكمتر لێهاتن. هەستپێكر كو هێزەكا سەیر یا دگەهێن ویدا . گوَت: دىَ دانمە سەر مێزىَ. پشتی تەمام دبین بو خوە ببە.

عەباس ب نك مێزێڤە چوو. نان دانا سەر رويىَ مێزىَ و زڤریڤە نك لەيلايىَ .. ل بەرامبەری وىَ راوەستاو هەردوو پێن خوە ڤەكرن . ب كولب هێڤ دكرىَ .. ئەڤە لەيلایە. چەند خەم و ئازار یێن ژبەر وىَ ڤەجوین. گەلەك جاران دخەونێدا ددیت كو شەڤەكىَ پىَ دايك و برايىَ خوە سەر ژىَ دكەت و د لیوانكا ناڤمالێدا ڤەدشێریت. داكو بهێت و لەيلا یا نڤستی ب هەردوو دەستێن خوە یێن خوینەلو همبێزكەت.

عەباسی هێرشكرە لەيلايىَ و هەردوو دەستێن خوە دنافتەنگا وىَ ئالاندن. لىَ لەيلايىَ خوە نەرازی دكر هەتا وەلىَ كرى كو بەردەت. ئەنیا وى بو گرىَ. ئو ژكەربڤە گوَتىَ: ئەز نانىَ نادەمە تە.

لەيلا ب دوودلی و شەپرزەییڤە ل بەرامبەر عەباسی راوەستاو پاشی خوە نێزیككر پێڤە نووسیا. جارەكا دی دناڤ دەستێن خوەدا قورمچاند. رويىَ وىَ و پرچا وىَ و حەفكا وىَ بلەز ماچی دكر و پێكڤە درێژ بوونە سەر رائێخىَ. هەردووك پێكڤە روی ب روی درێژ بوون و پێكڤە نووسیای بوون. دەڤىَ خوە لسەر لێڤێن وىَ ڤەپاتكر. ئێكسەر تامەكىَ عێلنجی ئینانە لەيلايىَ. تاما تویتنىَ. چەند دڤیا خوە ژىَ قورتالكەت .. لىَ دەڤىَ وی ب توندی ما بو ب لێڤا وىَ یا خوارێڤە. بەرە بەرە لەيلا دگەل ڤىَ تامىَ رادهێت و حەز دكەت كو ئەڤ تامە هێشتا پت ربا.

کێرکەکا دکویراتیێن وێ دا چاندی دلێ وێ خوشکر. نان دێ بو وێ بیت، لێ ئەو دێ دگەل عەباسی ب نیڤی کەت، هندەك هەستێن رەق و دژوار بو چێبوون و کره دترسەکا زڤردا، ب دەنگەکێ هێدێ و دگەورییێدا مای گۆتێ: رابە .. دێ کەمە ڤێژی.

- بکە ڤێژی.

عەباسی تامکره تاما لێڤێن نەرم و تەر، دوی دەمیدا سترانەك رژیا ناڤ دەمارێن لەیلایێ .. سترانەك یابێ پەیڤ، ب سەلیقەیەکا کویڤی، ئو دەمێ دەڤێ وی گەهشتییە مەمکێ وێ، بەفرا سار دگوشتێ وێدا مەشی و رۆژەکا هاڤینی یا پیر هەلات، دلوڤانییەکا گەرم بو چیبوو، هەست پێکر کو عەباس کورێ وێیە، حەز دکر شیر ژمەمکێن وێ بهێت و بچیتە دەڤی.

گوهـ لێبوو عەباسێ دبێژتێ: چاڤێن خوە ڤەکە.

چاڤێن خوەڤەکرن، سەحکرێ، بەرێخودانەکا مشتی خۆشی "بەرێخودانا چاڤێن وێ .. کوترکەکا پێ شاپەرە" تامەزرویا عەباسی بو دیتنا لەشێ وێ یێ رویس زێدەتر لێ دهات .. هەروەکو ئاگرەك ب دارێن دارستانێڤە دچیت.

دەستپێکر جلکێن وێ ژبەرکرن، خوە نەرازی نەکر .. هەروەکو زارۆك خوە تەسلیمی دەستێن دایکا خوە دکەت، جلکێن وێ یێن ژناڤدا دپیس و کەڤن و درپای بوون.

گوشتێ وێ یێ سپی ب رویسی دیار بوو، رۆژا لەشی دتەییسی و دەستێن عەباسی گەهشتنە قردێلەکا کەسك یا گرێدانا پرچێ، ڤەکر و پرچا وێ ب گژاڤژی دالەقیا و شەڤا پرچێ دگەل رۆژا لەشێ تەر تێکهەلبوون.

عەباسی گۆتێ: من همبێزکە.

دەستەکێ خوە، دبن حەفکا وی را برو ب تبلێن دەستێ دی گوشتێ تەحێلا وی دگڤاشت.

عەباسی گۆتێ: بێژە من .. کو تو حەز ژمن دکەی.

- ئەز حەز ژتە دکەم.

- بیژە من .. دلدارێ من.

- دلدارێ من.

- من ماچیکە.

لەیلایێ ب لەزو ل دویڤ ئێك ماچی دکرێ، عەباس کەفتە دناڤ جیهانەکا گەرم و ددەستێن لەیلایێدا، هەولدا کو یێ زال بیت، گازی هەمی هێزو برسا خوە یا کەڤن یا لەشێ لەیلایێ کر، لێ هەر ما بێهێز و نەشیا ببیتە زەلام، پێ هەسیا کو ئەو بونەوەرەکێ زەعیڤ و بێهێزە و ب تەنگەزاری یێ دلەرزیت.

لەیلا یا درێژکری و ب رەخڤە یا پێڤە نووسیای بوو. چاڤێن وێ دگرتی بوون . وەسا هزرکر کو یا گوهـ ل دەنگێ کەرەکێ گایێن ئازراندی دبیت. ب خوەشی و دەڤ ڤەکری چاڤەرێ ما. کو گایێن ئازراندی بگەهن.

عەباسی هەست ب شەرمینیێ و سەرسورماییێ کر. سەحکرە وێ مێزا نان لسەر. دەمێ دەست دکرە گوشتێ نەرم .. وەسا هزردکر کو ئەو نان یاب ئاڤێ تەرکری و بێهنا وان زەڤیا یا ژێ دهێت. ئەوێن پەلا بارانێ کەفتییە سەر.

شەلەژانییا عەباسی زێدەتر لێهات و گوهـ لێ بوو کو لەیلا .. هێدی یا دبێژتێ: دلدارێ من .. دلدارێ من.

پتر پێڤە نووسیا. شەرمینی یا وی ژی زێدەتر لێهات. سەرنجراکێشییا گوشتی نەما و عەباس ژی نە دشیا خو پتر بگریت. ب لڤینەکا ژنشکاڤە خوە ژسەر لەشێ وێ قورتالکر و شت رابوڤە. نان ژسەرمێزێ راکر و ئێکسەر ڤەستا دەرگەهیکر.

لەیلا شیا خوە ب پێ ویڤە بگریت .. لێ عەباسی پێهنەکا ژحێل لێدا و ب زکی کەفت. کەفتە سەر پشتێ و ب رویساتی دنالی.

عەباس ژ ژوورێ دەرکەفت و ب نمار ژلیوانکا مال ژی دەرباز بوو. دەرگەهێ ژدەرڤە ڤەکرو ژحێل دائێخست. ب غار دکولانکادا دچوو هەتا ژمال دویرکەفتی. پاشی راوەستیا و پالا خوە دا دیوارەکێ ئاخێ و تبلێن وی ب موکمی ب نانیڤە دشدیای بوون.

*　　　　*　　　　*

## ئەلهۆ

بەری سالەکێ. بابێ من یێ مری و ئەڤە ئەز دێ چمە سەرەدانێ. دناڤ گورێن سپیدا یێ راوەستیایمە و ترسێ و خەموکیێ و شکەستنێ ل خوە دیاردکەم. ب دەنگەکێ کۆلەیی فاتحێ لسەر گیانێ وی دخوینم. من گوهـ لێ دبیت ب تورەییڤە لمن دکەتە هەوار: کورو شەرم بکە .. جگارا نەکێشە.

شەپرزە دبم. جگارێ دهاڤمە سەر عەردی و لبن پەحنیا پێلاڤا خوە دهەرشینم .. لێ گازیکرنا وی یا بەردەوامە و پرسیاردکەت: ما تە ژن نەئینانە؟

ئەز ب سەرسورمایی لێ ڤە دگەرینم: مادێ بوچی ژنێ هینم؟

دبێژتە من: زارۆك جوانیا ژیانا دونیایێنە.

ئەز ب مجدی و رکویی دبێژمێ: ئەز ژنێ ناهینم و من نەڤێت ببمە باب.

ب توڕەییڤە لمن دخوریت, ئەز ب تڕانەڤە دبێژمێ: باب خوە توڕە نەکە, توڕەبوون بو ساخلەمیا تە نە باشە.

دەنگێ وی یێ توڕەبوی دژوارتر لێ دهێت, بلەز ژگوڕستانێ دڕەڤم و ڤە دگەڕمەڤە مال, ل وێرێ من دلبەرا خوە یا لسەر تەختی درێژکری دیت .. هەر دوو چاڤێن وێ دنقاندینە, من ژێ خواست گورێن من بشۆت, لێ ب هێجەتا وەستیانێ داخوازا من بجه نە ئینا .. بیێ کو دەستێن من ب ڕەجفن من سەرژێکر, ئو من روژ ژ ئاسمانا رەڤاند, ئەز ب تەنێ مامە لسەر روییێ عەردی خوینبەرەکا رەنگرەش, نە دەڤەك پێ بکەتە هەوار و هەسپێن شەڤا کورە پێ لێ دنن.

دەمێ بویە سپێدە, ب تامەزرویی بەرەڤ گوڕستانێ چووم, لێ بابێ من هەر بێدەنگما, ئەز نەچار بووم ب پشت چەمیایی و پێنگاڤێن وەستیای گوڕستانێ بهێلم, ل جاددەیان مینا زەلامەکێ زەعیف دمەشیام .. ئەڤینییەکا دژوار بو مەزیڤێ و دەریایێ دخوینبەرێن ویدا دلەرزی , لێ پولیس .. ئەوێن دژی دەریایێ و حەز ژمەزیڤێ ناکەن, ئێکی ژوان رێکا من گرت و ب دەنگەکێ هشك و مجد گۆت: تو یێ ئیهانا وەلاتی دکەی.

هەردەملدەست من زانی کو نە ب تنێ زارۆك ژ پولیسان دترسن, ئو من ب دەنگەکی گۆتێ, هەمی هەولا من ئەو بوو کو لەرزینا خوە ڤەشیرم: ئەز؟! من چ کرییە؟

- پشتا تە, پشتا تە یاچەمیای ژبو سومعەتا وەلاتی نە یا جوانە, برسی و نەساخ بتنێ وەکو تە ب رێڤە دچن.

- لێ ب راستی ئەز ئەز نەساخ و برسیمە.

- هەی بێ مەعریفەت, تو دبێژی کو برسی و نەساخی؟! ئەڤ گۆتنا تە هێرشەکا سوروسورا ل دژی وەلاتی .. یا تێدا.

- ببوورن ببوورن .. مەخسەدا من ئەو نینە ئەز هێرشێ بکەمە سەر چ کەسان.

ب تبلەکا درێژ ئیشارەت کرە من وگۆت: ئو دێمێ تە؟

- دێمێ من؟! چ لێیە؟

- هێڤکە خوە دخۆدیکێرا, دێمێ تە یێ بونموییە .. بوچی؟

- چونکو ئەز بێکارم.

- هش بە, ما تو جرعەت دکەی رەخنێ ل یاسایان بگری؟

- ئەز؟!

- هشش .. دەڤێ خوە بگرە و لبەر چاڤێن من نەمینە, هشیار بی لسەر جاددەیان نەمەشی.

ئێکسەر وەکو گیانەوەرەکێ ترسیای و رەڤیای. ئەز بەرەڤ مالڤە چووم. دارێن سەر جاددەیان دزەربوون. تایێن داران  درویس و بێ چویچك بوون. چویچکان هێلینێن خوە یێن هێلاین و ب شەڤل مەلهایێ کار دکەن.

ب رێڤە من ژنکەك دیت پرسیارا زارۆکەکی دکر کا بوچی دگریت. زارۆکی دگۆتێ: زارۆکان ئەز یێ قوتایم.

ژنکێ دەستێ خوە ب سەریدا ئینا خوار و ب دلوڤانی گۆتێ: نەکە گری. ئەوێن تو قوتای. تو ژی بقوتە. کەیفەکێ ئەز گرتم. ئەو ئەلهۆیێ دمالێن هەژارانڤە دژیت. رۆژەکێ دێ بلند بیت و دێ ئاسمانێ باژێری هەمیێ ڤەگریت ..لێ کەیفا من دوم نەکر و ڤەمریا .. دەمێ پشتی بێهنەکێ پولیسان ئەز گرتیم. چونکو لسەر جاددێ باوشکێن من دهاتن. ئێکسەر ئەز برمە دادگەهێ. ل وێرێ قازی ژمن پرسیارکر: ئەرێ ب راستی باوشك دهاتنە تە؟

ل وی دەمی. رۆژ ژدەرڤەی دادگەهێ چویچکەکا چەنگزێرێن بوو. باوشکێن من هاتن و من گۆتە قازی: بەلێ .. باوشکێن من دهاتن.

قازی ب دەنگەکێ تنگژی گۆت: کەواتە .. تە چ دڤێت بخوازە.

من گۆتێ دلێ من ناچیتە چ تشتان. ئەنیا خوە ب کەفیکەکا ژحەریرێ سپی مالشت و حکمێ خوە دا. پاشی دناڤ دەستێن هژمارەکا پولیساندا. مە هۆلا دادگەهێ بجه هشت. ترومبێلەکا مینا تابیتەکا داری یا کەڤن ل هیڤیا من بوو. ئەز برمە بەرلێڤا رووبارەکی ژهەر هەفت رووباران. ل وێرێ پولیسان ئەز ب وەریسان گرێدام و دوو بەرێن گران ب پێن منڤە گرێدان. پاشی ئەز هاڤێتمە دروویاریدا. ئێکسەر ئاڤا وی ئەز داعویرام و برمە بنی .. دەڤ و چاڤێن من دگرتی بوون. من هەولددا هزرا باژێرەکی بکەم لبن ئاسمانەکێ کەسك و هەیڤەکا رەشدا دسۆت. دەمێ دەڤێ من ڤیای هەوار کەت و گازی دایکا من بکەت. ئاڤێ هەواروی خەندقاند و نەچارکر کو بێدەنگببیت .. ئو هوسا ئەز بێ بەهرکرم ژ باوشککرنێ .. داکو بهێلم هەر رۆژ سپێدێ رۆژ ب هەلێت.

*　　　*　　　*

# گول

دەستەکێ زڤرو بێهێز دئەردی را یێ ڤەشارتی بوو. تامەزرویێ رۆژێ و بارانێ وبای و ئاسمانێ شین بوو. دماویێ چەندین سالاندا هێدی هێدی خوە رادخشانده سەلال. خوینا وی پێڤە هشك ببوو. ژئێشانەکا دژوار دنالی. لێ دسەر هندێ را دەست ژهەولدانێ بەرنەدا هەتاکو ژنشکاڤە پەڤینەکا بچووك لسەر ئەردی چێبوو. ئو.. ژێ دەرکەفت. ب لەپەڤوتێ.. گیایەکێ پێتی یێ سەیرو یێ تێر ب روناهیێ و بای ودەنگان دیت. حەز دکر تشتەك هەبیت تاریاتییا ئاخێ ژبیرێ ببەت. تبلێن وی یێن زڤر ب رویێ عەردی کەفتن. ئو دەمێ گولەك کەفتیە دناڤدا. تبلێن وی یێن لەرزوك پێڤە بونە پێسترك. مشتی ئەڤینەکا سەیرو دژوار بوو. خەریبییەك دخوینبەرێن ویدا ڤەژی و گازی مەمکەکی دکر کو جوانترین گولا سپی بوو. ئەڤ گازییە دگەل ڤێژییەکێ تێکهەل بوو کو رۆژەکێ ئەو ڤێژییە ژگەورییا زەلامەکی دەرکەفت بوو. دەمێ ب ئەردی کەفتی و سینگو دەڤێ وی مشتی خوین بوی.

گازییا دەستی وڤێرییا زەلامی لسەر جاددە یێن مشتی هەرا بازردا و ل خانییا دگەریان. مال مال تێکڤەدان.. هەتاکو ب رەزیلی بەرزە بوین. ئەو دەستێ زڤرو لاواز بیرییا وێ ژنکێ دکر ئەوا لەشەکێ مشتی ستێرێن سپی یێن هەردەم لەرزوك هەین.

ژنك گرنژی و ب خوەشی دگوهیدا گۆت: کا مە چ دڤێت دا بکەین. خزمێن من ژی چ دکەن بلا بکەن.

زەلام ژی کەنی و گۆت: کا چەوا مە بڤێت ئەم دێ وەسا ژین. گوهـ نادەینە کەسێ.

لەشێن وان ب گیایەکێ کەسك و گولێن سورو ئاگری و خوینێڤە نووسییان. لێ سیکارێن تیژ هاتن. زەلامی هەولددا ب هەردوو دەستێن خوە یێن زڤرو پێتی و لاواز.. لەشێ خوە ب پارێزیت. لێ سیکار دبەردەوام بوون. هەتا ئێك تێ چکلی و مینا بەلگەکێ هشك یێ دارێ وەریا و دناڤ بیستانەکێ کەسکدا ڤەشارت. گوشتێ وی یێ بریندارو مشتی خوین.. بەرە بەرە دئاخێدا پویچ دبوو. لێ دەستێ زڤرو لاوازو ئەڤیندار ماڤە ساخ.

هێزا دەستی لاواز دبوو. چ نەما بوو تبلێن وی گولێ بەردەن. لێ ب رژدی پێڤە ما بوو. ل وی دەمی پێچ زەلام دگەل ژنکەکێ و کچکەکا دەهـ سالی هاتن و لسەر گلدکەکێ ل نێزیك وی دەستێ زڤرو لاواز روونشتن.

ژنکێ ب نازداریڤە گۆت: هوون پێنجن. ئەز دێ چ ل هنگو هەمیاکەم.. دێ من گەلەك وەستینن.

زەلامەکی گۆتێ: ماتو چ پێشنیاز دکەی؟

ژنکێ گۆت: بلا کەچا من ژی هاریکارییا من بکەت.

زەلامی لێ ڤەگەراند: لێ کەچا تە هێژ زارۆکە.

کەچا بچووك ب دەنگەکێ تیژ یێ رکەبەر گۆتێ: هلو من بجەربینە. دێ بینی کو ئەز ژدایکا خوە خوشترم و دێ پتر دەیە من.

دەستێ زڤرو پێتی لەرزی و گول ژناڤ تبلان کەفت و خوە ڤەکێشا دناڤ تاریستانا ئاخێدا.

*          *          *

## هەمزە

(1)

هەمزە زەلامەك بوو. پشتی سەد سالان ژنڤستنێ هشیاربوی. خەریبێ تیرۆژکێن رۆژێ و شینی یا ئاسمانی و گرنژینا ژنکاو هەرایا ترومبێلان بوو. تەختێ خوە هێلا و ژمال دەرکەفت. هێدی هێدی لسەر جاددەیان پیاسە دکرن .. لێ ژنشکەکێڤە دیت کو خەلك بێ سەر ییێ لسەر شوستەیان دمەشن. هەولدا ئێکی ب راوەستینیت و ژێ پرسیارکەت کا چ لسەرێ وی هاتییە. لێ بەری پرسیاری؛ پێهەسیا کو ئەوێ سەر نە بیت نەشێت باخڤیت و گوهـ لێ ببیت و ب بینیت.

هەمزە ژجاددەکێ دچوو ئێکا دی. ژبلی مرۆڤێن بێ سەر کەسەکێ دی نەدیت.

دەمێ هندەك سەربازێن چەکدار دیتین و پۆستالێن وان یێن گرانسەنگئەسفەلتا جاددێ دقوتا و سەرێن وان ب ساخی و سەربلندی ب ناڤ ملێن وانڤە بوون .. بو گاڤەکێ ب ئارامی بێهنا خوە هەلکێشا.

دەمێ سەربازان هەمزە دیتی. ڕکورك چاڤێن وان مانە پێڤە .. خوە لێدان هەمزە گرت. برە ئاڤاهیەکێ نەگەلەك دویر و پاشی برە نك زەلامەکێ سەرمەزن. زەلامێ سەرمەزن ب دەنگەکێ مشت گازندەڤە گۆتە هەمزەی: تو چەوا دوێری نە گوهدارییێ بکەی و ب سەرڤە ل جاددێ بگەڕی؟!

هەمزەی لێ ڤەگەراند: هەتا نهو .. چ جاران ئەڤ ئاخفتنە من نە بهیستینە. ما کەنگی سەر وەکو پێلاڤێیە. ژبەرخووە دکەن و دکەنە بەرخوە؟

ئەوێ سەرمەزن کەنی و ب دەنگەکێ پێترانکیڤە فەرماندا کو سەرێ هەمزەی ژی ببڕن.

ئو .. هوسا هەمزەی سەرێ خوە ژ دەستدا. لێ هێمنی و تەناهی قازانجکر.

(2)

هەمزە پشتی هزار سالان یێ نڤستی. ژخەو هشیار بوو. خەریبێ ژنا خوە بوو. لێ .. دەمێ همبێزکری و ژدل ماچیکری. تاما گوشتەکێ گەنی ژێ دهات. ب لڤینەکا ترسیای. ئێکسەر خوە ژێ دویرکر. چوو

بەر پەنجەرا ل هنداڤ جاددەکا پر قەرەبالغ ب مرۆڤ و ترومبێلان ، سەح دکریّ، دیت بارانەکا بۆش یال خەلکی دباریت و هەر کەسیّ ئاڤا بارانیّ ڤیّ کەفتبا ئێکسەر داکەفتە ئەردی و دابیتە چننە ، ب تنیّ جلکێن وان یێن ڤالاو ب تەقن و ب ئاڤیّ تەربوی دمانە لسەر ئەردی ، هەمزەی خوە دیت ژپەنجەریّ دویرکەفت و زڤریڤە سەر تەختیّ خوە داکو خوە لسەر دریژ کەت و بچیتە دخەوەکا نوودا. هەولددا هندەك تاییێن بلند ژ دارێن کەسك و بەردار ببینیت ، لیّ نەشیا ..

چاڤیّ وی یێ راستیّ دبێژیت: زارۆك ماموستایا خوە سەر ژیّ دکەن.

چاڤیّ وی یێ چەپیّ دبێژیت: ماموستاییّ قوتابی یێن خوە سەرژێکرن و دکرە کەنی.

دەستێن وی دگۆتن: ئەگەر ئەویّ سێدارەکری دهەواریّ نەهات ، گازندا ژیّ نەکە.

دفنا وی دبێژیت: پێدڤی ناکەت خوە ل هیڤیا بوهاریّ بگری ، چونکو یا ب گونەهبارییەکا نەزانی هاتییە زیندانکرن.

پێن وی دبێژن: دیّ چەوا لسەر روییّ ئاڤیّ چین؟!

گوهیّ وی یێ راستیّ دبێژیت: خوەزی ئەز یێ کەر بام.

گوهیّ وی یێ چەپیّ دبێژیت: خوەزی ئەز یێ کەر بام.

دلیّ وی ژی پستە پستیّ دگەل ژنکەکا دویر دکەت: ئاخ ... گولا من یا وەریای ، رۆژا من .. هەیڤا من !

هندەك سەربازێن چەکدار ئەوێن چ جاران دژیانا خوەدا نەکەنین ، هێرش دکەنە ژوورا هەمزەی و دەست و چاڤ و پیّ و گوه و دفن و دەڤیّ وی دگرن و دلیّ وی ب تنیّ دهێلن بو وی کەسیّ گوران دکولیت کو دگەلدا بوو. لیّ ئەویّ گوران دکولیت دلیّ هەمزەی نەڤەشارت .. بەلکو فرۆتە قەسابەکی و ب هەستەکا دلنایی ژ دکانا وی دویرکەفت ، چونکو سەرەرای ویّ هەمی بگروبکێشا درێژا بازارکرنیّ .. ئەو بهاییّ پیّ دای یێ کێم بوو.

( 3 )

هەمزە ژخەو هشیار بوو بهیست کو داپیرکیّ دگۆتە دایکا وی: مزگینی .. تەکورەك بوو.

*　　*　　*

## ترس

هەر ژدەمێ کەفتییە دبن بارێ ترسێڤە و تفەنگا خوە هێلای و ڤیای ساخ بمینیت. دزانی کو دێ لێ گەریێن و دێ هەر بینن. ئو هەروەسا دزانی کو دویر نینە بسماران ددەست و پی یێن وی بقوتن و ب دژواری بهێتە ئێشاندن ژی .. دزانی کو دێ نەچار بیت، ب هەوارکی و ژکەربڤە سەرئەڤراز گازیکەت:
- تە بوچی ئەز هێلام؟
دزانی کو دویر نینە وی ب ساخی بسوژن ... یان ژی ب هێواشی و ب کێرێن دەڤلو سەرژێکەن و بکوژن. ئەو رۆژا وی هزر کری کو ژوورا وی یا هاتییە چواردەورانکرن، خوە دناڤ زکێ ناڤکا سێڤەکێدا ڤەشارت، ئو دەمێ کرمەکی ئەو سێڤ دخوار.. نە چ دەنگدکرن و نە چ ڤێژی رادهێلان. پاشی ئەو کرمە شیا سێڤێ کونکەت و ژێ دەرکەڤیت و بگەهتە ناڤ باغەکی . کرمی ل وێرێ خۆشی ب بای و تیرۆژکێن رۆژێ و گیاییێ کەسك دبر، لێ خۆشیا وی دوم نەکر.. چونکو چویچکەکێ خوە لێدا و هەر دەملدەست داعویرا .. ئەڤ رەوشە گەلەك ل دلی هات، وەسا هزر دکر.. دزکێ چویچکێدا دێ شێت ژ جهەکی فڕیتە جهەکێ دی .. لێ پشتی چەند رۆژەکان چویچك هاتە گرتن و دەستەسەرکرن.

*                *                *

# دوماهیترین بەندەر

دەمێ هورەبای پاپۆر پرتکاندی، سیندبادی خوە دنیڤا دەریایەکا وەك گورەکێ تاریدا دیت. ئەڤ گورێ تاری تێرا ملیونەها زەلام و ژن و زارۆك و ئاڤاهییان دکەت. گەهشتە وێ باوەرێ کو ئەڤە دوماهییا وییە، خوە تەسلیمی پێلان کر و خاترا خوە ژ ژیانێ خواست. ژنشکەکێڤە لەشێ وی ب پرتەکا دارێ پاپۆرا پرتکاندی کەفت و خوە پێڤەگرت، پرتا داری ئەو بر و گەهاندە پەراڤەکێ تەنا. سیندبادی چاڤێن خوە دانانە سەرێك .. ئو ئێکسەر نڤست.
سیندباد لبەر تیرۆژکێن رۆژەکا گەرم هشیار بوو. دەنگەك بهیست یێ ب سەرسورماییڤە دبێژیت: ئەڤ تشتە چییە؟
پاشی بێهنەکا دی، سیندبادی هەمان دەنگبهیست یێ دبێژیت: دوور نینە ئەڤە ئاژەلەکێ مری بیت ژ وان ئاژەلێن سەیرێن دەریایێ و ب شەڤ پێلا هاڤێت بیتە پەراڤێ گزیرتا مە.

سیندبادی چاڤێن خوه ڤەکرن, کەرەك دیت ل نێزیکی وی راوەستایە, لدور خوه زڤری و گۆت: ئەو کی بوو دئاخفت؟

کەری گۆتێ: ئەو ئەز بووم دئاخفتم

سیندبادی هەناسەیا خوه هەلکێشا و ب سەرسورماییڤە گۆت: کەرە و ب ئەزمانەکێ عەرەبیێ پاقژ دئاخڤیت ؟!! هەروەکو ئەز یێ دخەودا .. ئەڤ تشتە ناهێتە باوەرکرن!

کەری ب بێزاریڤە گۆتێ: ئەوا نەهێتە باوەرکرن ئەوە کو تو دکاری وەکو من باخڤی!

سیندبادی لێ ڤەگەراند: ئەز ل کیڤە مە؟

کەری گۆتێ: تو یێ ل گزیرتا کەران, ژبلی کەران کەسەکێ دی لسەر ڤی گزیرتەی ناژیت.

سیندبادی گۆت: ئەرێ هەمی کەرێن ڤێره ... دکارن وەکو تە باخڤن؟

کەری ب ئەرێ سەرێ خوه هەژاند و ب هویری ل سیندبادی دنێری, پاشی ژێ پرسیارکر: تو کی یی؟ ئەڤە ئەز پیر بووم و هەتا نهو دژیانا خوه هەمیێدا, من چ گیانەوەرێن وەکو تە نە دیتینە.

سیندبادی ب سەرسورماییڤە لێ ڤەگەراند: ئەڤە تو چ دبێژی! تو من نانیاسی؟ ئەز مرۆڤم, ئەوێ کتێب دبێژن کو ب بهاترین سامانە و ب خودانێ ڤێ زەمینێ من پەسن دکەن.

کەری ب تنگژینڤە گۆتێ: خوه ب تورە بێخە, ژبلی کەران چ خودانێن دی لڤێره نینن.

سیندبادی ب کەنیڤە گۆتێ: لێ جهێن دی یێن دونیایێ نە وەکو گزیرتا وەنە.

کەری ب گەفڤە گۆتێ: دێ .. دێ .. دگەل من وەرە.

سیندبادی لێ ڤەگەراند: چەرخا فەلەکێیە, ئیرو ئەز فەرمانان ژ کەرەکی وەرگرم.

کەری ژ کەربڤە گۆتێ: گوهدە من .. ئەگەر تو خوه نەگوهدارکەی, دێ زیچکەکا بهێزلتە دەم .. یان ژی ئەگەر جارەکێ بتنێ گازیکەم, دێ هژمارەکا زۆر یا کەران لدور تە خرڤە بن دێ وەل تە کەن کو چ جاران تو ژبیر نەکەی.

سیندبادی بێهنەکێ هزرێن خوەکرن و پاشی گۆتە کەری: ئەز یێ وەستیایمە .. بهێلە لسەر پشتا تە سویار بم.

کەری ب دلتەنگی گۆتێ: ئەڤە چییە من گوهـ لێ دبیت؟ تە دڤێت ل پشتا من سویار بی؟!

سیندبادی لێ ڤەگەراند: تو بوچی خوه عێجز دکەی؟! ئەوا من ژتە داخوازکری .. رۆژانە کەر ل وەلاتێ من بجهـ دئینن.

ب کێمکرنڤە, کەری گۆتێ: وە دیارە .. ل وەلاتێ هنگو کەر دساویلکە و رەزیلن.

سیندباد ژێ پرسی: دێ من کیڤە بەی؟ دێ من بەیە نك سەروکێ خوە؟!

هەروەکو کەر ب زەرگەهەکا مەزن هاتییە ئێشاندن, گۆتێ : من چ سەروك نینن, هەر کەرەك سەروکێ خوەیە, مە چ پێدڤی ب یاسا و سەروکان نینە, مە چ ئەگەرێن هەڤرکی و تێڤەلیێ ژی نینن, ئەوێ برسی ببیت گیا یێ مشەیە, هندی وی دڤێت .. دشێت بخوت هەتاکو تێر دبیت, ئەوێ تێهنی دبیت ژی, ئاڤا خۆش یا مشەیە و دکاریت هندێ ڤەخۆت هەتاکو تێهنا وی دشکێت .. هەر کەسێ بڤێت بنڤیت, عەرد یێ مشەیە ...

سیندبادی گۆتێ: پا تە دڤێت من کیڤە ببەی؟!

کەری لێ ڤەگەراند: دێ تە بەمە ئەوی جهی, ئەوێ کەر لێ دژین, دا تە ببینن .. ئەز باوەرناکەم چ کەران ژ کەرێن گزیرتا مە گیانەوەرەکێ وەکو تە دیت بیت.

سیندبادی خوە تەسلیمی حەزا کەری کر و ب دویف کەفت هەتا گەهشتینە دەشتەکا مشتی گیا و ئاڤ و کەسکاتی, هژمارەکا زۆر یا کەران ل وێرێ بوون. ل وی دەمێ کەران سیندباد دیتی, ئێکسەر لدور خرڤەبوون .. ب کێماتی و پێترانکیڤە لێ دنێرین, سیندبادی هەست پێکر کو نێرینێن کەران ئیهانا وی بتنێ ناکەن بەلکو ئیهانا هەمی مرۆڤان دکەن, لەوا گۆتێ: ئەز نە یێ رازیمە ژڤێ سەرەدەریا وە یا نەهەژی دگەل مندا, هوین بوچی ب هویری لمن دنێرن؟ هەروەکو ئەز مێش یان کولی یان ژی بەق .. فەرە هوین رێزێ لمن بگرن, ئەز ئێکم ژ توخمێ مرۆڤان .. ئەوێن ئەڤ عەردە ژ دارستانێن هۆڤان کرییە باژێرێن مشتی پێشکەفتن و شەهرەواری .. هوون بزانن ئەو وەلاتێ ئەز ژێ هاتیم, وەلاتەکێ مەزن و هێژایە, نە وەك ڤێ گزیرتا وە یا پویچ و بێ بهایە.

کەرەکی ژ کەران گۆتە سیندبادی: مادەم تو هندە شەهنازیێ ب وەلاتێ خوە دبەی .. بومە بێژە کا ئەو چ تشتە ل وەلاتێ تە هەی و مە نەی؟

سیندبادی لێ ڤەگەراند: ما چ ل گزیرتا وە هەیە, ژبلی گیا و ئاڤێ و کەسکاتیێ؟! ل وەلاتێ من ژبلی گیا و ئاڤێ و کەسکاتیێ, مە خانی یێن ساخان و گورستانێن مرییان هەنە .. مە پەرلەمان و هەلبژارتن و رۆژنامە و کوڤار و کتێب و ئێزگە و تێلەفزیون هەنە.. مە خواندنگەهـ و زانینگەهـ و یاریگەهێن وەرزشی هەنە .. مە ئەدیب و کارەبا و جاددە و دەستور و توخیبێن دناڤبەرا دەولەتاندا هەنە .. مە لەشکەر و چەکێن جوراوجور هەنە .. مە پاپۆرێن ئاسمانی و زەلامێن زانا هەنە, کو یێن گەهشتینە سەر رویێ هەیڤێ .. مە ترومبێل و فرۆکە و بەفرخانە و شورەش و کۆدەتا هەنە .. ئو هەروەسا مە ..........

بێدەنگییەکا سەیر کەفتە ناڤ کەران, سیندبادی ب شەهنازی هێڤ دکرێ, لێ ژنشکەکێڤە کەرەکی گۆت: فەرە ئەم دان پێ بدەین کو هەمی تشتێن تە گوتین ل گزیرتا مە نینن, لێ ئەرێ هوین دکەیفخۆشن؟!

سیندباد ب ڤێ پرسیارێ سەتمی و سەرێ خوە چەماند. ب سەروسیمایەکێ بوغومیڤە هزرێن خوە دکرن, خەلك سەرا بەرمایکێن سەرگویفکان هەڤ دکوژن .. هەمی تشت ژبو فروتنێنە و هەر تشتەکی بهایەکێ دیارکری هەیە .. هەتا مرۆڤ ژی ب کێمترین بها دهێنە فروتن .. دسەر هندێ را ژی کەسەك نینە بکڕیت.. ئەوا لبەر فروتنێ پترە ژ یا پێدڤی .. هەمی تشت بەرەف خرابیێڤە دچن .. باب نەیی یا خوە ژ کورێن خوە دکەن .. کور سەرەدەرییەکا دوژمنکارانە دگەل بابێن خوە دکەن .. ژن خوە قوربانی مێرێن خوە یێن زەنگین دکەن, خو ئەگەر مەیمونك بن ژی .. لێ ئەگەر مێر یێ هەژار بیت, ژنێن وان چ پویتە پێ ناکەن, خو ئەگەر جوانمێریا دونیایێ هەمی ڤێ بیت .. زەلام ژنکن .. ژنك ژی زەلامن .. راستی یا بەرزەیە و یا کرێتە .. درەو سەرمیرا هەمییانە.. ئەوێ ئێڤەلی لسەر کورسیکا یێ باش دروینیت و ئەوێ باش یێ وولکری و رەزیل کرییە, صە رادهێلنێ .. هەر رۆژ خوینا بێگونەهان درژیێت .. چ تولڤەکەر نینن .. برا ژبو کتەکا پێلاڤێ برای دکوژیت .. یێ بێخێر پێشەوایە و ئەوێ پر خێر سەرەدەریا بکوژێ دایکێ دگەل دکەن .. ددەراڤێن تەنگدا چ هەڤال نینن, بتنێ دچیڤانۆکێن درەواندا هەنە .. ئەو چیڤانۆکێن ژبو زارۆکان دهێنە گوتن.

کەری ژ سیندبادی پرسیارکر: تە بوچی بەرسڤا پرسیارا من نەدا؟.. ئەرێ هوین دکەیفخۆشن؟!

سیندبادی سەرێ خوە چەماند و نە ئاخفت. پشتی دەمەکێ نە گەلەك دویر هەمی هەولا سیندبادی ئەو بوو کو پێرینەیەکێ ببینیت و ژ گزیرتا کەران برەڤیت .. لێ هەمی هەولێن وی سەرنەگرتن, نەچار بوو لسەر گزیرتەی دگەل کەران بژیت .. گەلەك تەحەمولا پێترانکیبا کەران دکر, ئەو هزر دکەت و لسەر دوو پێیان دمەشیت .. دەنگێ وی نە یێ مونکەرە .. لێ بەرە بەرە شیا خوە دگەل هزرکرنا خوارنا گیایێ تەرِێ کەسك کەهیکەت, ل دەسپێکێ گیا بتنێ بوو.. لێ پاشی شیا خوە دگەل رێڤەچوونا لسەر چواران ژی کەهیکەت و پاشی درِی و زیچك ژی دهاڤێتن .. ئەڤ شیانێن خوگونجاندنێ جهێ رێزگرتنا کەران بوو.. دگەل دەمی سیندباد ب کەیفخۆشی دژیا و ئێدی هزرا رەڤینێ ژبیرکر.

* * *

# پاشگۆتن

خویایە کو وەرگێران فاکتەرەکی تم گرنگێ پێشڤەچوونا رەوشەنبیرییێیە ب گشتی و ئەدەبییە ب تایبەتی. پەیدابوونا توخمێن ئەدەبی یێن نوو دناڤ ئەدەبێن رۆژهەلاتیدا (کورتە چیروکا هونەری، رومان،

شانۆ...هتد) ژئەنجامێ باندورا ئەدەبێن رۆژئاڤا بوو، ئەڤ باندورە ژی هەر بەرێ وەرگێرانا دەقێن ئەدەبی بوو، کورتە چیروکا هونەری ژی ژوان توخمێن ئەدەبییە کو شەنگستێن وێ ل رۆژئاڤای ودئەنجامێ وەرارەکا دوور و درێژدا هاتینە پێکئینان، ئیرۆ دئەدەبێ مە یێ کوردی ژی دا هونەرێ کورتە چیروکێ پێنگاڤێن بلەز ژئالێ تەکنیکێ یان ناڤەروکێڤە دهاڤێژت وخوە ژ ئاوایێ ڤەگێرانا سەرهاتی وچیروکا فولکلوری رەها دکت، ئەڤ وەرارە ژی. ڤەدگەرتە مفا وەرگرتنا چیروکنڤیسان ژ سەربورێن کورتە چیروکێ و ئەدەب و رەخنێ ب گشتی ل ناڤ میللەتێن دی. نهۆ چیروکنڤێسێ کورد رۆژ ب رۆژ شارەزاهیا خوە دوارێ تەکنیکێن نوو یێن ڤی هونەریدا زێدە دکەت ب رێ یا خواندنا دەقێن بیانی و دیسان سەرەدەریا وی دگەل کەلەپورێ کوردی و نەمازە ئەفسانێ وئاوایێن دی یێن ڤەگێرانا فولکلوری ل گورەی تەکنیکێن نوو دهیتەکرن. هەلبەت ئەڤ مفا وەرگرتن پتر زێدە دبیت هەکەر دەقێن بیانی بهێنە وەرگێران بو سەر زمانێ کوردی. چونکی ئەڤ یەکە زمانی ژی زەنگین دکەت و بهێز دئێخت. بڤی ئاوایی چیروک پێشکەفت و چیروکنڤیس چەوا مفای ژ کەلەپورێ خوە وەردگرن وەسا مفای ژ سەربورێن ئەدەبی یێن گەلێن دی ژی وەردگرن. نەمازە گەلێن هەڤسویێن مە کو نێزیکییەك ژ ئالیێن جفاکی، ئابوری، دینی، دیروکی، ئەفسانەیی، جوگرافی، دناڤبەرا مەدا هەیە.

خوەندەڤانێ هێژا:

دڤێ پەرتوکا د نێڤ دەستێن تە دا دێ (30) چیروکێت هەلبژارتی یێن چیروکنڤیسێ سوری زەکەریا تامر خوینی کو ژ پێنج کومەلە چیروکێن وی هاتینە خرڤەکرن، ئەڤ ناڤە نەیێ دوورە ژ رەوشنبیرێ کورد نەمازە ئەوێ تێکەلیەك دگەل رەوشەنبیریا عەرەبی هەی، هەلبژارتنا وەرگێرێ ڤان دەقان (د.عارف حیتو) ب دیتنا من کارەك سەرکەفتییە ژبەر گرنگیا ڤی چیروکنفیسی وەکو پێشەنگەك د چیروکا سوریدا و ل دەڤەرێ هەمیێ ژی. رەخنەگرێ سوری (**رياض عصمت**) دبێژت: **ئەم زەکریا تامر وەکو نڤیسکارەك پێشەنگو شورەشگێر و هەڤچەرخ دبینن، کاریە چیروکا سوری دەرباز بکەتە چارچوڤێ جیهانێ بێی ناسناما وێ ژدەست بدەت و شیایە مفای ژ رێبازێن رەوشەنبیری یێن جیهانی وەرگریت بێی رەسەنیا خوە بەرزەکەت** (**الصوت والصدى/ دراسة في القصة السورية/ ل** 179).

زەکەریا تامر ستێرەکا بەرچاڤە دچیروکا نوو یا سوریدا و دەستپێکا وی یا نڤیسینێ ڤەدگەرتە سالێن پێنجییان، گرنگیا وی دهندێ دایە کو وی تایبەتمەندیێن خوە د هونەرێ چیروکێدا هەنە. چ ژئالێ هەلبژارتنا بابەتانڤە یان زمانێ وی یێ شعرکی یێ تژی سەمبول. ڤەرێژێن نازك وکارتێکەر ل سەر هەست و سوزا خوەندەڤانی پەیدا دکەت. هەروەسا بکارئینانا کەلەپوری ب بەرفرەهی و ب تەکنیکەکا هەڤچەرخ. شیایە دچیروکێن خوەدا دەربرینێ ژخەون و ئێش و ئازارێن مروڤێ هەڤچەرخ بکەت.

نەمازە ژ چینێن هەژارێن ل تاخێن مللی یێن باژێرێ دیمەشقێ دژین وگەلەك جاران ئەم جوداهیا چینایەتی دچیروكێن وی دا بەرهەست دكەین وكەسانێ دچیروكێن ویدا بەرچاڤ پتریا جاران كەسانەكێ زوللێكرییە . حەزو ڤیان لێ هاتینە بن پێكرن , چ ژ ئالێن جڤاكیڤە یان سیاسیڤە یان ئابوریڤە، دیسان دچیروكێن خوەدا ب كووری هەڤبەندیا دناڤبەرا كەس و دەستهەلاتداریدا بەرچاڤ دكەت , بو هندێ كو بشێت ئازادانە ڤێ كێشا نازك دیاركەت ڤە دگەرت سەر دەمێن دیروكی.

ئەم دكارن بێ دوودلی بێژن كو وی ب وێرەكی خوە ل سێ كوژێ بەربەندكری دایە (دین ، سیاسەت ، سێكس ) تەڤ پێكۆلا ئەم د ئەدەبێ كوردیدا دكەین . نهۆ ژ هەردەمەكێ دی پتر دپێدڤینە , هەكەر مە بڤێت ئە دەبێ مە ببیتە پارچە ك ژ بزاڤا جڤاكی و سیاسی یا گەلێ مە. نەمازە دڤێ قوناغا نازكا گەلێ مە تێدا دبورت .

( **ریاض عصمت** ) بڤی رەنگی سەروسیما یێن هونەری یێن زەكەریا تامر پوختە دكەت:

زمانێ وی یێ تیر و شعركیە، یێ سەركەفتییە دكارئینانا سەمبول و ئەنجامێن سایكۆلوژیدا.

سیناهیەكا زێندی یا گەش دچیروكێن ویدا هەیە .

تەكنیكەكا هونەری یا پێشكەتی هەیە.

گرێدانا وی ب خەمێن زولێكرییان و وێرەكی دچارەكرنا دۆزا سەربەستیێدا .

دوبارەكرنا مژار و شێوازی ب بەردەوامی.

بكارئینانا سەمبولێن مژەوی .

ب رێبازێن ئورۆپی یێن وەكو (**الانطباعية والتعبيرية**) داخبار بوویە. نەمازە چیروكا سوری دسەردەمێ ویدا دناڤبەرا ڤان هەردوو **رێبازاندا** دهات ودچوو. زەكریا تامر پتر یێ داخباری تەعبیریێ بو كو گرنگیێ ددەتە پشت دیاروكان ژ راستییان و دهزرێن (برگسون و فروید و ستریندیرگ و كافكا و ئونیل ) دا دیار دبت. ئەڤ رێبازە ژی وەكو ریبازەكا ئەدەبی – هونەری ل ئورۆپا هاتە پێش دەمێ ئینگباعی ب تنێ نەشیای دەربرینێ ژ سەربورا شەرێ جیهانیێ ئێكێ یێ خوینەلو بكەت.

زەكریا تامر دچیروكێن خوەدا دەربازی ژیانێ دبت و بەر ب جیهانا مرییان دچت، كەسانێن دیرۆكی و ئەفسانەیی زێندی دكەت و دئینتە دژیانا ئەڤرۆدا دا پێ دەربرینێ ژ گەلەك كێشێن سیاسی ، جڤاكی – سنجی بكەت.

ل دور وەرگێرانا ڤان دەڤان بەری هەرتشتی دڤیا بێژن كو هەگەر شعر ب وەرگێرانێ گەلەك ژ بهایێن خوە ژ دەست ددەت نەمازە ئالیێن گرێدای ب موزیكا شعریڤە , لێ ئەڤ یەكە ژ پەخشانێ را ناهێتە گوتن و هەگەر هندەك جوانیێ ژ دەست بدەت ژی كێمە , چونكی زمانێ پەخشانێ ژی زمانەكێ تێر

وێنه و پەیڤ و هەڤوکێن ئەدەبینه و ل سەر ئاستێ واتایێن فەرهەنگی یێن پەیڤان ناهێته خواندن و داکو وەرگێر بشێت جوانیا دەقی ژدەست نەدەت دڤیا بزاڤێ بکەت دەقی وەرگێرته سەر زمانەکێ ئەدەبییێ ل ئاستێ زمانێ دەقی. هەرچەندە خوەندەڤانێ چیرۆکێن زەکریا تامر ب زمانەکێ شعرکی دحەست، لێ زمانەکێ ب ساناهی و سڤك و نازکه. پەیڤ و هەڤوك و وێنه یێن ئالوزژی تێدا دهێنه دیتن.

وەرگێرێ ڤان دەقان د.عارف حیتو شیایه هەتا رادەکێ باش مافێ وان بدەتێ وب زمانەکێ جوان و لێکدایی و سڤك وەرگێرته سەر زمانێ کوردی. ئەز باوەر دکەم خوەندەڤان زوو ب زوو پێ ناحەست کو ئەڤ دەقه ژ زمانەکێ بیانی هاتینه وەرگێراندن، ئانکو وەسا خویا دبیت هەروەکو ب کوردی هاتینه نڤسین.

ل دوماهیێ فەره بێژین کو پێدڤیه دەزگەهێن مه یێن راگەهاندن و رەوشەنبیرییێ ل هەریمێ گرنگیەکا باش بدەنه وەرگێرانێ چنکو ئەڤه جیلەك یێ پێ دگەهت دقادا ئەدەبیدا ژ زمانێ کوردی پێڤه چو ددی نزانت. لەوا دا ژ رەوشەنبیری و شارستانیا جیهانیێ ڤه نەقەتت دڤیا هەر ژ نهو دەزگەهێن تایبەت ب وەرگێرانێ بهێته دانان وشاکارێن ئەدەب و رەشەنبیریا جیهانێ ب کوردی لڤێرێ بەلاڤ بین.

عیسمەت محەمەد بەدەل

دهۆك 2000